# مەشخەڵی ڕێ



سەیید قوتب

ماموستا کرێکار

زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی

زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی

# مەشخەڵی ڕێ


نوسینی

سەیید قوتب


وەرگێڕانی

ماموستا کرێکار

# مەشخەڵی ڕێ

نوسینی: سەیید قوتب

وەرگێڕانی: مامۆستا کرێکار

بەرگ : ئیسلامڕەو

ناوەوە: کۆساری

ساڵی: ١٤٣٦ك-٢٠١٥ز

## زادی ڕێمان

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی دیدی نوێ
لقی: دەرەوە

fb.com/zadyreman zadyreman.com twitter.com/zadyreman

# پێشکەش بێت:

بەو کەســانەی وەك سەیید قوتب

بیـردەکەنەوەو دەیــانەوێ

وەك ئەویش بـمـرن..

**کرێکار**

# بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشْهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنْتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا ربَّكُمُ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجالاً كثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والأرْحامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فازَ فوزاً عظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم

وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

# پێشەکی چاپی یەکەم

لە ساڵی ١٩٧٢ەوە کە نێوی سەییدی شەهیدم دەبیست، خۆزگەی ئەوەم دەخواست ببمە کرێکاری ئەو چاپخانەیەی کتێبێکی سەیید چاپ دەکات.. چ جای ئەوەی ـ خوا ئەوەندەم ڕێزە لێنێت کتێبێکی وەربگێرم.. کتێبی سەیید قطب.. بەتایبەتی (معالم..).

چ موسڵمانێکی خاوەن بیروهۆش هەیە لە جیهاندا نێوی سەییدی نەبیستبێت؟!!
ئەو پیاوەی ناوەرۆکی نێوی خۆیو باوکی بوو.. هەم (سید) بوو.. هەم (قطب) !!

چ موسڵمانێك هەیە لەسەر زەمینی ئەمڕۆ، پەروەردەی ئەو پیاوە پایەبەرزو بلیمەتە نەبێت؟! ڕاستەوخۆ یان لاوەکی.. کێ بەقەرزاری ئەو شەهیدە زیندوە نازانێت؟!

کام دوژمنەی ئیسلام هەیە ـ لەڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای ئەمڕۆ ـ بیری ئەتۆمانەی (معالم..) نەیتۆقاندبێتو، نەکەوتبێتە نەخشە دارشتن دژی ئەو چەند لاپەڕەیە؟!!

(مەشخەڵی ڕێ) ڕەنجی فیکری سەییدی زیندان.. ئەو مەشخەڵەی خوێن سوتەمەنی یەتی، مەشخەڵی ئەو ڕێیەی سەیید خوێنی خۆی کردە فسفۆڕی..

(مەشخەڵی ڕێ) ئەو کتێبەی مامۆستای ڕابەری ڕەحمەتی (حسن الهضيبي) فەرمانیدا لەڕیزی برایاندا سەرتاخوار بخوێنرێت!!

(مەشخەڵی ڕێ) کۆتا نووسینی فیکرو هۆشی ئەو مامۆستا مەزنە..

(مەشخەڵی ڕێ) ڕێسای سەرەکی فیکرو تەنزیمی بیرو هۆشی ئیسلامی..

ئەو کتێبەی دەستی لاوانی نوێی ئیسلام دەگرێت لە ڕێی هێنانەوەی ئیسلام و سەلماندنەوەی بوونی.. بۆ دامەزراندنەوەی کۆمەڵگەو دەوڵەتی ئیسلامی..

(مەشخەڵی ڕێ) هێڵی گشتی بەرپرسیارێتی هێنانەوەی ئیسلام.. مەشخەڵی پێشڕەوانی بزوتنەوەی ئیسلامی نوێ بۆ خۆئامادەکردن بۆ وەرگرتنەوەی

سەركردایەتی كۆمەڵگەی مرۆڤی سەرزەمین.. لەم ڕۆژەدا كە سەركردایەتییە غەیرە ئیسلامییەكان چاوەڕێی فڕێدانن..

(معالم في الطريق) ئەو كتێبەی لەگەڵ لە چاپدانیدا طاغوتی وولاتانی عەرەب كەوتنە لەرزین وخەو لەچاویان هەڵگیرا..

(مەشخەڵی ڕێ) یەعنی عەقیدەو فیكرو تەنزیمو بنیاتنانی نوێ..

(مەشخەڵی ڕێ) ئەو نووسینەیە كە دەیەوێت نەوەیەكی قورئانی نوێ پەروەردە بكات، لە نەوەی یەكەمینی قورئان بچێتو، شوێن پێی ئەو هەڵگرێتو، وەك ئەوان متمانەی بەخۆ بێت وبەرپەڕی دلێریو نەبەزیو لێ هاتوویی یەوە ئەم پەیامە خوایی یە هەڵگرێتو، قەناعەتی بە داهاتووبێت كە بۆ ئەم ئیسلامەیە..

(مەشخەڵی ڕێ) ئەو دەنگەیە كە خۆمان پێ دەناسێنێتەوە كە ئێمە كێین؟! وەك تاك، كۆمەڵە، كۆمەڵگە، دەوڵەت، شارستانێتی ئەم پەیامە خوایی یە..

(مەشخەڵی ڕێ) كۆلیجێكی سەربەخۆی بزوتنەوەی بیرو هۆشی ئیسلامییە كە پێك گەیشتنو لێكدابڕان لەجاهیلییەت دیاری دەكات..

من وام (معالم..) ناسیبوو.. هەر لەو ڕۆژانەی لە ١٩٧٧دا بەنهێنی دەمانبردە ماڵێكو دەمانخوێند.. لەبەر ڕۆشنایی تەوجیهاتەكانیدا كاری ئیسلامی خۆمان ئەنجام دەداو پێیدا دەچووینەوە.. هەر (معالم..) یش بوو هەڵسوكەوتمانی ڕاست دەكردەوەو هانی دەداین بۆ زیاتر كاركردن.. (معالم..)یش بوو گیانی بەرپرسیارێتی تێدا دەجولاندینو دەیخستینە كار لە عیراقێكدا، كە گیانی بەپرسیارێتی ئیسلامی تێدا مەیی بوو.. بۆیە دەمویست لاوانی موسڵمانی نوێی كورد بەرەو (معالم..) بڵند ببنەوە.. تا بزانن بەرپرسیارێتییان چەند گەورەیەو كۆڵی سەرشانیان چەندە قورسە؟!!

كاتێ "معالم في الطريق" دەكرێتە كوردیو دەخرێتەسەرشان ـ نەك بەردەست ـ دەبێت بزانرێت چۆن دەخوێنرێت. خوێندن نەك خوێندنەوە.. دەبێت ڕا بگۆڕێت، نەك ڕای بگۆڕرێت.. هەرچەندە ئەو گۆڕانەش بەژان بێت.. گۆڕانیش لەدایك بوونە.. هیچ لەدایك بوونێكیش بێژان نابێت..

ئـــیتر بـــەرەو بـــیرو هۆشـــێکی بزوتنـــەوەیی ئیســـلامی بـــەتینتر ... بـــەهیوای شەهیدی...

**ماموٚستا کرێکار**

**١٤٠٣ك - ١٩٨٣ز**

# پێشەكی چاپی دووەم

ساڵی ١٩٨٣ لە ئۆردوگای كەرەجی ئێران لە وەرگێڕانی ئەم كتێبی (معالم في الطريق)ەی مامۆستای بزاڤی نوێ سید قطبی ڕەحمەتی بوومەوە. بەڵام لەساڵی ١٩٨٨دا لە پیشاوەری پاكستان كە بە دكتۆر عبدالله عەزامم ووت وەرمانگێڕاوەتە كوردی هێشتا چاپمان نەكردووە، سەری سوڕما كە تائێستا كتێبی (معالم في الطريق) بە كوردی نەبێ، بۆیە نامەیەكی بۆ چاپخانەكەی خۆیان نووسی كە بەزووترین كات چاپی بكەن.. ئەوكاتە لەبەر تەكالیفی پۆستو ناردن ووتمان با قەوارەكەی زۆر گەورەو گران نەبێ، با بیكەینە دووبەش!

بەشی یەكەمان هەر لەوێ چاپ كردو بڵاوبووەوە، بەڵام زۆر زۆر بەداخەوە لەكەم هیممەتی خۆمدا چاپی بەشەكەی تری مایەوە، تائێستا (یازدە ساڵی بەسەردا تێپەڕی!) وەرگێڕانەكەش شازدە ساڵ لەمەوبەر بووە، ئاشكراشە من خۆم لەم ماوە زۆرەدا ئیدراكو تەجروبەو شارەزایی زمانەوانیم لەوسا زیاتر بووەو لەوساش زیاتر شارەزای فیكرو تیۆری بزاڤی سید بووم. بۆیە هەر حەزم دەكرد كاتێك دەمەوێ هەردوو بەشی كتێبەكە پێكەوە چاپ بكەم شەرحێكی زۆرتری ڕێبازو دیدی سید بكەم كە پێشتر لە چاپی یەكەمی بەشی یەكەمدا نووسیبووم، حەزم دەكرد پەراوێز بۆ هەندێ باسی بكەم، بەڵام دیسان زۆر بەداخەوە هیممەتم هەیەو كاتم نیە!

هەروەها لە ١٩٨٣دا سێ پاشكۆم بۆ كتێبەكە نووسیبوو دەربارەی (ناسنامەی كۆمەڵگەی جاهیلی)و (دار الاسلامو دار الحرب)و (خۆدابڕین وگۆشەگیری — العزلة و المفاصلة) لە ڕوانگەی سید قطبەوە، چونكە ماوەیەكی زۆرو لە هەندێ جێ، تا ئێستاش جەدەلێكی زۆری لەسەر بوو..

ئێستا كە سەیری پاشكۆكان دەكەمەوە هەر چەندە دەشزانم زۆر گرنگو پێویستن — زۆر بە كورتی نوسراون، سەرچاوەی كەمم ئەو كاتە لەبەر دەستتدا بووە، باسەكانیش كەمتر شتیان لەسەر نووسرابوو. بۆیە پێم چاك نەبوو ئەو سێ پاشكۆ (ملحق) یە چاپ بكەم. بەو هیوایەی كە لە داهاتوویەكی نزیكدا پێشەكییەكەو

دیدی بزاڤی سیدو پەڕاوێزو پاشکۆکان ئامادەبکەم. جایان لەکتێبی سەربەخۆدا چاپی دەکەین ان شاءالله، یان لەگەڵ چاپی سێیەمی (مەشخەڵی ری)دا چاپی دەکەین.

هیواداریشم خوای گەورە لە کەم وکورتیمان ببورێت وهاوکاریشمان بێت..

تێبینی ئەخیریشم ئەوەیەکە وەرگێڕانەکە لە ساڵی ١٩٨٣دا کراوەو ئێستای ١٩٩٩شم زۆر بەداخەوە ئەوەندەی کاتم نەبوو پێیدا بچمەوە، بۆیە حەتمەن زۆر جێی وەرگێڕانەکە لەئاستی ئێستای خۆشمدانین چ جای لەئاستی نووسینی سیدی ئەدیبدا.. بەڵام ئەو بەڵێنە دووپات دەکەمەوە کە ان شاء الله لە داهاتوویەکی نزیکدا بە شێوەیەکی ریك وپێکتر بلاوی بکەینەوە.. بەڵام باجارێ دەقی خۆی بخەینە بەردەست بەو هیوایەی برایانی گەنجی نەوەی نوێمان بەگشتی وبرایانی بازنەی خۆمان بەتایبەتی زۆر بە وردی دیراسەی بکەن وبیخوێنن تا دەیکەنە نایترۆجینی پێکهاتەی بیریان..

والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته...

**براتان: (مامۆستا) کرێکار**

**ئەنقەرە**

**١٩٩٩/ ٥ / ٢٢**

# ماموستای شەهید لە چەند دێڕێکدا

* ناوی (سەیید) کوڕی (قطب) کوڕی (ئیبراهیم)ە.. باپیرەی پێنجەمی لە هیندەوە هاتووە.
* ساڵی ١٩٠٦ ز لەگوندی (موشا)ی شاری (ئەسیوط)ی میسر لەدایك بووە.
* پێش تەمەنی (١٠ـ دە) ساڵان قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە.
* باوکی لەریزی (الحزب الوطني) ئەوکاتەی میسردا کاری سیاسی ئەنجام داوە.
* قوتابخانەی سانەوی (تجهيزيه دار العلوم)و(دار العلوم)ی باڵای لە (قاهیرە) تەواو کردووە.
* دوای تەواوکردنی خوێندن، نووسینەکانی لە گۆڤاری (الأهرام، الأسبوع، الرسالة، الشرق الجديد، العالم العربي)دا بڵاودەکردەوە.
* ژنی مارەکرد، بەڵام زیندان بواری گواستنەوەی نەدا.
* ساڵی ١٩٤٨ـ١٩٥٠ لەگەڵ (بعثة)یەکی خوێندندا نێررایە (ئەمەریکا). بەڵام پێش تەواوکردنی خوێندن بە(٣) سێ مانگ گەڕاوەتەوە میسر.
* گۆڤاری (الفكر الجديد)ی دەرکرد بە هاوکاری (محمد حلمی المنیاوی) کە هەمووی هێرشی ئیسلامی بوو بۆ سەر دەرەبەگو سەرمایەداری، بە بەڵگەی قورئانو حەدیسی پێغەمبەر ﷺ.
* ساڵی ١٩٥١ چووە ریزی کۆمەڵەی (برایانی موسڵمان = الإخوان المسلمون)ەوە.
* ساڵی١٩٥٢ بە ئەندامی (مکتب الارشاد)ی برایان هەڵبژێراو کرا بە سەرۆکی بەشی بڵاوکردنەوەی بانگەواز لە (بارەگای ناوەندی = المركز العام)ی برایان.
* ساڵی ١٩٥٢ بەشداری کۆنگرەی دیمەشقی کرد، کە لەژێر ناوی (التربية الخلقية کوسيلة لتحقيق التكامل الإجتماعي)دا گیرا.

* هەر لەو ساڵەدا وەکو نوێنەرێکی برایانی موسڵمان بەشداری کرد لە (کۆنگرەی میللی ئیسلامی قودس = المؤتمر الإسلامی الشعبی— القدس -).. پاش تەواوبوونی کۆنگرەکە بە فەرمانی (کلوب)ی فەرماندەی ئینگلیز، حکومەتی ئەردەنی ڕێینەدا بچێتە ئەردەنەوە.

* ساڵی ١٩٥٤ کرا بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (الإخوان المسلمین)کە هەر لەوساڵەدا داخرا، چونکە دژی ڕێکەوتنی میسرو بەریتانیا وەستا. کە پیاوانی (شۆرشی!) پۆلیۆی میسری کردیان.

* لەمەودوا لە زیندانەکانی (القلعة، السجن الحربی، ابوزعبل، ولیمان طرة)دا ژیانی بردەسەر.

* لە ئایاری١٩٥٥دا خرایە نەخۆشخانەی سەربازی بۆ تیمارکردنی شوێنەواری سزاو ئەشکەنجەی زیندانو، نەخۆشییەکانی کە لە زینداندا تووشی ببون. وەك (نەخۆشی سنگ، دڵو، ڕۆماتیزمی ئێسك).

* لە ١٢ی تەمووزی ١٩٥٥دا (دادگای گەل = محکمه الشعب!) بۆ ماوەی (١٥ ساڵ زیندانی لەگەڵ کاری نارەحەت)حوکمی دا بەسەردا!! هەرچەندە نەشیتوانی لەبەر نەخۆشیو ئازارو نارەحەتی ئامادەی (دادگا)کە بێت.

* ساڵی ١٩٥٥ لە (سوریا) وێنەو ناوی لە (لوحه شرف)ی کۆلێجی شەریعەتی زانکۆی دیمەشقدا هەڵواسرا، لەڕیزی (زاناو دانا دلسۆزەکانی سەدەی بیستەم).

* شەوو ڕۆژی زیندانی (دوای ئەوەی ئەشەکەنجەو سزای لەسەر هەڵدەگیرا) دابەش دەکرد بەسەر ئیشی تەنزیمی برایانو نووستنو کتێب داناندا.

* ساڵی ١٩٦٤ دوای هەوڵدانێکی زۆر لەلایەن (عبدالسلام عارف)ی سەرۆکی (کۆماری عێراق)ی ئەو کاتە لەزیندان هێنرایە دەرەوە.

* دوای چەند مانگێك گیرایەوەو لەزیندان توندکرا.

* لە ١٩٦٦/٨/٢٩دا گیانی شەهیدانەی بەرەو خوای پەروەردگارو کردگاری

بەرزبووەوە. دوای ئەوەی لە سێدارە درا..[1]

ڕەحمەت لەگیانی پاكی سەییدی شەهید.. سەییدی داعی.سەییدی ئەدیب.. نووسەری "القصاص، الطفل في القرية، أشواك، المدينة المسحورة، قصص الانبياء، الأطياف الأربعة "..

سەییدی شاعیر.. نووسەری "الشاطيء المجهول، حلم الفجر، قافلة الرقية"...

سەییدی ڕەخنەگر... نووسەری "مهمة الشاعر في الحياة، نقد مستقبل الثقافة في مصر، كتب وشخصيات، النقد الأدبي ـ اصوله ومناهجه "..

سەییدی شارەزاو هۆشمەند.. نووسەری "العدالة الإجتماعية في الإسلام، معركة الإسلام والرأسمالية، السلام العالمي والإسلامي، نحو مجتمع إسلامي، هذا الدين، المستقبل لهذا الدين، خصائص التصور الإسلامي ومقوماته، الإسلام ومشكلات الحضارة، معالم في الطريق"...

سەییدی ڕۆژنامەگەری سیاسی ڕاستگۆ..

سەییدی لێكۆڵەرەوەو لێكدەرەوەی قورئانی پیرۆز.. نووسەری "في ظلال القرآن"..

---

١) نەمانویست زیاتر لەسەر ژیانی بەفەڕی مامۆستای شەهید بنووسین، چونكە بەهیواین "ان شاء الله" برایەكمان لە كتێبێكی سەربەخۆ پێشكەشی خوێنەرانی كوردی بكات.

# تێبینی یەکی گرنگ

ناسینی ڕێبازو ڕێرەوی نووسەران، زۆر خاڵێکی کاریگەرە لە زوو تێگەیشتنی مەبەستیاندا.. بۆیە دەبینی ئەگەر نووسەرێکت ناسیو شارەزای ڕاوبۆچوونی بوویت، دەستبەجێ دەزانی نووسینەکەی بە، چ مەبەستێكو بۆ، چ ئاواتێك نووسیووە..
سەیید قطبی ڕەحمەتیش خاوەنی راوبۆچوونێکی سەربەخۆی ئیسلامییە. چ لە مەسەلەی باوەڕو پەرستن، چ لە مەسەلەی شێوازی کارو چۆنیەتی بانگەوازو، چ لە بزوتنەوەو گەیشتنە ئامانجدا.
دەتوانین بیری بەرفراوانی خواناسانەی سەییدی مامۆستامان لە شێوەی سێگۆشەیەکدا وێنە بکێشین:




## گۆشەی یەکەم/ عەقیدە:

سەییدی رەحمەتی ڕای وایە کە هەر هەموو دین بریتیە لەعەقیدە، ئەم عەقیدەیەش بریتیە لە سێ بەش:.

١. ناسینی خوا: واتە باوەڕکردن بەخاوەنێتیو پەروەردگارێتی خوا.

٢. پەرستنی خوا واتە: باوەڕکردن بەوەی کە پەرستن تەنها بۆ خوایە..

لەم دووخاڵەشدا ڕای وەکو برا سەلەفییەکانی ئەمڕۆ وایە، جگە لەچەند بەندێکی "أسماءء صفات" کە سەییدی ئازیز هێشتا لێیان یەکڕا نەبووبووەوە.

٣. حاکمێتی خوا: کە ئەمەش بە روکنی سەرەکی یەکخواناسین دەزانیو زۆربەی نووسینەکانی خۆیو براکەی"ئەوانەی لەم دواییەدا نووسیونی تایبەتی ئەم خاڵە سەرەکییەن..

## گۆشەی دووەم/ بزوتنەوە:

مامۆستا سەیید - ڕەحمەتی لێبێت"- ناهێڵێت ـ بەهیچ شێوەیەك ـ عەقیدەی ئیسلامی بکرێتە"تیۆر"ێكو موناقەشەی بکرێت.. بەڵکو دەبێ بریتی بێ لە باوەڕکردنو راپەڕاندنی دەستبەجێیی.. تەنانەت لەو باسانەشدا کە پێیان دەڵێن: (ئەحکامی شەرعی).. واتە سەیید ئەمانەش بە عەقیدە حساب دەکات.. ئەو باسانەش ـ کە خەڵکی دەیانخوێننو نایانخەنە کار ـ ناو دەنێ (فقه الأوراق) بزوتنەوەش بە عەقیدەکە ناودەنێ (فقه الحركة).

## گۆشەی سێیەم / کۆمەڵکاری..

سەیید ڕای وایە عەقیدە ئەگەر بشکرێ بە بزوتنەوەو، هەموو موسڵمانان بەپێی ئەو عەقیدەیان کاربکەن، کارەکەیان هەر بێبەرهەم دەبێ ـ هەڵبەتە لەدنیادا ـ تا ئەو کارانەیان یەك نەخەنو نەیکەنە کۆمەڵکاری. واتە: لە چوارچێوەی تەنزیمێکدا داینەڕێژن، نابێ..

ئەوجا دەڵێ: دەبێ تاك تاکی ئەو کۆمەڵە تەنزیمییەش هەر بە عەقیدە گۆش کرێنو لەسەر رێبازی قورئانی مەککی پەروەردە بکرێن.

لە سێگۆشەکەیدا ئەوە دەسەلمێنێ کە بە هەر گۆشەیەك دەستپێ بکەیت، دەبێ ئەو دوو گۆشەیەی تریشی لەگەڵدا وەرگریت.

ـ کەوا بوو ئەو (کۆمەڵە تەنزیم)ی یەی لەسەر غەیری (عەقیدە) دادەمەزرێو بە

(مصلحة الدعوة) دەڕوا بەرێوە، چارەنووسی پەڕەوازەیو شیرازە پسانو تۆپەڵ تۆپەڵ بوونە...

ئەو (کۆمەڵە)ی (عەقیدە)یی یە، بەڵام (بزوتنەوە)یەکی واقیعی کردەوەیی نیە، یان هەڵدەوەشێتەوەو، یان بە کۆمەڵ دەمرێ.. مردنی سیاسی..

ئەو (عەقیدە)یەش کە (کۆمەڵ)ێك دەیکاتە تیۆرو نایخاتە مەیدانی کردەوەو، دەبێتە بیرێکی فەلسەفی پووچەڵو بە کەڵکی گەل نایەت...

خوای گەورە پشتو پەنامان بێت هەوڵ دەدەین ئەم باسە لە نامیلکەیەکدا زۆرتر روون بکەینەوە..

# مەشخەڵی ڕێ

ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لە ڕۆخی كەندەڵانێكی ئاگریندایە، نەك هەر لەبەر ئەو هەڕەشەو گوڕەشەی لێی دەكرێت.. چونكە ئەمە نیشانەیەكی نەخۆشییەكەیە، نەك هەموو نەخۆشییەكە. بەڵكو لەبەر ئەوەی لەجیهانی "خووڕەوشت"دا مایەپووت بووە.. كە ژیانی مرۆڤایەتی دەتوانێت لەژێرسایەیدا بژیو بەسەلامەتی بەرەو لوتكەی بڵندی بەرزبێتەوە... ئەمەش لە ڕۆژئاوا شتێكی زۆر ئاشكرایە. ئەو ڕۆژئاوایەی هیچی لەخووڕەوشت پێ نەماوە تابیدات بەمرۆڤایەتی.. بگرە تەنانەت ئەوەندەشی پێ نەماوە كە قەناعەتێك بەخۆی بكات كە "بوون = وجود"ی هەیە... بەتایبەتی دوای ئەوەی دیموكراسی دابەزیە دواپلەی مایەپووتی، چونكە وا ـ بەرەبەرە ـ سیستمی ئابووری لە ڕۆژهەڵات دەخوازێت بەناوی سۆسیالیستی یەوە!!

ڕۆژهەڵاتیش بەدەم هەمان دەردەوە دەناڵێنێت، چونكە تیۆرە هەرەوەزییەكان ـ النظریات الجماعیة ـ بەتایبەتی ماركسیزم.. كە لە سەرەتای پەیدابوونیدا كۆمەڵێكی زۆری لەڕۆژهەڵاتو ـ لە ڕۆژئاواش ـ شوێن كەوت... لەبەرئەوەی ڕێرەو (مذهب)ێكە نیشانەی عەقیدەی تێدایە... بەڵام ئەمیش وا لەڕووی بیروهۆشو فیكرەوە كەوتە پاشەكشە، تەنانەت وای لێهاتووە كە ئێستا وا لە"دەوڵەت"و ردێمەكەیدا پەنگی خواردۆتەوە. كە زۆر زۆر لە بناغەی ڕێرەوەكەی دوور كەوتۆتەوە، ئەمیش بەشێوەیەكی گشتی بەرهەڵستی فیطرەی مرۆڤایەتیو داواكارییەكانی دەكاتو، ناشتوانێت بژی، مەگەر لە بارو زروفێكی بۆگەندا،یان لە بارو زروفێكدا كەلەگەڵ ڕژێمێكی دیكتاتۆریدا بۆ ماوەیەكی زۆر ڕاهاتبێت! تەنانەت لەم جۆرە باروزروفانەشدا لایەنە ئابوورییەكەی ـ كە بڕبڕەی پشتی ڕژێمەكەیە ـ هەر سەرنەكەوتەوو بووە، بۆیە دەبینی وا "ڕوسیا" كە بە یەكەمین وولاتی هەرەوەزییەكان دەژمێررێت وا دانەوێڵەو بەروبوومە كشتوكاڵییەكەی شكستی هێنا. پاش ئەوەی تەنانەت لە سەردەمی قەیسەرییەكانیشدا لێی زیاد بوو...

ئەوەتا وا هەرچی زێڕێکی هەبوو فرۆشتی تـا بتوانێـت گـەنمو دانەوێڵـەو شـتومەکی خواردەمەنی بکڕێت.. ئەوەش بێگومـان هـۆی سـەرنەکەتنی کۆمەڵـە هەرەوەزییـە کشتوکاڵییەکانێتی لەلایەك، لەلایەکی تریشـەوە لەبـەر ئـەوەی سیسـتمەکە لەگـەڵ سروشتی فیطرەی مرۆڤی ناگونجێت..

کـەوابوو قابیـل نیـە هـەر دەبێـت سـەرکردایەتییەکی نـوێ بـۆ کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتی بێتە کایەوە..

سەرکردایەتی پیاوی ئەوروپایی هاتە کـەمایی‌و کرژبـوون. نـەك لەبـەر ئـەوەی شارستانێتی ئەوروپا بەرەو مایەپووتی دەڕوات، یان لەبەر ئـەوەی لایـەنی ئـابووری‌و سەربازیەکەی لاوازبووبێت.. نا، بەڵکو لەبەرئەوەی ڕژێمە ئـەوروپایی یـەکان رۆڵیـان نەماو بەسەرچوو.. چـونکە سـەرمایەی "خووڕەوشـت"ی نـەما تـا بتوانێـت بـواری سەرکردایەتی بۆ بکاتەوە!

قابیل نیە هەر دەبێت سەرکردایەتییەك بێتە کایەوە کە سـیفاتی مانـەوەو ئـەو گەشەپێدانی شارستانێتی یە ماددی یەی تێدا بێت کە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی گەیشتوێتیێ لە ڕێگای عەبقەرێتی‌و بلیمەتی ئەوروپایی یـەوە لەلایـەنی پێشخسـتنی شـتومەکە ماددی یەکان..

دەبێت ئەو سەرکردایەتییە بتوانێت مرۆڤایەتی بەخووڕەوشتی نوێ تێـر بکـات، خووڕەوشتێکی وا کە تـەواوتر بێـت لـەوەی ئێسـتا مرۆڤایـەتی تێیدایـە.. هـەموو ئەمەش بەڕێبازی پرۆگرامێکی رەسەن‌و واقیعی دەبێت..

تەنها ئیسلام خاوەنی ئەو پرۆگرام‌و ئەو جۆرە خووڕەوشتەیە.

ڕاپەرینی زانستی ڕۆڵی خۆی بینی.. ئەو ڕۆڵەی لە سەرەتای چەرخی ڕاپەرینەوە ـ سەدەی شانزەی زایینی ـ دەستی پێ‌کرد.

لە ماوەی سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا گەیشـتە دواپلـەی بڵنـدی. ئێسـتاش ئـەو دەستمایەی پێ نەماوە تا بتوانێت ئـەو رۆڵـی سـەرکردایەتییە ببینێـت.. هـەروەها "نیشتمانپەروەری"و "نەتەوایەتی" وکۆمەڵە "هەرێمایـەتی" یـە گشـتییەکانیش لـەو ماوەیەدا دەرکەوتن‌و ڕۆڵی خۆیان لە ماوەی ئەو چەند سەدەیەدا بینی..

ئەوانیش ئەو دەستمایە نوێیەیان نەماوە..

ڕژێمــە تــاك خــوازو ڕژێمــە هــەرەوەزی یــەکان هــەردووکیان، لــە ئەنجامــدا سەرنەکەوتنیان وەدەست هێنا.

ئینجا ڕۆڵی "ئیسلام"و ڕۆڵی "نەتەوە"کەی هاتــەوە.. لــە کــاتێکی پڕناڕەحــەتیو سەرگەردانیو پشێویدا، ڕۆڵی "ئیسلام" هاتەوە پێش کە ئینکاری شتومەکە مــاددی یەکان ناکات لەسەرزەوی، بەڵکو بە یەکێك لــە فەرمانــەکانی مرۆڤــی دەژمێرێــت ـ هەر لە سەرەتای جێنشینێتی یەوە لــەم ســەرزەمینە، کــە لــەژێر چــەند مــەرجێکی تایبەتیدایــە ـ بەخواپەرستیشــی دەداتــە قەڵــەم، تــا مەبەســتی ســەلماندی بــوونی مرۆڤایەتی بێتەدی:

**(إذْ قالَ رَبكَ للمَلائِكة إِني جاعِلٌ فِي الأرضِ خَليفة)**(البقرة–٣٠)، واتە: خواکەت بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشــینێك بــۆ خــۆم لەســەر زەمــین دروســت دەکــەم. هــەروەها: **وَما خَلقْتُ الجنَّ والإنسَ إلاّ لِيَعبِدونِ)**(الــذاريات– ٥٦)، واتــە مرۆڤــو پەریم بۆ ئەوە دروست کردووە تا بم پەرستن..

ڕۆڵی "نەتەوەی موسڵمان" هاتە پێش تا وویستی خوا بهێنێتەدی:

**(كنتم خير أُمةٍ أُخرِجَتْ لِلناسِ تَأمرونَ بالمَعروفِ وَتَنهَونَ عَنِ المُنكَرِ وتؤمِنونَ بِالله)** (آل عمران– ١١٠)، واتە: ئێوە باشــترین نەتــەوە بــوون لــەنێو خەڵکیــدا پەیــدابوون، بەوەی کە فەرمان دەکەن بەچاکەو بەرهەڵستی دەکەن لە خراپــەو باوەڕیشــتان بــەخوا هەیە.

هــــەروەها **(وَكـذلكَ جَعَلنـاكُم أُمـةً وَسـطاً لِتَكونـوا شُـهَداءَ عَلى النـاسِ ويَكـونَ الرّسولَ عَلَيكم شَهيداً)** (البقرة– ١٤٣)، واتە: کردومانن بە نەتەوەیەکی مام ناوەنــدی تا ئێوە ببنە شاهید لەسەر خەڵکیو پێغەمبــــــەریش ببێتە شاهید لەسەر ئێوە.

# ئیسلامێکی واقیعی

"ئیسلام" ناتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێت، تا لە کۆمەڵگایەکدا نەچەسپێت، واتە لە نەتەوەیەکدا. چونکە مرۆڤایەتی ـ بەتایبەتی لەم سەردەمەیدا ـ گوێ لە عەقیدەیەکی ڕووتی ووشكو برینگ ناگرێت، کە ڕاستییەکەی لە واقیعێکی هەستپێکراودا دەرنەکەوێت.. "بوون"ی نەتەوەی ئیسلامیش چەندین سەدەیە نەهاتۆتەوە کایەوە، چونکە خۆ نەتەوەی ئیسلامی بریتی نیە لە"خاك"ێكو ئیسلامی لەسەر ژیابێت، یان "گەل"ێك نیە باووباپیرانی لە چەرخێك لە چەرخەکانی مێژوودا بەگوێرەی سیستەمی ئیسلامی ژیابن. بەڵکو "نەتەوەی ئیسلامی" کۆمەڵە مرۆڤێکن کە ژیانو هەستو هۆشو بیروبۆچوونو سیستەمو خووڕەوشتیان لە پرۆگرامی ئیسلامییەوە هەڵدەهێنجن. نەتەوەیەکیش ئەمە سیفەتی بێت زۆر دەمێکە بوونی لە مێژوودا سڕاوەتەوە، هەر لەو ڕۆژەوەی حوکمی شەریعەتەکەی خوا لەسەر هەموو سەرزەمین لادراوە.

کەوابوو قابیل نیە هەردەبێت ئەو "نەتەوە"یە "هاتنەوەبوون ـ وجود" ی هەڵبداتەوە، تا ئیسلام بتوانێت ئەو ڕۆڵەی خۆی لە سەرکردایەتی مرۆڤایەتیدا ـ کە ئێستا واچاوەڕوانی دەکات ـ جارێکی تر ببینێتەوە.

قابیل نیە هەردەبێت "بوژانەوە" بگەڕێتەوە بۆ ئەم نەتەوەیەی زۆر دەمێکە تۆزو خۆڵ دایپۆشیووە، تۆزو خۆڵی نەوەکان، تۆزوخۆڵی بیرهۆش، تۆزوخۆڵی بیروبۆچوون، تۆزوخۆڵی ئەو ڕژێمانەی هیچ پەیوەستێکیان بەئیسلامەوە نیە ـ نە خۆیانو نە پرۆگرامەکانیشیان ـ ئەگەرچی هەتا ئێستاش هەروا دەزانن ـ وەکو خۆیان دەڵێن ـ لە"جیهانی ئیسلامی"دا دەژین..

من دەزانم ماوەی نێوان "بوژانەوە"و "سەرکردایەتی" ماوەیەکی زۆر دوورو درێژە.. چونکە زۆر دەمێکە نەتەوەی ئیسلامی لە"بوون" دوورە. لەم ماوەیەشدا زۆر

جۆر بیروباوەڕو نەتەوەی جوی‌و بیروهۆش‌و باروزروفی جیاواز سەركردایەتی مرۆڤایەتی گرتبووە دەست. بلیمەتی ئەوروپاش لەم ماوەیەدا دەستمایەیەكی زۆری "زانستی"و "ڕۆشنبیری"و "ڕژێم"و "بەرهەمی ماددی" پەیداكردووە. ئەمەش دەستمایەیەكی زۆرە كە مرۆڤایەتی لەلوتكەیدا دەوەستێت. هەروا بەئاسانیش لەدەست ناچێت. بەتایبەتیش لەكاتێكدا ئەوەی كە پێی دەڵێن "جیهانی ئیسلامی" لەم هەموو جوانیە بێبەش‌و كەم دەرامەتە.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەمووەشدا قابیل نیە هەردەبێت "بوژاندنەوەی ئیسلامی" بێتەكایەوە، هەرچەند ماوەی نێوان بوژاندنەوەو وەرگرتنی سەركردایەتی دوورو درێژ بێت، چونكە هەوڵدانی بوژانەوەی ئیسلامی یەكەم هەنگاوەو وازلێهێنانی ئەستەمە.

# لێهاتوویی

جا بۆ ئەوەی ـ لەدیاری کردنداـ چاك ئیشی خۆمان لەبەرچاو بێت، دەبێت هەست بە رادەی لێهاتوویی ئەم نەتەوەیە بکرێت، بۆ وەرگرتنی سەرکردایەتی مرۆڤایەتی. نەبادا هەر لە یەکەم هەنگاوی بوژانەوەکەدا بەهەڵەدا بچین.

ئەم نەتەوەیە ـ لەم کاتەیدا ـ توانای بەخاوەن بوونی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیو سەرکەوتنێکی وەها نیە لەپێش خستنی شتومەکی ماددیداـ داواشی لێنەکراوە ـ تا گەردنی بۆ کەچ بکرێت. بەو هیوایەی لەم لایەنەوە سەرکردایەتی جیهانی خۆی بسەلمێنێ ـ چونکە بلیمەتی ئەوروپایی لەم لایەنەوە زۆر دەمێکە پێشی داوەتەوە ـ بێگومان واشی لێ چاوەڕوان ناکرێت (لەماوەی چەند سەدەیەکدا) لەهەموو لایەنێکی ماددییەوە بەسەریدا زاڵ بێت.

کەوابوو قابیل نیە هەردەبێت لەلایەنێکی ترەوە هەوڵ بدرێت. لایەنێکی وا کە ئەو شارستانێتی یە ئەوروپایی یە نەیبێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت پێش خستنی ماددی وازلێ بهێنینو بایەخی پێ نەدەین نەخێر، بەڵکو پێویستی سەرشانمانە بەهەموو توانایەکمانەوە هەوڵی بۆبدەین.. نەك بەو سیفەتەی لایەنێکەو بەهۆی ئەوەوە دەتوانین لەم قۆناغەی مرۆڤایەتیدا سەرکردایەتی پێ بگرینەوە دەست، نا، بەڵکو، لەبەرخاتری پێویستی خۆمان. هەروەها لەبەرئەوەی ئەرکێکی سەرشانەو "ئایدیولۆژیای ئیسلامی" وای فەرز دەکات لەسەرمان کە دەبێت بەردەوام هەوڵی بۆ بدەین.

ئەو بیروهۆشەی ئێمەی بە جێنشینی خوا داناوە لەسەر زەمین ئەو هەوڵدانەشمان ـ لەژێر چەند مەرجێکی تایبەتیدا ـ بە خواپەرستی بۆ حیساب دەکات، مادام ئێمە مەبەستمان سەلماندنی بوونی مرۆڤە.

کەوابوو قابیل نیە هەردەبێت مرۆڤی موسڵمان لایەنێکی تر بگرێتە دەست ـ

جگە لەپێش خستنی ماددی ـ بۆ هێنانەوەی سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بۆخۆی. ئەم لایەنەش "عەقیدە"و "پرۆگرام"ە، کە بوار بۆ مرۆڤایەتی دەکەنەوە، تا پارێزگاری بەرهەمی ئەو بلیمەتە ماددیە بکات لەژێر سەرپەرشتی هەستو بیرهۆشێکی تردا، کە وەڵامی پێویستییەکانی فیطرە بداتەوە، وەك کە وەڵامی پێویستییەکانی تری مرۆڤ دەداتەوە بەپێش خستنە ماددییەکان، پێویستە ئەم عەقیدەو پرۆگرامەش لە کۆمەڵگایەکی مرۆڤدا بچەسپێنرێت. واتە لە کۆمەڵگایەکی موسڵماندا.

❊ ❊ ❊

# جیهانی ئەمڕۆش لە جاهیلییەت دایە

ئەمڕۆ هەموو جیهان لە جاهیلییەتدا دەژی، لەو لایەنەوە کە هەموو بنەماکانی ژیانو، سیستمەکانی لەسەرچاوەیەکی جاهیلییەوە، وەردەگرێت. کە ئەم هەموو پێشکەوتنە ماددییە کەمێك باری ئەو جاهیلییەتە سووك ناکات!

ئەم جاهیلییەتەش لەسەر بناغەیەکی ناقۆڵا دامەزراوە. کە بریتیە لە: دەست درێژیکردنە سەر دەسەڵاتی خوا لەسەر زەمیندا. بەتایبەتی سیفەتە خوایی یەکەی (الالوهیة).. کە ئەویش حوکم کردنە. جاهیلییەتی ئەمڕۆ حوکم کردن دەداتە دەست مرۆڤ. بۆیە هەندێکیان دەبنە خوای هەندێکی تریان نەك بەو شێوە سادەو ساویلکەی جاهیلییەتی پێشوو بەخۆیەوە بینی، بەڵکو بەشێوەیەکی تر.ئەویش ئەوەیە کە مافی دانانی ئایدیۆلۆژیو دیاریکردنی خووڕەوشتو داڕشتنی یاساو شەریعەت وڕژێم وباروزروفی دەداتێ. کە هەموویان دوورن لە پلانی پرۆگرامێکی ژیانی خواوویست.

زۆر لەو یاساو ڕژێمانەش خوا مۆڵەتیان پێنادات. کەوابوو لەمەوە دەست درێژی مرۆڤ بۆ سەر دەسەڵاتی خوایی پەیدابوو دیاردەی ڕوونو ئاشکرای ئەو دەستدرێژییەش ئەو بێ ڕێزیو کەم نرخییەی "مرۆڤ"ە کە لەرژێمە هەرەوەزییەکاندا هەیە، هەروەها لەستەمکاری ئەو تاكو دەستانەدا دەردەکەوێت کە لە رژێمی سەرمایەداریدا هەن، هەروەها لە ستەمکاری ئیمپریالیزمدا دەردەکەوێت کە بەناوی دیموکراسی یەوە دەکرێت. ئەمانە هەمووی، سەرەنجامی ئینکارکردنی ئەو ریزەیە کە خوا بۆ مرۆڤی داناوە!!

ئیسلام تەنها پرۆگرامە لەمبارەیەوە. چونکە خەڵکی لەژێر سایەی هەموو رژێمێکی تری غەیری ڕژێمی خوایی، هەندێکیان هەندێکی تریان دەپەرستن ـ جا بەهەر شێوەیەك بێت ـ تەنها لەپرۆگرامی ئیسلامیدا مرۆڤ ئازادە. ئازاد بووە لەوەی هەندێکیان هەندێکی تریان بپەرستن. چونکە هەموو تەنها لەئیسلامەوە وەردەگرن.

هەمووش مل هەر بۆئەو کەچ دەکەن. ئەمەش دوو ڕێیانێکە. ئەمەشە ئەو ئایدیۆلۆژی یە تازەیەی کە ئێمە هەمانەو دەتوانین بیدەین بە مرۆڤایەتی. ئەمەو هەرچییەکی تر کە لەسەر ئەو ئایۆلۆژیای یە دادەمەزرێت. کە هەریەکەیان کارێکی قوڵیان لەواقیعی ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە. ئەوەش ئەو دەستمایەیە کە مرۆڤایەتی نیەتی. چونکە ئەمە، نەلە "بەرهەم"ی شارستانێتی ڕۆژئاوادا هەیە، وە نەلە"بەرهەم"ی بلیمەتی ئەورووپادا هەیە. جا چ ڕۆژهەڵاتی بن چ ڕۆژئاوایی.

❊ ❊ ❊

بێگومان ئێمە شتێکی تەواو نوێمان هەیە کە مرۆڤایەتی نیەتیو ناشزانێتو ناشتوانێت بەرهەمی بێنێت.. بەڵام ئەم شتە نویێەش ـ وەکو وتمان ـ قابیل نیە هەر دەبێت لە واقعێکی کردەوەییدا بچەسپێنێت، قابیل نیە هەردەبێت نەتەوەیەکی پێ بێتەدیو نەتەوەیەکی پێ بژی... کە ئەمەش پێویستی بە"بوژاندنەوە" هەیە لەسەر خاکی ئیسلامی..

ئەم بوژانەوەیەش ـ دوای ماوەیەکی کەم یان زۆر ـ وەرگرتنی سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بەدوادا دێت. بەڵام ئایا "بوژاندنەوەی ئیسلامی" چۆن دەستپێدەکات؟

"بوژاندنەوەی ئیسلامی" بەکۆمەڵێك دەکرێت کە وورەیەکی بەرزی تێدابێتو بکەوێتە ڕێ..

بە رەهێڵەی زستانی شەوی جاهیلییەتدا، بە هەموو شوێنێکی زەمیندا بکەوێتە رێ..

بکەوێتە ڕێو لەلایەکەوە جۆرە گۆشەگیری یەك بکاتو، لە لایەکی تریشەوە جۆرە پێکگەیشتنو ژوانێك لەگەڵ جاهیلییەتی دەوروبەریدا بکات.

قابیل نیە هەردەبێت ئەم کۆمەڵەش کە ئاوا وورە بەرزبێت چەندین "مەشخەڵی رێ" بەکاربهێنێت. کەخۆی شارەزای ڕۆڵو حەقیقەتی فەرمانو ئاشکرایی مەبەستو ئامانجی ئەو مەشخەڵانە بێت.. شارەزای یەکەم هەنگاوی ئەم گەشتە دوورو درێژە

بێت.. شارەزای ئەو هەڵوێستانە بێت کە دەبێ ببێت بەرامبەر ئەو جاهیلییەتەی لەسەر زەمین شەپۆل دەدات..

دەبێت ئەندامانی ئەو کۆمەڵە شارەزا بن. لەکوێ بەخەڵکی دەگەنو لەکوێ لێیان جوێ دەبنەوە..

بزانن سیفەتی کۆمەڵەکەی خۆیان چیەو؟ سیفەتی جاهیلییەتی دەووروبەریان چیە؟!

بزانن دەربارەی چیو چۆن بە زمانی ئیسلام لەگەڵ خەڵکی ئەو جاهیلییەتە دەدوێنو؟ چۆن لەگەڵیان رەفتار دەکەن؟

بزانن ـ لەم هەموو سەرچاوانەـ لە چیەوە وەردەگرنو چۆن دەیگەێنن؟!

بێگومان قابیل نیە هەردەبێت ئەم مەشخەڵانە تەنها لە سەرچاوەی یەکەمی ئەم عەقیدەیەوە، وەربگیرێت. لە قورئانەوە.. لە تەوجیهاتە سەرەکییەکانیەوە.. لەو هەستو بیروهۆشەی کە لە دەروونی ئەم کۆمەڵە هەڵبژێراوەی یەکەمینی خۆیدا دروست بوو بوو. ئەو کۆمەڵەی کە خوا چ موعجیزەیەکی ویست، پێی دروستکردن.. کە هێڵی مێژووی گۆڕی بەو شێوەیەی کە خوا خۆی ویستی.

❊ ❊ ❊

بۆ ئەم کۆمەڵەی چاوەڕوانیم وا "مەشخەڵی رێ" م نووسی. کە چوار بەشی لە کتێبی "في ظلال القرآن" وەرگیراوە[1]، بەدەستکارییەوە ـ لەگەڵ چەند بابەتێکی تردا کە لەگەڵ ئەم باسەدا دەگونجێن. هەشت بەشیان ـ جگە لە پێشەکییەکە ـ لە چەند کاتێکی جیاوازدا نوسراون، ئەوەندەی ڕۆشنایی وەحی پرۆگرامە خوایی یەکەمان "قورئانی پیرۆز" فێری کردبین، کە ئەگەر هەمووی بخەینە سەریەك دەبنە چەند مەشخەڵێکی رێ .. وەك کە هەموو رێبازێك مەشخەڵی دەوێ.. سەرجەمی

١) وەك: سروشتی (پرۆگرامی قورئانی)...و (ئایدیۆلۆژیو ڕۆشنبیری ئیسلامی)..و (جیهاد لەپێناوی خوادا)...و (پێکهاتن و سیفاتی کۆمەڵگەی ئیسلامی).

هەموو ئەم باسانەش یەکەمین مەشخەڵە لە مەشخەڵەکانی ڕێ. کە هیوادارم کۆمەڵە باسی تریشیان بەدوادا بێت. ئەوەندەی خوا ڕێنماییم بکـات بـەرەو مەشـخەڵی ئـەم ڕێگایە..

سەرکەوتنیش لەلایەن خواوەیە..

# نەوەیەکی بێ وێنەی قورئانی

دیاردەیەکی مێژوویی هەیە، کە پێویستە هەڵگرانی ئاڵای بانگەوازی ئیسلامی لە هەرکوێ‌و، لە هەر سەردەمێکدا ژیان ڕەچاوی بکەن‌و لەبەردەمیدا بۆ سەرنجدان لێ بوەستن. چونکە ئەو دیاردەیە کارێکی کاریگەری هەیە لە دیاریکردنی بانگەوازو ڕێ پیشاندان‌و نەخشەکێشاندا.

ئەم بانگەوازە. نەتەوەیەکی پتەوی لەنێو خەڵکیدا وەبەرهەم هێنا ـ نەوەی یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ نەوەیەکی جیاواز، کە لە هەموو مێژووی ئیسلامیدا، بگرە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوتای نەبۆتەوە. پاش ئەوانیش لەو جۆرە نەوەیە پەیدا نەبۆتەوە.. بەڵێ بەدرێژایی مێژوو ئەندامی موسڵمانی هاوشێوە، تاك تاك پەیدا بوون، بەڵام هەرگیز لەوە بەدواوە رووی نەداوە، بەو شێوە زۆرەو، لە یەك جێدا، نەوەیەکی وا دروست بووبێتەوە، وەکو کە لە سەرەتای پەیدابوونی بانگەوازی ئیسلامیدا روویداـ ئەم دیاردەیە ئاشکرایەو ڕوویداوە، کە ناوەرۆکێکی تایبەتی هەیە. بۆیە راوەستان لەبەردەمیدا بۆ سەرنجدان لێی، پێویستە. تا شارەزای نهێنیەکانی ببین‌و شوێن پێی هەڵگرین.

قورئانی ئەم بانگەوازە وا لەبەر دەستماندا. فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەفتارو گوفتارو کردەوەو مێژووە زێرینەکەی ژیانمان وا لەبەردەستدا. هەروەك کە لەبەردەست یەکەمین نەوەی ئەم ئیسلامەدا بوون. ئەو نەوەیەی کە جارێکی تر لە (بوون)دا دووپات نەبووەوە. تەنها شتێکمان لەبەردەستدایە ئایا ئەمە نهێنیەتی؟!

ئەگەر بوونی پێغەمبەر ﷺ پێویست بوایە بۆ بەردەوامبوونی ئەم بانگەوازەو، پێگەیشتنی بەرهەمەکەی، خوای پەروەردگار بانگەوازەکەی نەدەکردە بانگەوازێکی گشتی‌و، کۆتا پەیامی ئاسمانی‌و، کاروباری خەڵکی بۆ هەتاهەتایی پێ‌نەدەسپارد..

بەڵام خوای پەروەردگار کە تەنها خۆی زامنی پاراستنی ئەم قورئانە بووە،

دەیزانی کە ئەم بانگەوازە بەبێ پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دەبێت‌و، بەرهەمی خۆشی هەر دەدات.. بۆیە پاش بیست‌و سێ ساڵ لە گەیاندنی پەیام، خوا بردیەوە بۆ خزمەت خۆی‌و، ئایینەکەیشی تا ئێستاو، تا ئاخرزەمان هێشتوٚتەوە.. کەوابوو ئامادەنەبوونی شەخسی پێغەمبەر ﷺ ئەو دیاردە مێژوویی یە لێك ناداتەوە کە لە سەرەتاوە ووتمان.

## سـەرچاوەی بیـروهـۆش

کەوابوو با بەدوای هۆیەکی تردا بگەڕێین تا دەگەینە ئەو سەرچاوەی نەوەی یەکەم لێی هەڵدەهێنجا. بەڵکو شتێکی لـێ گۆڕا بێت! با سەرنج بدەینــە ئــەو پرۆگرامــەی ئەوان لەسەری دەڕۆیشتن، بەڵکو ئەویش شتێکی لــێ گۆڕا بێت!

قورئان یەکەمین سەرچاوە بوو کە نەوەی یەکەمی ئیسلام لێیان هــەڵ دەهێنجــا.. تەنها قورئان. فەرمایشتەکانی پێغەمبــەریش ﷺ شــوێنەوارێکی ئــەو سەرچــاوەیە بــوون. بۆیــە کاتێــك لــە خــاتوو عائشــەخانی خێزانــی پێغەمبــەریان ـ دەربــارەی خووڕوشتی پێغەمبەر ﷺ پرسی، لە وەڵامدا فەرمووی: (کـانَ خُلُقُـه القُـرآن = واتــە خووڕەوشتی قورئانی بوو).

کەوابوو ئەو سەرچاوەی کە لێیان هەڵ دەهێنجا، تەنها قورئان بوو.. لێیــان هــەڵ دەهێنجاو خۆیان لەگەڵ دەگونجانـد. وەك کۆلیجێــك لێــی دەردەچــوون. دانــانی ئــەم قورئانەش بە یەکەمین سەرچاوە لەلایەك ئەو نەوەیەوە وەنەبێت لەبەرئەوە بووبێت کە مرۆڤایەتی خاوەنی شارستانێتیو ڕۆشنبیریو زانستیو کتێبــی دانــراوو لێکۆڵینــەوە نەبووبێت. نەخێر، چونکە شارستانێتی رۆمــان بەهــەموو ڕۆشــنبیریو لێکۆڵینــەوەو یاساکانیەوە، لەوکاتەدا هــەبوو. کــە تــا ئێســتاش ئــەوروپای لەســەر دەژیو، هــەر بەردەوامی ئەوە لەمدا ماوە. هــەروەها پاشمــاوەی شارســتانێتی ئیغریــق مــابوو، چ مەنطیق بووبێت، چ فەلسەفەو هونەرەکەی ـ کــە ئەمیشــیان تــا ئــەمڕۆ سەرچــاوەی بیروهۆشو ڕۆشنبیری رۆژئاوایە.

هەروەها شارستانێتی فــارس، بــە هونــەرو شــیعرو ئەفســانەو عەقیــدەو رژێمــی کارگێریو حوکمیەوە، هەبوو. هەروەها شارستانێتی دوورو نزیکی وەك شارســتانێتی چینو هیندستانو.. هتد هەبوون.

هەردوو شارستانێتی فارسو رۆمان، باشــورو بــاکوری نیــوە دورگــەی عــەرەبیان

داگرتبوو. هەروەها دیانو جولەکە (مەسیحیو یەهودی)ش لەناو جەرگەی نیوەدورگەدا دەژیان.. کەوابوو نەوەی یەکەم لەبەر نەبوونی شارستانێتی جیهانیو، ڕۆشنبیری باڵا نەبوو. کە تەنها لەویەك سەرچاوەیەو تەعلیماتی وەردەگرت.. بەڵکو بەپێی "نەخشە"یەکی کێشراوی پرۆگرامێکی دیاریکراو بوو، بەڵگەشمان تووڕەبوونەکەی پێغەمبەر ﷺ لە عومەری کوڕی خطاب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کاتێك لاپەڕە تەوراتێکی بەدەستەوە بینیو، فەرمووی: ((**وإنّه واللهِ لَو كانَ موسى حيّاً بينَ أظهُرِكم ما حَلَّ لَه إلاّ أنْ يتّبِعَني**))، واتە: بەگەورەیی خوا، ئەگەر موسا زیندووبوایەو لە ناوتاندا بوایە، بۆی دروست نەبوو ڕێبازێکی تری غەیری قورئان وەربگرێت ئیللا دەبوو شوێن من بکەوێت .

کەوابوو پێغەمبەر ﷺ وای مەبەست بوو کە ئەو نەوەیە لەقۆناغی یەکەمی دروست بوونیدا، تەنها لەسەرچاوەی قورئانەوە هەڵ هێنجێت.. تەنها لەکتێبەکەی خواوە.. تا دەروینان بۆ قورئان تەرخان بکەنو بەس. تا تەنها لەسەر ئەو پرۆگرامە پەروەردەبن. بۆیە پێغەمبەر ﷺ کە عومەری بینی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وا لە سەرچاوەیەکی تری غەیری قورئانەوە، وەردەگرێت، تووڕە بوو.

پێغەمبەر ﷺ دەیەویست نەوەیەکی تایبەتی پەروەردە بکات، کە دڵو ژیریو بیروهۆشو هەستو سۆزو بنیاتنانیان دوور بێت لە هەموو کاریگەرێکی تری غەیری پرۆگرامە خوایی یەکەی کە هێناویێتی.. کە قورئانی پیرۆز بوو..

کەوابوو وەرگرتنی تەعلیماتی ئەو نەوەیە تەنها لەو سەرچاوەیە بوو ـ بۆیە ئەو شێوە دەگمەنە بێوێنەی لە مێژوودا هێنایە کایەوە.. بەڵام پاشان چی روویدا؟ سەرچاوەکان تێکەڵ بوون، جۆگەلەیتر رژانە سەر سەرچاوەکە.. فەلسەفەو مەنطیقی ئیغریق، ئەفسانەو بیروهۆشی فارس، ئیسرائیلیاتی جولەکەو، لاهوتی دیانو.. هتد ڕۆشنبیری شارستانێتی تری رژانە ناو.. ئەمانە هەمووی تێکەڵی تەفسیری قورئانو زانستی ـ علم الكلامو ـ شەرعناس ـ فقەو ـ زانستی ئوسول بوون.

ئینجا نەوەکانی داهاتووش لەو سەرچاوە لێڵەوە هەڵیانهێنجاو، خواردیانەوە.. بۆیە نەوەیەکی تری وەك نەوەی یەکەم لە مێژوودا پەیدا نەبووەوە.

بێگومان لێڵ بوونی ئەو سەرچاوەیە هۆیەکی کاریگەر بوو لە دروستکردنی ئەو جیاوازییە ئاشکرایەی کە پەیدابوو لە نێوان نەوەی یەکەمو ئەو نەوانەی بەدوویدا هاتن.

# شـێوەی وەرگـرتن

هۆیەکی سەرەکی تریش هەیە بێجگە لە جیاوازی سروشتی سەرچاوەکان. ئـەویش بریتیە لە جیاوازی شێوەی وەرگرتن، بەو شێوەی کە لە نەوەی یەکەمدا وەردەگیرا.

ئەوان ـ نـەوەی یەکـەم ـ مەبەسـتیان لـە قورئـان خوێنـدن چـاو پیاخشـاندنو زیادکردنی ڕۆشنبیری نەبوو. مەبەستیان تەنها لەزەت لێکردن وتـام وخۆشـی ئایەتـە قورئانیەکان نەبوو. وەنەبێ کەسـیان کـاتی قورئـان خوێنـدن مەبەسـتی زیـادکردنی ڕۆشنبیری کەسی خۆی بووبێت. یان مەبەستی دۆزینەوەی کێشە شەرعناسـی یـەکان بووبێت. یان مەبەستی زانیاری‌یە قورئانیەکان بووبێت، بەو هیوایەی هەگبەکەی لـێ پڕبکات.. بەڵکو کاتێك کە قورئانیان دەخوێند بۆ وەرگرتن بوو.

وەرگرتنی فەرمانی خوا.. چ دەربارەی کاروباری خۆیان چ دەربارەی کاروباری ئـەو کۆمەڵەی لەناویدا دەژین، وە چ دەربارەی ئەو ژیانە بوو بێت کەخۆیانو کۆمەڵەکەیان دەیان بردەسەر. هەرکەسێك کە ئەو فەرمانەی وەردەگرت، بـۆ ئـەوە وەریـدەگرت تـا دەست بەجێ رایپەڕینێ. وەك ئەو سەربازەی (فەرمانی ڕۆژانە)ی خۆی لـە گۆڕەپـانی مەشق کردندا وەردەگرێت کە لەگەڵ بیسـتنی فەرمانەکـەدا وەری دەگرێـتو دەسـت بەجێ جێبەجێی دەکات! وە نەبووبێت کەسـیان لـە دانیشـتنێکی قورئـان خوێندنـدا ئایەتی زۆری خوێندبێت. چونکە دەیزانی ئـەو زۆر خوێندنـە ئەرکـەکانی سەرشـانی، قورستر دەکات. بۆیە تەنها (١٠ دە) ئایـەتی وەردەگـرت، لەبـەری دەکـردن، پاشـان تطبیقی دەکردن، ئەوجا دەچوەسەر دە ئایـەتی تـر.. وەکـو کـە لـە حەدیسـی (ابـن مسعود)دا باسکراوە[(١)].

ئەم هەستکردنە.. هەستکردنی وەرگرتن بۆ تطبیق کردن.. چەندەها ئاسـۆی تـام ولەزەتی قورئانی بۆ دەردەخستن. هەروەها چەندەها ئاسۆی زانسـتی تـر. کـە ئەگـەر

---

١) ابن کثیر **لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی یەوە.**

قورئانیان بەمەبەستی چاو پیاخشاندن بخوێندایە دەستیان نەدەکەوت.. ئەم جۆرە وەرگرتنە بوو، کاروباری بۆ ئاسان دەکردن و، ئەرکی سەرشانی سووکتر دەکردن و، قورئانی تێکەڵ بەناخیان دەکردو، لەدڵ ودەروندا بۆی دەکردنە پرۆگرامێکی واقیعی ژیانیان، بۆی دەکردنە کەرەسەیەکی ڕۆشنبیری بزوێنەر، کە نەك تەنها لە بیرومێشك، یان لە لاپەڕەی کتێبدا بمێنێتەوە. بەڵکو ببێتە روداوی زیندوی ژیان، وێردی سەرزمانێك بێت کە ڕێڕەوی ژیانی پێ بگۆڕێت.

ئەم قورئانە گەنجو فەڕی خۆی بەکەس نابەخشێت، تا ئەو کەسە بەو شێوە تەواوە وەری نەگرێت. شێوەی زانستیانە کە کردەوە هەڵسورێنێت. چونکە ئەم قورئانە بۆ ئەوە نەهاتووە، ببێتە کتێبێکی لەزەتی ژیری، یان کتێبێکی ئەدەبی و هونەری، یان کتێبێکی چیرۆكو مێژوو.. ئەگەرچی هەموو ئەمانە لەناوەرۆکی قورئانەکەدا هەن: بەڵکو قورئان بۆ ئەوە هاتووە کە بکرێتە پرۆگرامی ژیان. پرۆگرامێکی تایبەتی خوایی، خوای پەروەردگار. خوا بەم شێوەیە دەیوویستن بۆیە قورئانەکەشی بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ دەنارده خوارەوە:

(قرآناً فَرَقْنَاه لِتَقْرأهُ عَلى النّاسِ عَلى مُكْثٍ وَنَزّلْناهُ تَنْزِيلاً)(الإسراء- ١٠٦)

واتە: قورئانێکمان مەبەست بوو، کە بۆ خەڵکی بخوێنیتەوە بۆ مەبەستێك. بەو شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵیش بۆمان ناردوویتە خوارەوە.

ئەم قورئانە هەمووی بەجارێك نەهاتۆتە خوارەوە، بەڵکو بەگوێرەی پێویستی. بەشێوەیەك لەگەڵ نەشونمای کۆمەڵگەو ژیاندا بگونجێت. بەگوێرەی گیروگرفتی کردەوەیی کۆمەڵەی موسڵمان، کە لە ژیانی واقیعیدا تووشیان دەبوو ئایەتێك یا چەند ئایەتێك لەکاتێکی تایبەتیدا، یان لەڕووداوێکی دیاری کراودا دەهاتە خوارەوە کە باسی دەرونی خەڵکەکەی دەکرد بۆیان. پلانی ئەو کاروبارانەی بۆ دەکێشان کە تێیدابوون. بەرنامەی ئیشکردنی بۆ دادەڕشتن بەرامبەر هەر هەڵوێستێك تووشیان دەبوو. هەڵەی بیروهۆشو هەستو سۆزو خووڕەوشتیانی ڕاست دەکردەوە. ئەمانەش هەموو بەلایەنی خواپەرستییەوە بەگوێرەی ئەو پرۆگرامە کاریگەرە خوایی یە دەبەستەوە. ئەو کاتە هەستیان دەکرد کە لەژێر چاودێری خوادا دەژین و، لەژێر

دەسەڵاتدارێتی ئەودان پاشـان لەگـەڵ واقیعـی ژیانیـدا بـەگوێرەی تـەعلیماتی ئـەو پرۆگرامە مەزنە خوایی یە، خۆیان دەگونجاند.

ڕێرەوی قورئان وەرگـرتن بـۆ كـار پێكـردنو تطبیـق كـردن بـوو، كـە نەوەیـەكی ئیسلامی وای هێنایە كایەوە.. ڕێـرەوی قورئـان وەرگـرتنیش بـۆ چـاو پیاخشـاندنو ڕۆشنبیری زیادكردن بوو كە ئەو نەوانەی تری هێنایە كایەوە. كـە دوابـەدوای نـەوەی یەكەم هاتن.. هیچ گومان لەوەدا نیە كە هەر هۆی دووەم بـوو، بـوە هـۆی دروسـت بوونی جیاوازی لەنێوان نەوەی یەكەمو نەوەكانی تری دوایی..

# وازهێنـان لـە جاهیـلییـەت

هۆیەکی سێیەمیش کە ئەویش شایەنی تۆمارکردنو سەرنجدانە. هەر کەسێك کـە دەهاتە ئـایینی ئیسـلامەوە، هـەموو پۆشـاکێکی ڕابـوردووی جاهیلییـەتی خـۆیو کۆمەڵەکەی لەبەر خۆدا دادەماڵی ئینجـا هەسـتی دەکـرد کـە دەسـتی کـردووە بـە قۆناغێکی نوێی ژیان، کە لە هەموو شێوازێکیدا جیـاوازە لەگـەڵ ئـەو ژیانـەی لـە جاهیلییەتیدا بردبوویە سەر.

بەترس وگومانو دوو دڵییەوە تەماشای هەموو هەڵوێسـتێکی جـاهیلی دەکـرد، لەوەی خووی پێوە گرتبوو. وای هەست دەکرد کە ئەمانەی رابـردوو هـەموو پیسـنو کەڵکی ئیسلامیان پێوە نیە. بەم هەستو سۆزەوە رێنمایی ئیسلامی وەردەگرت. خۆ ئەگەر جارێك خووڕەوشتی جاهیلی پێشوو بۆلای خـۆی ڕابکێشـایەتەوە، یـان هـەواو هەوەس بەسەریدا زاڵ ببوایەتەوە، یان جارێك بەرامبـەر بـە ئەرکـە ئیسـلامییەکانی هەستی بەسستی بکردایە، دەست بەجێ هەستی بـەتاوانباری دەکـردو، بەپێویسـتی دەزانی خـۆی لـەو غایلەکردنـە پـاك بکاتـەوە. بۆیـە سـەرلەنوێ هـەڵس وکـەوتو بیروهۆشی خۆی بەرێبازی قورئانەکەی دەکێشایەوە.

دیسان لەهەست وسۆزیدا، گۆشـەگیرییەکی تـەواوی هـەبوو لـەنێوان رابـوردووی جاهیلییەتیو ئێستای ئیسلامیدا. کـە ئەمـەش گۆشـەگیری یـەکی دەخولقانـد لـە هەموو پەیوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکاندا. وەك پەیوەندی نێـوان خـۆیو کۆمەڵگـەی جاهیلی دەوروبـەری. بۆیـە یـەکجاری لـە کۆمەڵگـەی جـاهیلی جـوێ دەبـووەوەو، یەکجاریش دەهاتـە نێـو کۆمەڵگـەی ئیسـلامی یـەوە. ئەگەرچـی لەگـەڵ هەنـدێك بێباوەڕی جاهیلیشدا لە مەیدانی سەوداو مامەڵەی بازاڕدا، هەڵسوکەوتی ڕۆژانـەی هەردەما..

کەوابوو گۆشەگیری هەستو سۆز شتێکەو سەوداو مامەڵـەی ڕۆژانـەش شـتێکی

تر..

هەروەها ئەو کەســە هەرچــی شــتێك مــۆرکی جــاهیلی پێــوە بوایــە لەبــەرخۆی دادەماڵی: ئایدیۆلۆژی، نەریت، هەست وهۆش وخوڕەوشتو، پەیوەنیەکانی نــاوخۆ.. هتد..

ئەم لەخۆ داماڵینەش بریتیە لە: داماڵینی عەقیدەیەك کە هاوبەشی بۆ خوا پەیدا دەکاتو، پاشان پۆشینی عەقیــدەی خــوا بەیەکناســین. دامــاڵینی هەســتو هۆشــی جاهیلیو پۆشینی هەستو هۆشی ئیسلامی.. لە هەموو لایەنــەکانی بــوونو ژیانــدا بۆیــە هــەموو ملکەچــیو گوێڕایــەڵیو شــوێن کــەوتنێکی بــۆ ئــەو کۆمەڵگــەو سەکردایەتییە ئیسلامییە تەرخان دەکرد.

ئەمــەش دوو ڕێیانێکــە! هــەم دەســت پێکردنــەوەی پاڵپەســتۆی نەریتــەکانی کۆمەڵگەی جاهیلییە، کە خووی پێوە دەگــیرێ.. هــەروەها کەمکردنــەوەی هــەموو جۆرە بیروهۆشو خوڕەوشتێکی جاهیلیشە.

پاشان کۆسپەکانی سەر ڕێدەمان، کەبریتی بوون لەو ســزاو ئــازارو ناڕەحەتییــەی تووشی موسڵمان دەهاتن. بەڵام چونکە ئەو موســڵمانە لــەدڵ ودەرونیــدا وورەیــەکی بەرزی بۆ پەیدا ببوو، هەموو هێزی ئایدیۆلۆژیو بیروهۆشو خوونەریتی کۆمەڵگــەی جاهیلی نەیاندەتوانی ڕێی لێبگرن.

ئێمەش ئەمڕۆ لەجاهیلییەتدا دەژین.. جاهیلییــەتێك هــەروەك ئــەو جاهیلییەتــە وایــە کــە هاوچــەرخی ئیســلام بــوو. بگــرە تــاریکتریش. هەرچــی لەدەوروبەرمانــە جاهیلییە: ئایدیۆلۆژیو عەقیدەو بیروهۆشی خەڵکی، عاداتو نەریتیان، سەرچــاوەی ڕۆشنبیری یان.. هونەرو ئەدەبو یاساو ڕژێمیــان.. تەنانــەت زۆربــەی ئەوانــەش کــە ئێمــە بەڕۆشــنبیری ئیســلامیو سەرچــاوەی ئیســلامیو فەلســەفەی ئیســلامیو بیرکردنەوەی ئیسلامیان دادەنێین.. ئەمانەش دەســتکردی ئــەو جاهیلییەتــەن! بۆیــە خووڕەوشــتی ئیســلامی لەدەروناندا جــێگیر نابێــتو، هەســت بــە ئیســلام کــردن لەژێرماندا روون نابێتــەوە، ســەرەنجام نەوەیــەکی وا زۆریشــمان بــۆ بنیاتنــانرێ لــەم خەڵکە، وەکو ئەو شێوەیەی ئیسلام لە یەکەمجاردا بنیاتی نا.

کەوابوو قابیل نیە ـ لـەپرۆگرامی بزوتنـەوەی ئیسـلامیدا ـ پێویسـتە لـەماوەی ساوایی‌و پێکهاتنـدا، هەرچـی کـارتێکردنێکی جـاهیلی هەیـە کەلەناویـدا دەژیـن، ولێـوەی وەردەگـرین، پێویسـتە لەبـەر خۆمـانی دامـاڵین. قابیـل نیـە هـەردەبێت بگەڕێینەوە سەر یەکەم دەست پێکردنی پێوانی سەردەمی ئیسلام.. ئـەو سەرچـاوەی کە ئەوان لێیان هەڵدەهێنجا چونکە خۆ ئێستاش سەرچاوەکە، هەورەکو خۆی بەپاکی ماوەتەوەو لێڵ نەبووە.. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو. تا هەموو بیروهۆشێك بەرامبـەر ڕاستی بونەوەرو، ڕاستی بوونی مرۆڤایـەتی لێ‌هـەڵ بهێـنجین.. بـۆ هـەڵ هێنجـانی زانینی پەیوەندی هـەردوو بوونەکـە (بـوونی هـەموو بونـەوەرو بـوونی مرۆڤایـەتی) بوونی تەواوی حەق.. بوونی خوای پەروەردگار.. پاشـان بیروهۆشـی بەرامبـەر ژیـان لی‌وەربگـرین.. خووڕەوشـتی لی‌وەربگـرین.. پاشـان حـوکمی خۆمـان‌و پرۆگرامـی سیاسی‌و ئابووری‌و هەموو بنەماکانی ژیانی لی‌وەربگرین..

قابیل نیـە هـەردەبێت بگەڕێینـەوە سـەری.. کاتێـك دەگەڕێینـەوە بـۆ قورئـان بەهەستی وەرگرتن بۆ کـارپێکردن‌و تطبیـق کـردن نـەك بەهەسـتی چاوپیاخشـاندن‌و موتاڵاکردن. دەبێت بگەڕێینەوە بۆلای‌و بزانین داوای چیمان لێدەکات‌و، دەیەوێ چـۆن بین‌و چۆن نەبین، تا بەو شێوەیە بین کە ئەو دەیەوێت.. جا ئەوسا لەرێگاماندا دەگەین بەهەوارگەی جوانی هونەری قورئان، وچیرۆکە خۆشەکانی قورئان‌و، دیمەنـەکانی ڕۆژی قیامەت لە قورئان و، ماقوڵی‌و پـاکی ویـژدان لـە قورئـان و.. هەرچـییەکی تـریش لەوەی کە لێکۆڵەرەوەکان بۆی دەگەڕێن‌و، عەوداڵن لەدووی..

ئێمەن لەرێماندا بەمانە هەمووی دەگەین، بێ‌ئەوەی هیچ کاتێك یـەکێك لەمانـە مەبەستی سەرەکیمان بووبن. چونکە یەکەم مەبەستمان ئەوەیە بـزانین، چـۆن قورئـان دەیەوێ ئێمەش وا رەفتارو گوفتار بکەین. ئەو بیروهۆشـە گشـتییە چیە، کـە ئـەو دەیەوێ لەمێشـکماندا بچەسـپێت؟ چـۆن خورەوشـت‌و بـاروزروف‌و ڕژێمـی واقیعـی ژیانمانی دەوێت ؟.

پاشان قابیل نیە هـەردەبێت خۆمـان لـە پاڵەپەسـتۆی کۆمەڵگـەی جـاهیلی‌و بیروهۆشی جاهیلی‌و، خوونەریتی جاهیلی‌و، سەرکردایەتی جـاهیلی قوتـار بکـەین..

بەتایبەتی لەدڵو دەروناندا.. خۆ گونجاندن لەگەڵ واقیعی ئەم كۆمەڵگە جاهیلییەتانەدا ئیشی ئێمە نیە، ملكەچ كردنو گوێڕایەڵی كردنی ئیشی ئێمە نیە.

هەتا ئەو كۆمەڵگانە ئەو سیفەتە جاهیلییەتانەیان تێدا بێت ئەستەمە ئێمە بتوانین لەگەڵی ڕێك بكەون، یان لەگەڵیدا بكەوینە ڕێ.. كاری سەرەكی ئێمە، بەدەرەجەی یەكەم، ئەوەیە كە خۆمان بگۆڕین، تا بتوانین كۆمەڵگەكەش بگۆڕین.

كەوابوو كاری سەرەكی ئێمە گۆڕینی واقیعی ئەو كۆمەڵگەیەیە. كاری هەرە سەرەكیمان گۆرینی ئەو جاهیلیتەیە.. لەبناغەوە. گۆڕینی ئەو واقیعە.. كە هەر لەیەكەم بەردی بناغەیەوە لەگەڵ پرۆگرامی ئیسلامیو، بیروهۆش ئیسلامیدا دژی یەك دەوستن.. ئەو واقیعەش بەزۆری زۆرداری هەوڵ دەدات كە نەهێڵێ ئێمە بەو شێوەیە بژین كە پرۆگرامەكەی خوا دەیەوێت.. یەكەم هەنگاوی ڕێگاكەمان بریتیە لەخۆ بە بەرزگرتنی خۆمانو خۆ مەزنتر زانینمان بەرامبەر كۆمەڵگەی جاهیلی، خۆیو خووڕەوشتو بیروهۆشی.. نابێت بە هیچ شێوەیەك لە خووڕەوشتو بیروهۆشی خۆمان كەم بكەینەوە.. نەكەم ونە زۆر ـ بەو هیوایەی بەڵكو لە نیوەڕێدا لەگەڵ جاهیلییەتدا یەك بگرینەوە!! — نا..

نەخێر ئێمە ئەو نین.. ئێمەو ئەو لە دوو ڕێیانێكداین.. ئەگەر یەك هەنگاو لەگەڵیدا بكەوینە ڕێ، پرۆگرامەكەی خۆمان وون دەكەین، ڕێبازەكەی خۆمان بزر دەكەین سەرنجامیش دۆڕاندنو زەرەرمەندی ئێمەیە.

لەم هەڵوێستە ڕەقەشماندا ناسۆرو ناڕەحەتی زۆرمان دێتەرێ. قوربانی زۆریش دەدەین.. بەڵام ئێمە ئەگەر بمانەوێت ڕێبازی نەوەی یەكەم بگرینەبەر ـ كەخوا خۆی پرۆگرامەكەی خۆی بۆ دارشتنو بەسەر پرۆگرامی جاهیلیدا سەری خستن ـ ئێمە ناچارین.. چونكە لەم كارەماندا سەرپشك (مخير) نین شتێكی زۆر بەرزو بەجێیە، كە هەموو كاتێك: سروشتی پرۆگرامەكانو سروشتی هەڵوێست وسروشتی ڕێگاكەمانمان لەبەرچاو بێت.. دەبێت باش بزانین كە مادام دەمانەوێت لەو جاهیلییەتە دەرچین، دەبێت ئەو سێ سروشتەمان لەبەرچاو بێت، كە ئەو نەوە دەگمەنە بێوێنە قورئانییەی یەكەمجار لەبەر چاویان بوو.

# سروشتی پرۆگرامی قورئانی

قورئانی پیرۆز بەردەوام تا سیانزە ساڵی ڕەبەق لە مەککە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهاتە خوارەوە هەموو ئایەتەکانیش دەربارەی یەك کێشەدەدوان.. یەك کێشەی نەگۆڕ. بەڵام شێوەی پێشچاوخستنی، گەلێ جار دووپات دەبووەوە. چونکە شێوازی قورئانی جار بۆ جار لەهەر پیشاندانێکدا، شتێکی نوێ وەدەردەخات. هەتا جاری وا هەیە وا دێتە بەرچاو کە بۆ یەکەمین جارە باسی لێوە دەکرێت.

ئەو ئایەتە مەککییانە چارەسەری یەکەمین کێشەیان دەکرد. کێشەی هەرەگەورەی ئایین. یەکەمین کێشەی سەرەکی ئەم ئایینە نوێیە. کێشەی عەقیدە (باوەڕهێنان)، کە مەسەلەی خاوەنێتیو پەروەردگاریێتی (الربوبیة) لەلایەكو خوایەتی (پەرستن)ی خوا لەلایەکی تر. هەروەها ئەو پەیوەندیانەیە کە لەنێوان هەردووکیاندا هەیە، کە لەرێسا سەرەکییەکانی ئەو کێشەیەدا دەردەکەوێت ئا بەم ڕاستییەش لەگەڵ (مرۆڤ)دا دەدوا.. مرۆڤ بەو سیفەتەی مرۆڤە.. چونکە مرۆڤێکی عەرەبی ئەو سەردەمەو مرۆڤی عەرەبی هەموو سەردەمێك چوون یەکن. هەروەك کە مرۆڤێکی عەرەبیو مرۆڤی تر چوون یەکن لەو سەردەمەو لە هەموو سەردەمێکی تردا.

ئەویش کێشەی نەگۆڕاوی (مرۆڤ)ە کێشەی پەیوەندی مرۆڤ بەم گەردونەوەو، بەو زیندەوەرانەی لەگەڵیاندا دەژیو،کێشەی پەیوەندی مرۆڤ وکردگاری ئەم گەردوونەو کردگاری ئەم زیندەوەرانە. کە ئەمەش کێشەیەکی نەگۆڕە. چونکە کێشەی بوونو مرۆڤە.

ئەو قورئانە مەککییە نهێنی بوونی مرۆڤ و بوونی ئەو گەردونەی دەوروبەری بۆ مرۆڤ لێك دەدایەوە.. پێی دەووت کە مرۆڤ کێیە؟

لەکوێوە هاتووەو؟

بۆچی هاتووەو؟

لەکۆتایی گەشتی بوونیدا بۆ کوێ دەچێت؟

کێ لە جیهانی نەبووی وون بووەوە هێناویتییە جیهانی بونەوە؟

کێ ئەو گەشتەی پێ دەکات؟

چارەنووسی ئەو لای چۆنە؟

هەروەها پێی دەووت ئەو بوونەوەرەی ئەم دەبینێتو هەستی پێ دەکات چیە؟

کێ ئەم بونەوەرە پڕ نهێنیەی دروست کردووە؟

کێ سەرپەرشتی دەکات؟ کێ هەڵسوڕێنەرێتی؟

کێیە وا شتی لێ نوێ دەکاتەوەو بەو شێوە هەست پێکراوە دەیگۆڕێت؟

هەروەها پێی دەووت کە چۆن لەگەڵ کردگاری بوونەوەرو گەردونو لەگەڵ گەردون خۆیدا ڕەفتار لەگەڵ مرۆڤدا بکات؟

ئەمەش ئەو کێشە گەورەیە، کە بوونی (مرۆڤ)ی لەسەر دادەمەزرێت. کەهەر بە گەورەیش دەمینێتەوە. هەر ئەوش بەدرێژایی مێژووو، بەدووهاتنی زەماندا، بوونی مرۆڤی لەسەر دادەمەزرێت.

بەم شێوەیە سیانزە ساڵی تەواو تێپەڕی لەپێناوی چاسپاندنی بریاردانی ئەم کێشە گەورەیە. ئەو کێشەیەی کە هیچ شتێکی تر نیە لەژیانی مرۆڤدا لەسەری دانەمەزرێت، هەرچەند لقو پۆپیشی لێ جوێ بێتەوە.

قورئانی مەککی لەباس کردنی ئەم کێشە سەرەکییە بۆ هیچ لقێکی تر لای نەدا، کە لەسەر ئەم کێشەیە دادەمەزرێت وەك سیستمی ژیان. هەتا ئەو ساتەی خوای گەورە زانی کە ئەم کێشەیە باسی تەواوی لێوە کراوەو، لەنێو دڵی ئەو کۆمەڵە هەڵبژێرراوەی مرۆڤدا بەتەواوی جێگیربووە، ئەو کۆمەڵەی کەخوا وویستی وابوو ئەو ئایینەیان پێ دابمەزرێنێت. تا دوایی ئەو کۆمەڵەش خۆی رژێمێکی واقیعی بۆ خۆی دابڕێژێت کە ئەم ئایینەی تێدا دەردەکەوێت.

داعبیەکان.. (ئەوانەی کادێری ئەم بانگەوازەی ئیسلامبیە خوایی یەن).. ئەوانەی خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دامەزراندنی ئەو سیستمەی کە ئەم ئایینەی

لـەواقیعی ژیانـدا تیـدا دیتـەدی، پێویسـتە ماوەیـەکی زۆر لەبـەردەم ئـەم دیـاردە گەورەیەدا بۆ سەرنجدان بووەستن: دیاردەی هەوڵدانی سیانزە ساڵەی قورئانی مـەککی لەپێناوی بڕیاردانی ئەو عەقیدەیە. چونکە قورئان لەو ماوە زۆرەدا لە باسی عەقیـدە لای نەدایە سەر بابەتـەکانی تـری وەك چـۆنیەتی ئـەو سیسـتمەی کـە لەسـەر ئـەم عەقیدەیە دابین دەبێت. یان بۆ ئەو یاسـایانەی حـوکمی ئـەو کۆمەڵگـە ئیسـلامییە دەکەن کە ئەو عەقیدە ئایینیەیان وەرگرتووە.

وویستو ئیرادەی خوا وابوو کـە یەکـەمین کێشـەیەك ئـەو بانگـەوازە لەسـەرتای پەیامەکەیدا تووشی دێت، کێشەی عەقیدە بێت.. باوەڕهێنـان. وەدەبێـت یەکـەمین هەنگاوی دەستپێکردنی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بێت کە خەڵکی بانگ بکات بۆ (لا الە الا اللە). وەدەبێـت بـەردەوام لـە بانگەوازەکەیـدا خـوای راسـتەقینە بـەو خەڵکـە بناسێنێت و، وایان لـێ بکات تەنها ئەو بپەرستن..

ئەم ڕێگایەش ـ بەگوێرەی رواڵەتو لە سـەرنجی ژیریانـەی مرۆڤـدا ـ وەنـەبێت ئاسانترین شێوە بووبێت بۆ چوونە نێو دڵی عەرەبەکان! چونکە خۆیـان (عـەرەبـەکان) دەیانزانی لە زمانەوانی خۆیاندا (إلە) مانـای چـیە؟ و(لا الـە الا اللە)، چ مانایـەك دەبەخشـێت.. دەیـانزانی کـە خوایـەتی بریتیـە لـە بڵنـدترین دەسـەڵاتداریتی.. وە دەیانزانی کە (تەنها خوایەتی خوا) ئـەوە دەگەیـەنێت: کـە هەرچـی دەسـەڵاتداریتی قەشەو پیاوی ئایینیو سەرکردەی هۆزو میرو کاربەدەستان هەیە، دەبێـت نـەمێنن و، ئەو دەسەڵاتداریتی یانە بگێڕرێنەوە بۆ خـوا. هـەموو جـۆرە دەسـەڵاتداریتی یـەك: دەسەڵاتداریتی بەسەر ویژداندا، دەسەڵاتداریتی بەسـەر هـەڵس وکـەوتی پەرسـتندا، دەسـەڵاتداریتی بەسـەر واقیعـی ژیانـدا دەسـەڵاتداریتی سـامان، دەسـەڵاتداریتی فەرمانڕەوایی، دەسـەڵاتداریتی بەسـەر لـەش وگیانـدا.. دەیـانزانی (لا الـە الا اللە) شوڕشێکە بەسەر دەسەڵاتداریتی سەرزەویدا، کەیەکەمین سیفەتی خوایەتی بـۆ خـۆی پچڕیوە. هەروەها شۆڕشێکە بەسەر ئەو باروزروفەدا کە دەبێتە بنکەیەکی ئەو بۆ خۆ پچڕاندانە.. دەیانزانی (لا الە الا اللە) دەرچوونە لەژێر ئەو دەسەڵاتداریتی یەی کە بە یاسای خۆی بەڕێوەدەچێت، کە لە خواوە مۆڵەتی پێـنـەدراوە.. وەنـەبێت بانگـەوازی

(لا اله الا الله) لە عەرەبەکان ـ کە زۆرباش شارەزای زمانەکەیان بوون ـ شاراوە بووبێت. بەڵکو دەیانزانی ئەو بانگەوازە چی دەگەێنێتو چ مەترسییەك دروست دەکات بەرامبەر باروزروفو سەرۆکایەتیو دەسەڵاتداریێتی خۆیان.. هەموو ئەمانەیان دەزانی، بۆیە بەو شێوە سەختە دژی وەستانو ئەو شەڕەیان لەگەڵیدا کرد، کە ووردو درشت، زاناونەزان دەیزانێت..

جا کەوابوو دەبێت بۆچی یەکەمین هەنگاوی ئەو بانگەوازە بەو شێوەیە بووبێت؟ دەبێت مەبەستی وویستو ئیرادەی خوایی لەو دەستپێکردنە سەختەدا چ بووبێت؟

## بانگەوازی ئاشـکراو ڕەسـەن

ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ بەم ئایینەوە نێررا بەپیتترین‌و دەوڵەمەنـدترین پارچـە زەوی خاکی وولاّتی عەرەبی لە دەست عەرەبەکاندا نەبوو. بـەڵکو لـەژێر دەسـەلاّتی گەل‌و نەتەوەی تردا بوو..

لەسەرەوە: هەموو وولاّتانی شام ملکەچی رۆمەکان بوون. ئەو مـیرە عەرەبانـەش کە حوکمیان دەکردن، لەلایەن رۆمەکانەوە دانرابوون. لە خوارەوەش: یەمەن ملکەچی فارسەکان بوو، میرێکی عەرەب حوکمی دەکرد کە لەلایـەن فارسـەکانەوە دانرابـوو. هەموو ئەوەی لەدەست عەرەبەکاندا مابوو حیجازو توهامەو نەجدبوو، کە هـەمووی بیابانی ووشك بوو، مەگەر جارجارە لێرەو لەوێ مێرگێکی تەڕو بەفـەڕی لـێ هـەڵ بکەوتایە!

# ئالاّی نەتەوایەتی .. نا

ڕەنگە بوترێت: محمد ﷺ کە ئەو پیاوە ڕاستگۆو دەست پاکەبوو کە پیاو ماقوڵانی قورەیش کردیان بە حەکەم لە مەسەلەی دانانەوەی بەردەڕەشی کەعبەداو بەحوکمەکەشی ڕازی بوون ـ کە ئەم مەسەلەیەش پێش پانزە ساڵ لە دەرکەوتنی بانگەوازی پەیامەکەدا بوو ـ هەروەها محمد ﷺ لەتیرەی بەنی هاشم بوو کە بەرزترین و بەڕێزترین تیرەی قورەیش بوو. دەیتوانی بانگەوازێکی نەتەوایەتی عەرەبی کە هیوای کۆکردنەوەو یەکخستنی تیرە عەرەبەکان بوایە، کە ناکۆکیو دووبەرەکیو ڕەگی لەدڵو دەروونیاندا داکوتابوو، دوای ئەوە بەشێوەیەکی نەتەوایەتی هەوڵی بدایە ئەو پارچە زەوی یە داگیرکراوانەی لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی یەتە داگیرکەرەکاندا ڕزگار بکات.. ڕۆمەکان لەباکورو فارسەکان لە باشور، ئەوکاتە ئالاّی (عروبە)ی بەرز بکردایەتەوەو، یەکێتی نەتەوەیی عەرەبی لە هەموو سەرزەمینی نێوەدۆرگەدا دابمەزراندایە.

لەوانەیە بووترێت: ئەگەر محمد ﷺ بانگەوازێکی وای بلاّوبکردایەتەوە هەموو عەرەب وەدەنگیەوە دەهاتن، نەدەبوو بەو شێوەیە دەست پێ‌بکات کە دەستی پێکرد. کە بریتی بوو لە سیانزە ساڵ تێکۆشان بەپێچەوانەی ئارەزوی خاوەن دەسەلاّتەکانی نیودوورگەوە. وە لەوانەشە بووترێت: محمد ﷺ لەتوانایدا بوو دوای ئەوەی عەرەب بەدەنگیەوە دەهاتنو، پاش ئەوەی سەرکردایەتی لەنێوانیاندا دادەمەزراند. وهەموو لایەکی دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، ملکەچییان بۆ دەردەبڕی، ئەوکاتەی ئاسانتر بوو بۆ بلاّوکردنەوەی ئەو عەقیدەی خوا بەیەکناسینەی پیایدا نێررا بوو.. نەك بەو شێوەی دەستی پێکرد...

بەلاّم خوای پەروەردگار ـ کە خۆی زانایەو ئیش لەجێی خۆیدا دەکات ئەم شێوە تەوجیهەی ئاڕاستەی محمد ﷺ نەکرد بەڵکو وای ئاڕاست کرد کە بەو (لا الە الا

الله)یە دەست پێبکات با خۆشیو ئەو کۆمەڵە کەمەشی کە بەدەنگیەوە دێـن، ئـەو هەموو ناسۆرو نارەحەتییەش بچێژن!!

بۆچی؟ خۆ خوا نایەوێت پێغەمبەرەکـەیو موسـڵمانان بـێهودە تووشـی ئـازارو ئەشکەنجە بکات. چونکە خوا خۆی دەزانێت کە ئەو جۆرە رێگایەی پێشـوو (رێبـازی نەتەوایەتی) رێگای ئـەم بانگـەوازە نیـە. ئـەوە رێبـاز نیـە زەوی لـەژێر دەسـەڵاتی زۆرداری طـاغوتی رۆمانی یان دەسـەڵاتی زۆرداری طـاغوتی فارسـی رزگاربکـاتو، پاشان بیخاتە ژێر دەسەڵاتی زۆرداری طاغوتێکی عەرەبییـەوە، زۆردار هـەرزۆردارە. زەمینیش هی خوایەو تەنها دەبێت بۆ ئەویش رزگار بکرێـت. تـا ئـاڵای (لا الـە الا الله)ش لە جێیەکدا نەشـکێتەوەو، مانـای وایـە ئـەو جێیـە هێشـتا رزگارنـەکراوە. خەڵکیش کە تەنها بەندەی خوان بە بەندەی خوا ناژمێررێن تا ئاڵای (لا الـە الا الله) بەرزنەکەنەوە.

(لا اله الا الله) بەو مانایەی کە عەرەبێکی زمانەوانی شارەزای زمـانی عـەرەبی تێی دەگات: کە هیچ دەسەڵاتدارێتییەك نیە جگە لە دەسەڵاتدارێتی خوا. هیچ یاساو شەریعەتێك نیە جگە لەیاساو شەریعەتەکەی خوا. چونکە ئەو رەگەزنامە (جنسیە)ی ئیسلام بۆ خەڵکی دەوێت، رەگەزنامەی عەقیدەیە. کـە عـەرەبو رۆمـانیو فـارس هەموو ڕەگەزو ڕەنگێك، لەژێر ئاڵاکەیدا ـ ئاڵای (لا اله الا الله) ـ یەکسان دەکـات. تەنها ئەوەشە رێگای هێنانەوەی ئیسلام.

# ئالاّی ئابووریء کۆمەلاّیەتی .. نا

کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەم ئاینەوە نێررا، کۆمەڵگەی عەرەب لە پیسترینو خراپترین باروزروفی کۆمەلاّیەتیو ئابوریدابوون. بەشکردنی سامانو دارایيو کۆمەلاّیەتی لەوپەڕی نارەواییدا بوو.. دەستەیەکی کەم بازرگانیو سامانی گرتبووە دەستو، سەوداو مامەڵەی سوو (ربا)ی گەرم کردبووو، دە قات قازانجی بازرگانی سامانەکەی دەویست. لەو لاوەش زۆربەی زۆری کۆمەڵگەکە لە کولەمەرگیو برسێتیدا بوون. ئەوانەی سامانو دارایی یان هەبوو، پلەوپایەو رێزی نێو کۆمەڵگەکەشیان هەبوو. جەماوەرێکی وون بووی زۆریش لەدوا پلەی چینی بێدەرامەتە بێڕێزەکاندا بوون.

لەوانەیە بووترێت: محمد ﷺ ئەگەر بانگەوازەکەی بە هەڵکردنی ئالاّی کۆمەلاّیەتیو ئابوری دەست پێبکردایەو، ناکۆکی بەرامبەر چینە خاوەن رێزەکان بەرپا بکردایەو وای ئاشکرا بکردایە کە داوای چاك کردنی باروزروفی کۆمەلاّیەتی ئابوری خەڵکەکە دەکاتو دەیەوێت سامانی هەژارەکان بگەڕێنێتەوە بۆیان.

لەوانەیە بووترێت: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتەی ئەم جۆرە بانگەوازەی بەنێو خەڵکیدا بلاّودەکردەوە، کۆمەڵگەکە دەبوون بەدوو بەشەوە: بەشە زۆرە چەوساوەکەی لەگەڵ بانگەوازی نوێدا دەبوو، بەرامبەر ستەمکاری سامانو ڕێزو پلەو پایەدارەکانی دەوەستان. تەنها بەشە کەمەکە دەمایەوە لەنێونەریتە کۆنەکانی خۆیدا. ئەگەر محمد ﷺ بانگەوازێکی وای بلاّوبکردایەتەوە چاکتر بوو. نەك هەموو کۆمەڵگە یەك بگرنو بەرامبەر (لا الە الا اللّە) بوەستن.. ئەوکاتەش ئەوەی دەهاتە ریزی باوەڕدارانو قەناعەتی بە (لا الە الا اللّە) دەکرد، ئاوا دەستەیەکی کەم نەدەبوون.

وە لەوانەیە بووترێت: محمد ﷺ دوای ئەوەی ئەو بەشە زۆرە بەدەنگیەوە دەهاتن، دەبووە سەرکردەیانو دەیتوانی بەئاسانی دەسەلاّتدارێتی سەرکردایەتییەکەیو

تێکۆشانو خەباتی خۆی تەرخان بکردایە بۆ دامەزراندنی عەقیدەی خـوا بەیەکناسـین کە خوا پیایدا ناردبووی. ئەوکاتەش وای لـێ دەکردن کە مەبەسـتی پەرسـتنەکانیان تەنها خوا بێت.

بەڵام خوای پەروەردگار ـ کە خـۆی ئاگـادارو شـارەزایە ـ ئـەم جـۆرە تەوجیهـەی پێغەمبەری نەکرد.. خوای گەورە دەیزانی ئەمە ڕێگـای ئـەم بانگـەوازە خـوایی یـە نیە.. دەیزانی کە دەبێت دادی کۆمـەلایـەتی لـە بیروهـۆشو عەقیـدەی کۆمـەڵگـەوە هەڵقوڵێت، تا هەموو کارێك بۆ خوا بگەڕێتەوە. تا خەڵکی بەرەزامەندی خۆیان ئـەو جۆرە دابەشکردنە دادپەروەریو خـوایی یـە وەربگـرن.. تـا لـەدڵی وەرگـرو بـدەردا بچەسپێت. تا مەسەلەی ئەم دابەشکردنە بزانرێت کە لەلایەن خواوەیـەو، یاسـایەکی دیـاریکراوی نـەگۆرە. بـۆ ئـەوەی کۆمەڵگەکـە هـەمووی هـەوڵی چـاکەخوازیو خێرەومەندی دنیاو قیامەت بدات. نەك دڵی ئەندامەکانی ـ تاکەکانی کۆمەڵگەکە ـ تەماعکاری داپیۆشێتو حەسوودی چـاویان نابینـا بکـات، تـا هـەموو شـتێك بـە هێمنیو ڕەزامەندی بڕوات نەك بە شـیرو کوتەكو تۆقاندن. نەبادا دڵ پیس ببێـتو، ڕۆح بخنکێنرێت. وەك ئەو شێوانەی ڕوودەدەن لەو باروزروفانەدا کە ئیسـلامیان لـێ دوورە.

## ئـالاٌی خـووســازی .. نا

کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەم ئایینەوە نێررا: ئاستی خوڕەوشت لە نێوەدورگەدا، لە هەموو لایەنێکەوە لە پلەی هەرە ژێرەوەدا بۆگەنی دەهات. ئەگەرچی شان بەشانی ئەویش سیفەتی پیاوانەو ماقوڵ لەناو خێڵەکی یە دەشتی یەکاندا مابوو.

ستەم باڵی بەسەر هەموو کۆمەڵگەکەدا کێشابوو. باشترین ئاوێنەی ئەوەش ئەو شیعرەی (زوهەیری کوڕی ئەبو سولمەیە) کە دەڵێت:

وَمَن لَم يَذُدْ عَن حوضهِ بسلاحهِ

يُهدَم، ومَن لَم يُظلم الناسَ يُظلَم

هەرکەس بەچەکی خۆی بەرگری لەخۆیو هۆزەکەی نەکات تێك دەشکێنرێت، هەرکەسیش ستەم لەخەڵکی نەکات، ستەمی لێ دەکرێت.

یان پەندە بە ناوبانگەکەی ئەو کاتەی عەرەب، کەوێنەی ئەو کۆمەڵگەیە پیشان دەدات: ((**انصرْ أخاكَ ظالِماً أو مَظلوماً** = براکەت سەرخە، ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو)).

خواردنەوەو قوماریش لە نەریتە بلاٌوەکانی کۆمەڵگەبوونو، شانازیان پێوە دەکرا. بۆ ئەمەش هەموو شیعری جاهیلی شاهیدە. وەك (طەرەفەی کوڕی عەبد) دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ومازالَ تَشرابآ الخمورُ ولَذَّتي | وبَذلي وإنفاقي طريقي وتالِدي |
| الى أنْ تحامَتْني العشيرةُ كلُّها | وأفرَدْتُ إفرادَ البَعيرِ المعَّبدِ |
| فلولا ثلاثٌ هُنَّ من عيشةِ الفَتى | وَجدِّكَ لَمْ احفَلْ متى قامَ عَوّدي |

فَمِنهُنَّ سَبقي العـاذِلاتُ بِشُـربَةٍ كَمِيـت، متـى ماتَعـلُ بالمـاء تَزْبَـدِ". (١)

هەتا ئێستاش زۆر خواردنەوە لەزەت کردنو مامەڵەی مەیم بەردەوامە، چونکە ڕێبازی کۆنی بابو باپیرانمە لەگەڵماندا لەدایك بووە. ئەوەندەم دەخواردەوە، تا وامەست دەبووم هۆزو کەسوکارم هەموو وازیان لێدەهێنامو، وەك ووشتری بێ لغاوی بەرەڵا تەنها دەکەوتم. ئەگەر ئەو سێیە نەبووایە بە کەرەستەی ڕابواردنی گەنج، بەگیانی تۆ گوێم بەوانەش نەدەدا کە لەسەرەمەرگدا دەهاتنە لام. یەکێك لەو سێیەش ئافرەتێکی ساقی (مەیگێڕ)ە، کە پێکێکی وا ڕەشت بۆتێکا تا ئاوی تێکەی زیاتر کەف بکات.

دیارترین هێمای ئەو کۆمەڵگەیە: داوێن پیسیو بەدخوویی بوو ـ بە هەموو جۆرەکانیەوە ـ وەکو کە هێمای هەموو کۆمەڵگەیەکی تری جاهیلین. تەنانەت مارەکردنیش ـ وەکو خاتوو عائیشە خانی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە ـ بەم شێوەیە بوو:

"مارەکردن لە سەردەمی جاهیلیدا، چوار شێوەی هەبوو: یەك لەوانە ئەو شێوە مارەکردنەی ئێستایە کە لەنێو خەڵکیدا باوە (پیاوێك داخوازی کچی یەکێکی دەکردو پاشان مارەدەکرا).

جۆرێکی تر وابوو کە (مێردێك بەژنەکەی خۆی دەووت دوای لە حەیز پاك دەبووەوە ـ بچۆرە لای فلان کەسو سەر جێیی لەگەڵ بکە ـ ئەمەش لەبەرئەوەی بەڵکو منداڵێکی نەجیبزادەی ببێت ئەمە مارەیی (استبضاع)ی پێ دەوترا).. جۆرێکی تر (چەند پیاوێك ـ ژمارەیان لە ١-٩ کەس ـ یەك لەدوای یەك سەر جێی یان لەگەڵ ئافرەتێك دەکرد. ئەوجا سکی پڕدەبوو، پاشان کە منداڵەکەی دەبووو،

---

**(١) لە نوسخە عەرەبییەکەدا (لە سێ چاپکردنەوەی جیاوازدا) دێری(٣-٤) لەجێی دێری (١-٢) نوسرابوونەوە، لەبەرئەوەی لە سەرچاوەکانی شیعرەکەدا بەوشێوەیە بوون کە لەسەرەوە نووسیومانەتەوە، وامان بەباشزانی وەك سەرچاوەکان بیاننوسینەوە. شرحی زوزنیو، شرحی تبریزیو ابوجعفر نحاس..هتد. (م. کرێکار).**

چەند شەوێکی بەسەردا دەڕۆیشت ئافرەتەکە دەینارد بە دووی پیاوەکاندا ـ هیچ کەسێکیشیان بۆی نەبوو نەیەت، یان بەرهەڵستی بکات ـ تا هەموویان کۆدەبوونەوە لە ئافرەتەکە. ئینجا پێی دەوتن: وا ئەم منداڵە لەدایك بوو، و لە ئێوەیە.ـ فلان کەس ئەم منداڵە لە تۆیە ـ ناوی یەکێکیانی دەبردو منداڵەکەی دەدایە. ئیتر دەبووە منداڵی ئەو کەسە. ئەویش نەیدەتوانی حاشای لێبکات یان وەری نەگرێت.

جۆری چوارەمیان (کۆمەڵێك پیاو کۆدەبوونەوەو، دەچوونە لای ئافرەتێكو، سەرجێی یان لەگەڵ دەکرد. ئافرەتەکەش بەرهەڵستی کەسیانی نەدەکرد. ئەم جۆرە ئافرەتانەش داوێن پیسەکان بوون، کە ئاڵایەکیان لەسەر ماڵەکانیان دەچەقاند تا بناسرێنەوە. هەر پیاوێك ئارەزووی بوایە دەچووەلایان.. منداڵەکەش کە لەدایك دەبوو، بەڕواڵەت لە هەر پیاوێك بچوایە دەیاندا بەو کەسەو، ئەویش وەری دەگرتو، دەیکردە کوڕ (یان کچ)ی خۆی"[١].

لەوانەیە بووترێت: محمد ﷺ دەیبینی کە دەرون هەن، ئەم بانگەوازە وەربگرن - وەکو کە هەموو چاکەخوازێك لەهەر جێیەك بووبێت تووشی ئەو جۆرە دەرونانە دەبوون دەرونی وای تووش دەبوو کە بێز لەداوێن پیسیو خراپەکاریو بەدخوویی بکەنەوەو، دڵیان بەو بانگەوازە چاکەخوازییەی ئەو خۆش بێت.

لەوانەشە یەکێکی تر بڵێت: "ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وای بکردایە، لەوانەبوو لە یەکەمجاردا گەلێك پیاوچاك وەدەنگیەوە دەهاتنو، ئەوەندەی تر خووڕەوشتیان پاك دەکردەوە ـ ئەوکاتەش، ئەوانە زۆر نزیکتر دەبوون لەو عەقیدەیەی ئەم ئاڵای بانگەوازەکەی بەرزکردبووەوە. واچاکتر دەبوو لەوەی بانگەوازی (لا الە الا اللە) بڵاوبکاتەوە. چونکە ئەو هەموو بەرهەڵستییە بەهێزەی سەرەتای ڕێگاوە، تووشی نەدەبوو.

بەڵام خوای مەزن دەیزانی کە ئەوە ڕێگای ئەم ئایینە نیە دەیزانی کە خوڕەوشت لەسەر بناغەی ئەو عەقیدەیە نەبێت دانامەزرێت. ئەو عەقیدەیەی کە هەموو جۆرە

---

١) ئیمامی بوخاری لە (کتاب النکاح)ی صەحیحەکەی خۆیدا گێڕاویێتیەوە.

خووڕەوشتێك بە هاوسەنگی دەبات بەڕێوەو، بڕیاری دەسەڵاتدارییە کە پاداشتو سزا بۆ ئەو کەسانە دیاری بکات کە پەیڕەوی یان سەرپێچی بیروباوەڕەکەی دەکەن. ئەگینا پێش دیاریکردنی ئەم عەقیدەیەو، دیاریکردنی ئەو دەسەڵاتدارێتییە، هەموو خووڕەوشتێك شلۆق دەمایەوە. ئەو ساتەش نەپاداشت نەسزا، نەدەسەڵات، هیچ رێکخەرێکی نەدەبوو.

پاش رەنجدانێکی زۆر، کاتێك عەقیدەی ئیسلامی بڕیاریدا کە دەبێت دەسەڵاتێك بگرێتە دەست، کە ئەم عەقیدەیە پشتی پێ ببەستێت. کاتێك خەڵکی خوای خۆیان ناسی، وهەر ئەویشیان پەرست. کاتێك خەڵکی لە کۆتی کۆیلەیی‌و هەواو هەوەس ئازادبوون. کاتێك (لا الە الا اللە) لەدڵدا جێگیر بوو.. خوا بەو عەقیدەیەو بەهەڵگرانی ئەو پەیامە هەموو ئەوەی هێنایەدی کە خەڵکی پێشنیاری دەکەن.. ئەوجا سەرزەمین لەرۆمانو فارس پاك کرایەوە.. بەڵام نەك بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی (عەرەبی) بهێنێتە کایەوە.. نا.. بەڵکو بۆ ئەوەی دەسەڵاتدارێتی خوا دابین ببێت. (سەرزەمین لەژێر دەسەڵاتدارێتی) (طاغوت) پاك کرایەوە.. لە هەموو جۆرە طاغوتێك رۆمانی بێت یان فارسی وەیان عەرەبی، چونکە ئەوانە هەموو یەك ناوەرۆکیان هەیە..).

ئەوکاتە کۆمەڵگە لەهەموو جۆرە ستەمێکی کۆمەڵایەتی پاك بووەوەو.. (رژێمی ئیسلامی) کە لەبەر رۆشنایی دادپەروەرێتی خوایی دارێژراوە، دامەزرا.. وە بەترازوو پێوەرێکی خوایی بەڕێوەدەچوو.. ئاڵای دادی کۆمەڵایەتی تەنها بەناوی خواوە هەڵکرا بۆیە ئەوجا ناوی لێنرا ئاڵای (ئیسلام).. وەنەبێت هیچ ناوێکی تری لەتەنیشتەوە نووسرابێت، یان جۆرە لافیتەیەکی تر شان بەشانی (لا الە الا اللە) هەڵواسرابێت.

هەروەها خووڕەوشتو دڵو دەرونو رۆحی پاك کردەوە، بێئەوەی پەنا بەرێتە بەر بەکارهێنانی ئەو (حەدد)[1] انەی خۆی بۆ سزا دانابوون، مەگەر لەکاتێکی زۆر کە

---

**١) حەد: دەستوری سزادانە ئیسلامییەکان. وەك ڕەجم، جەلدە (قامچی) لێدان، دورخستنەوە.. هتد.**

مــڕوداودا. چــونکە چــاودێریکردن لــە زەمــیرو ویژدانــدا دروســت بووبــوو هــەروەها شەیدابوونی رەزامەندی خواو حــەز لەپاداشــتی خــواییکردنو، شــەرمو تــرس لــە رق هەستانی خوا، جێگای چاودێریکردنو سزاکانی گرتبووەوە.

# ســەرکـەوتـن

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەم شێوەیە بەرزبووەوە، لـە رژێمـدا، لـە خووڕەوشـتیدا، هەروەها لە هەموو لایەنێکی ژیانیدا بەرەو ئەو لوتکە بڵنـدە بەرزبووەوە کە هەرگیز نە پێش ئیسلامو نە لەدوای هاتنی ئیسـلام نەیگەیشـتبوویە، مەگـەر هـەر ئیسـلام خۆی.

ئەمانە هەمووی رویاندا. چونکە ئەوانەی ئەم ئایینەیان لەڕووی دەوڵـەتو رژێـمو ئەحکامــەوە هێنایــەدی، ئــەم ئایینــەیان لــەوەپێش لــە دڵو دەرونــی خۆیانــدا چەســپاندبوو.. لــە هـــەموو ژیانیانـــدا.. لـــە رووی عەقیـــدەو، خووڕەوشـــتو پەرستنەکانیانەوە. لەهەمان کاتدا ئەمانە پەیمانێکی گرنگیان پێدرابوو بەرامبەر بەو هەوڵەی کە دەیاندا بۆ هێنانەدی بوونو دامەزراندنی ئەم ئایینە.. پـەیمانێکی وا کـە خۆدەرخستنو دەسەڵات گرتنەدەسـت، زاڵ نـەبێت بەسـەریاندا. تەنانـەت هێنانـەدی ئیسـلامیش (بەدەسـتی خۆیـان) نەبێتـە مەبەسـتیان.. پـەیمانێکی وا کـە هـیچ مەبەستێکی دنیایی تێکەڵ نەبێت. ئەو پەیمانەش: بەهەشت بوو.. پەیمانێك بـوو کـە خوا پێیدابوون.. بەهەشت لە پاداشتی ئەو جیهادە بەردەوامـەیانو، لەپاداشـتی ئـەو نارەحەتییانەی دەهاتە رێیان، لە بەردەوامبوونی ئـەم بانگـەوازەداو، بەرامبـەر ئـەو خۆڕاگرتنە نەبەزانەیان لـەرووی جاهیلییەتـداو، بەرەنگاریکردنیشـی بـەو شـێوەیەی خاوەن دەسەڵاتە جاهیلییەکانی کۆنو نـوێ پێـی سـەغڵەت دەبـن. کـە بریتیـە لـە: بەرهەڵستی کردن بە لا الە الا اللە ..

کاتێك خوا تووشی نارەحەتی کردنو ئەوانیش ئارامگر بوون بەرامبـەری. کاتێـك دڵو دەرونیان لە چڵکی هەوڵدان بۆ خۆ، پاك بووەوە.. کاتێك خوای پەروەردگار زانی کە ئەمانە چاوەڕوانی هیچ پاداشتێکی دنیایی ناکـەن لـەم سەرزەمینەداــ لـە هـەر

جێگەیەکدا بێت. با ئەو پاداشتەش سەرکەوتنی بانگەوازەکەشیان بێت (بەدەستی خۆیان)، یان دامەزراندنی ئەم ئایینەش بێت لەسەرزەمین (بەرِەنجی خۆیانو لە تەمەنی خۆشیاندا).. وەکاتێك شانازیکردن بەبابو باپیرو تیرەو هۆزو بە کەسوکارو سەروەتو سامانەوە، هەروەها بەنیشتمانو زەوییەوە نەما.. دوای ئەوەی خوای گەورە ئەم شتانەی تێدا بەدیکردن.. زانی وایان لێهاتووە شایانی ئەوەبن ئەو پەیامە هەڵگرنو، ئەوەندە دەستپاك پەروەردە بوون، کە شایانی ئەوەن ئەم ئەمانەتەیان بدرێتە دەست.. دەسپاکی لەپاراستنی عەقیدە، ئەو عەقیدەیەی کە خوای پەروەردگار حوکمی دڵ ودەرون وخوورەوشت ودروشم وگیان وسامانیانی پێ دەکات، وەك کە حوکمی باروزروفو لایەنەکانی ژیانیانی پێ دەکات.. دەسپاکی لەو دەسەڵاتدارێتییەی دەدرێتە دەستیان، کە بریتیە لە: جێبەجێکردنی شەریعەتەکەی خوا.. دەسپاکی لە هێنانەدی دادپەروەریدا. بێئەوەی خۆیان دەسەڵاتێکی سەربەخۆیان هەبێت، تا بیخەنە ژێر خزمەتکردنی بەرژەوەندی خۆیان، یان ژێر خزمەتی گەل هۆزیان، یان خزمەتی نەوەکەیان. بەڵکو هەموو ئەو دەسەڵاتدارێتییەی دەکەوێتە دەستیان: دەبێت بۆ خوا بێت.. بۆ خزمەتی ئایینو ڕاپەراندنی شەریعەتەکەی بێت. چونکە ئەوان دەزانن کە دەسکەوتنی ئەم دەسەڵاتدارێتییە، بەهرە (نیعمەت)ێکی خوایی یەو، خوا خۆی پێی بەخشیون.

ئەگەر ئەو بانگەوازە لە سەرەتایەوە بەو شێوەیە دەستی پێ نەکردایە، یان لەژێر ئەو ئالآیەدا (ئالآی لا اله الا الله) نەبوایە. یان ئەگەر ئالآیەکی تری هەڵبکردایە.. ئەگەر ئەو بانگەوازە ئەو ڕێگا پڕ کەندو کۆسپو هەڵدێری نەگرتایەبەر (کەندو کۆسپو هەڵدێر، وەك کە مرۆڤ لە ڕواڵەتدا وا دەبینێت، کە لە حەقیقەتدا لە هەموو ڕێگایەك ئاسانتر بوو) مومکین نەدەبوو ئەم پرۆگرامە پیرۆزە، هیچ یەکێك لەو ئاستە بەرزە بهێنێتەدی کە بەو بانگەوازە هێنایەدی.

وە یان ئەگەر ئەو بانگەوازە، لە یەکەم هەنگاوییەوە بانگەوازێکی نەتەوایەتی، یان بانگەوازێکی کۆمەڵایەتییان بانگەوازێکی ڕەوشتی بوایە.. یان دروشمێکی تری

لەگـەڵ (لا اله الا الله)دا بـەرز بکردایەتـەوە. ئەوکاتـە مـومکین نـەدەبوو مەبەسـتی ڕەزامەندی خوا بێت، بەڵکو هەموو مەبەستەکانی دنیایی دەبوون. ئەوەبوو نەخشەی قورئانی مەککی لە چەسپاندنی (لا اله الا الله)دا لەدڵی خەڵکیـدا، ئەوەشـی بـۆ ئـەو ڕێگایەی کە گرتیەبەر ـ ئەگەرچی لە ڕواڵەتـدا پـڕە لـە کەنـدو کۆسـپو هەڵدێرـ وە سوریش بوو لەسەر ئەوەی لەو باسو ڕێگایە لانەدا بۆ هیچ ڕێگایەکی لاوەکـی (غـیر مباشر) کە ئاسانتر دێتە پێش چاو.

هەروەها مەسەلەی باسـکردنی قورئـانی مـەککی دەربـارەی کێشـەی عەقیـدەو شێوەی پێشچاو خستنیو باس نەکردنی جۆرو چۆنیەتی ئەو ڕژێمەی لەسـەر بناغـەی ئەو کێشەیە دروست دەبێت یان جۆری ئەو یاسایانەی حوکمی هەڵسوکەوتی خـەڵکی دەکات. ئەمەش مەسەلەیەکە پێویستە داعی ئیسـلامی هۆشـیارانە لەبـەر دەمیـدا بووەستێو سەرنجی بدەن.

ئەوەی وای پێویست دەکرد، سروشتی ئایینەکە بـوو. چـونکە ئیسـلام ئایینێکـە هەموو شتێکی لەسەر ڕێسای خـوا بـە یەکناسـین دادەمـەزرێنێت.. هـەموو یاسـاو دەستورێکی هەر لەو سەرچاوە گەورەیەوە هەڵـدەهێنجرێت.. وەك چـۆن درەختێکـی گەورەی بڵندی لقو گەڵا تێکچرژاوی بەسێبەر، کە پەلو پۆی بەرەو ئاسمـان هەڵچـوو بێت.. قابیل نیە هەردەبێت ڕەگێکی پتەوی هەبێت کە بەناخی زەویدا ڕۆچوو بێـتو، پانتایی یەکی زۆری گرتبێتەوە، کە لەگەڵ گەورەییو پانو پۆڕی خۆیـدا بگونجێـت.. ئەم ئایینەش هەر بەو شێوەیە.. ڕژێمی ئیسلامی هەموو بوارێکی ژیان دەگرێتەوەو، سەرپەرشتی هەموو جۆرە هەڵسو کەوتێکی مرۆڤـ دەکات، چ گەورە چ بچوك.. نەك هەر لە ژیانی دنیایدا. بەڵکو لە ڕۆژی قیامەتیشدا. نەك هەر لە جیهـانی بینـراودا، بەڵکو لە جیهانی نادیاری شاراوەشدا. نەر هەر تەنها لە سـەوداو مامەڵـەی مـاددی دیاردا، بەڵکو لە ناخی زەمیرو جیهانی ویستو ئیرادەی پەنهای نادیاریشدا، ئـایینی ئیسلام دامو دەزگایەکی گەورەی بەربڵاوی بڵندە بۆیە قابیـل نیـە هـەردەبێت ڕەگـی پتەوی هەبێتو بەڕوبەرێکی پانو پۆڕی دەرونا بڵاوبێتەوە.

ئەمە لایەنێکە لە سروشتو نهێنی ئەم ئایینە. کە هەر خۆی پرۆگرامی دامەزراندنو پێگەیاندنی خۆی دیاری دەکات. هەروەها بنیاتنانی عەقیدەو جێگیرکردنیو زۆری حوکمی،...هتد هەموویان بەشێکن لە پێویستییەکانی دامەزراندنی حەقیقی. ئەمانەشن دەبنە زامنی خۆڕاگرتنی. هەروەها دەبنە هۆی پێکەوە سازدانی ڕواڵەتی دەرەوەی درەختەکە ـ کە لە هەوادایەو ـ ڕواڵەتی رەگو ڕیشاڵەکانی، کە بەناخی زەویدا رۆچووە..

هەر کاتێك عەقیدەی (لا اله الا الله) لەدڵدا جێگیربوو، دەستبەجێ شان بەشانی ئەو رژێمەی کە (لا اله الا الله)ی تێدا دەردەکەوێت، دابین دەبێت. چونکە ئەو دڵو دەرونەی ئەو عەقیدەیەی تێدا جێگیر دەبێت، هەر لە سەرەتاوە خۆشی تەسلیمی ئەو رژێمە دەکات کە لەسەر عەقیدەکە دادەمەزرێت. ئەو خۆتەسلیمکردنەش کۆتا پلەی پتەویو دامەزراوی باوەڕە.. بەم جۆرە خۆتەسلیمکردنە بوو موسڵمانان ـ دوای ئەوەی عەقیدەکە دابین بوو ـ ملکەچیو ڕەزامەندیان بەرامبەر ئەو یاساو دەستورانە دەردەبڕی کە قورئان فەرمانی پێدەکردن.

ئیتر بێئەوەی کۆسپێك بێتەرێی وەرگرتنی، یان بێئەوەی سستی بنوێنن لە جێبەجێکردنو چەسپاندنیاندا.. بەو شێوەیە بوو ئارەق خواردنەوە، سوو، قومار، نەریتە جاهیلەیەکان، ڕیشەکێش کران، چ بە قورئان، چ بە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ کەچی حکومەتە زەمینیەکان، هەرچەند هەوڵ دەدەنو بەردەوام تێدەکۆشن بەیاساو دەستووریانەوە، بە رژێمو هێزیانەوە بە سەربازو دەسەڵاتیانەوە، بە پرۆپاگەندەو رێگاکانی راگەیاندنیانەوە ـ ئەوەندەیان دەستگیر نابێت کە هەر هیچ نەبێت نەیهێڵن بە ئاشکرا بکرێن، چ جای ئەوەی ڕیشەکێشی بکەن. بۆیە کۆمەڵگەکان لە زەلکاوی کرەوەی بەدو خراپەکاریدا شەپۆل دەدەن[1].

---

**١) بۆ چۆنیەتی حەرامکردنی خواردنەوە، بڕوانە بەشی/٥ ل ٧٨-٨٥ی (في ظلال القرآن).**
**هەروەها دەربارەی ئەوەی کە چۆن ئەمریکا دەسەوسان بوو لە نەهێشتنی خواردنەوەدا،**

# سروشتی ئیسلام و بانگەوازەکەی

لەلایەکی ترەوە سروشتی ئەم ئایینە، لە چۆنیەتی پرۆگرامە مەزنەکەیدا دەردەکەوێت. ئەم ئایینە بریتیە لە پەیڕەو پرۆگرامێکی کردەوەیی بزوتنەوەیی یانە.. بۆ ئەوە هاتووە کە حوکمی ئەم ژیانە لە واقیعدا بکات، وەبۆ ئەوەی بە فەرمانێکی سەربەخۆ لەگەڵ واقیعدا رووەڕوو بێتەوە. ئەوجا یا بڕیاری لەسەردەدات، یان ڕاستی دەکاتەوە، وەیان هەر لە بناغەوە دەیگۆڕێت.. ئەو یاسایانەش کە ئیسلام دایان دەنێت، بۆ ئەو حاڵو باروزروفانەن کەلەو کۆمەڵگەیەدا ڕوویانداوە (یان روودەدەن)، کە کۆمەڵگەی خۆی یەتی. ئەو کۆمەڵگەیەی کەلەسەرتایەوە باوەڕی تەنها بەحاکمێتی خوا هێناوە.

ئیسلام "تیۆر"ێك نیەو لەگەڵ گریمان (فەرەضیات)دا بجولێت. بەڵکو بریتیە لە (پەیڕەوو پرۆگرامێك) کە لەگەڵ واقیعدا دەگونجێت!!

دەبێت کۆمەڵگەی ئیسلامی وەها بێتەکایەوە کە لەسەر عەقیدەی (لا الە الا اللە) دامەزرا بێتو، قەناعەتی بەوە کردبێت کە تەنها فەرمانەکانی خوا"حوکم" دەکەن. وە دەبێت ئەو کۆمەڵگەیە هەموو حوکمێکی تری غەیری حوکمی خوایی رەفز بکاتەوە، چونکە ئەو حوکمە غەیرە خوایی یانە، لەسەر ئەو رێسایە دانەمەزراون.

کاتێك ئەو کۆمەڵگەیە بەکردەوە دێتە کایەوەو، ژیانێکی واقیعی دادەمەزرێنێت. ئەوسا پێویستی بەیاساو دەستوری کارگێران دەبێت. ئەوجا ئەم ئایینە دەست دەکات بە دارشتنی رژێم ویاسا بۆ ئەوەی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە، بە ملکەچییەوە خۆ تەسلیمی ئەو رژێمو یاسایانە بکەنو، هەرچی رژێمو یاسایەکی تری نائیسلامی هەیە

---

بڕوانە کتێبی (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمین)ی مامۆستا ابو الحسن الندوی کە لە کتێبی (التنقیحات)ی مامۆستا ابو الاعلی المودودی وەریگرتووە.

ڕەفزی بکەن.

پێویستە ئەو کەسانەی ئەمە عەقیدەیان دەبێت، دەسەڵاتێکی واشیان هەبێت بەسەر خۆیانو ئەو کۆمەڵگەیەدا کە تێیدا دەژین، تابتوانن عەقیدەکەیان لەنێو کۆمەڵدا دابمەزرێنن، بۆ ئەوەی رژێمەکەیان بەرێز بێتو شەریعەتەکەش لەنێو هەموو کۆمەڵدا (قەدرو هەیبەتێکی هەبێت).

لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا موسڵمانانی مەککە نەدەسەڵاتیان بەسەر خۆیاندا هەبوو، وە نەبەسەر کۆمەڵگەکەشیاندا. بۆیە ژیانێکی واقیعی سەربەخۆی خۆیان نەبوو، تا کاروباری شەریعەتەکەی خوا تێدا جێبەجێ بکەن. لەبەر ئەم هۆیە بوو کە خوا لەو ماوەیەدا رژێم ویاسای بۆ دیاری نەکردن، بەڵکو هەرچی دیاری دەکرد هەر دەربارەی عەقیدەو خووڕەوشت بوو. کە لەگەڵ باوەڕدا لەناخی دڵدا جێگیر دەبوو.. بەڵام کاتێك دەوڵەتی خۆیان لە مەدینە دامەزراند. دوای ئەوەی دەسەڵاتێکی سەربەخۆی خۆیان بوو خوا دەستورو یاسای بۆ ناردنە خوارەوەو، ئەو سیستەمەی بۆ دیاریکردن کە هەموو پێویستییەکانی کۆمەڵگە موسڵمانەکەیانی لە جیهانێکی واقیعیدا ـ تێدا جێبەجێ دەکرێت. کە دەوڵەت خۆی دەبووە لێپرساوی سەرەکی ڕاپەراندنی هەموو بەشو بەندێکی.

خوا نەیدەویست لەوکاتەدا کە موسڵمانەکان لەمەککە بوون، رژێمو یاسایان بۆ بنێرێت، تا بە ئامادەکراوی بیخەنە عەمارەوە، تا ئەو ڕۆژەی دەوڵەت لەمەدینە پێك دێنن، ئەوسا جێبەجێی بکەن!! ئەوە سروشتی ئەم ئایینە نیە! چونکە ئەم ئایینە زۆر لەوە واقیعیترو جیددی ترە.. خۆ ئیسلام ناڵێت ئەگەر فلان مەسەلە روویدا، فلان چارەسەر کردنی هەیە. بەڵکو ئیسلام لەگەڵ ئەو گیروگرفتانەدا رووەوڕوو دەبێتەوە کە ـ لەوکاتەدا ـ لە واقیعەکەدا، تووشی ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییە دەبن، کە خۆیان تەسلیمی شەریعەتەکەی خوا کردووەو، هەموو شەریعەتو یاسایەکی تریان رەفزکردووە، لەقەبارەو شێوەو باروزروفو چۆنیەتیدا. ئەوکاتە چارەسەرە ئیسلامییەکان پڕاوپڕ بەقەدەر قەبارەو شێوەو باروزروفو چۆنیەتی ئەو گیروگرفتانە دەبن.

ئەو کەسانەی دەیانەوێت ئیسلام ئەمڕۆ تیۆور بخاتەڕووو، پەیکەری سیستەمو رژێم داتاشێتو، یاساو دەستور دیاری بکات.. لەم ڕۆژەدا کە لە هەموو سەرانسەری زەمیندا، کۆمەڵگەیەك نیە ـ بە کردەوە ـ حوکم بە شەریعەتەکەی خوا بکاتو، هەموو شەریعەتو یاسایەکی تر رەفز بکات. لەگەڵ ئەوەش کە گەلێك حکومەت هەنو دەسەڵاتیشیان هەیە.. ئەو کەسانەی وایان دەوێت: نەدەزانن ئیسلام چییەو؟ نەدەزانن سروشتی ئەم ئایینە چۆنە؟ وە نەدەشزانن کە ئیسلام چۆن لەم ژیانەدا ئیش دەکاتو؟ ئەو شێوەیەی کە خوا مەبەستێتی، کامەیە؟!

ئەو کەسانە دەیانەوێت، ئیسلام سروشتو پرۆگرامو مێژووی خۆی بگۆڕێت، تا هاوشێوەی تیۆرە مرۆڤییەکان بووەستێت. تا بشوبهێتە پرۆگرامە مرۆڤییەکان!! ئەوانە دەیانەوێت پەلە لەم ئیسلامە بکەن و، هەنگاوەکانی خێراتر پێ‌هەڵ بێننەوە، لەپێناوی هێنانەدی ئارەزووەکانی خۆیان.. ئەو ئارەزووانەی کە لە دەروونی خۆیانداو، لە گیانێکی بەزیوانەی خۆیانەوە ـ بە شێوەیەکی کاتی ـ سەری هەڵداوە لە ئەنجامی بینینی رژێمە بچوکە مرۆڤییەکان... ئەوانە دەیانەوێت ئیسلام خۆی لە چەند قاڵبێکی تیۆرو فەرەزیاتدا داڕێژێت.. تا بەرەنگاری داهاتوو بکات!! داهاتوویەك کە هێشتا لەدایك نەبووەو نەهاتۆتە کایەوە بەڵام خوای گەورە تەنها وای دەوێت. کە ئەم ئایینە بەگوێرەی مەبەستی خوایەتی خۆی، هەنگاو بنێت.. بە عەقیدەکەیەوە، کە لەدڵدا جێگیر بووەو دەسەڵاتی بەسەر ویژداندا هەیە، عەقیدەیەك کە باوەڕپێکەرانی ملکەچی بۆ خوا نەبێت بۆ هیچ عەقیدەیەکی تر دەرنەبڕنو، یاساو دەستوور لەو عەقیدەیەوە نەبێت لە هیچ یاساو دەستورێکی ترەوە وەرنەگرن... بەو شێوەیە.. کاتێك کۆمەڵێك دێنە کایەوەو، ئەمە عەقیدەیان دەبێت.. و دەسەڵاتێکیان بەسەرخۆو کۆمەڵگەکەدا دەبێت... ئەوکاتە یاساو دەستوری شەریعەتەکەی خوا دێتە مەیدانو رووبەرووی پێویستییەکانی واقیع دەوەستێتو هەموو لایەنێکی کاروباری ژیان ـ لەجیهانی واقیعدا ـ ریك دەخات.

خوا ئەم شێوەیەی ـ بۆ ئەم ئایینە ـ دەوێت. هیچ شێوەیەکی تری ناوێت کە خۆی مۆڵەتی بەکارهێنانی نەدابێتو، پێی رازی نەبووبێتو، بە مەبەستی خۆی نەبووبێت.

ئیتر دڵو دەرونی خەڵکـی چی تێدایە، یا تێیـدا نیە، ئەوە مەسەلەیەکی ترە!!

هەروەها دەبێت داعیانی ئیسلام، کاتێك خەڵکی بانگ دەکـەن بـۆ دامەزرانـدنی ئەم ئایینە، دەبێت ئەوە بخەنە پێش چاو خۆیان کـە پێویسـتە پـێش هـەموو شـتێك خەڵکی بۆ یەکەمین مەبەستی ئیسلام بانگ بکەن. کە بریتیە لەوەرگرتنی عەقیـدەی ئیسلامی ـ ئەگەرچی ئەو خەڵکـەش بـۆ خـۆی هـەرلافی ئیسـلامەتی لێبـدەن‌و لـە تەسکەرەو ناسناویاندا بەموسڵمان درابێنە قەڵەم ـ پێویستە بزانن کە ئیسلام بریتیـە لە: وەرگرتنی عەقیدەی ئیسلامی‌و قەناعەت کردن پێی. بڕیاردانی ڕاستی نـاوەرۆکی (لا الە الا اللە)، کە بریتیـە لـە: قەناعـەت کـردن بـە حـاکمێتی خـوا لـە هـەموو کاروبارێکـدا. هـەروەها ریشەکێشـکردنی هـەموو جـۆرە سـتەمکارێك کـە ئـەو دەسەڵاتدارێتی یەی هی خوایە، ئەو خسـتوێتیە ژێردەسـتی خۆیـەوەو کردوێتـی بـە مافی خۆی.. بڕیاردانی ئەم عەقیدەیەش دەبێـت لـە دڵ ودەرونـدا بچەسـپێت‌و، لـە بارەوزروفی واقیعیشدا بدرەوشێتەوە.

دەبا سەرلەنوێ ئەو مەسەلەیە بکرێتەوە بناغەی بانگکردنی خەڵکی بۆ ئیسـلام، وەك لە یەکەمجاردا بناغەی بانگەوازی ئیسلامی بوو.. ئەو بانگەوازەی سیانزە سـاڵی تەواوی خایاند کە قورئانی مەککی سەرپەرشتی دەکرد ـ بەم مەفهومە ڕاستەی ئایین کە بریتی بوو لەوەی: کۆمەڵێك خەڵك باوەڕیان هێناو هاتنە ناو ئەو ئایینـەوە. هـەر ئەم کۆمەڵەش بوو دوایی ناوی لێنرا "کۆمەڵگەی موسڵمان" ئـەو کۆمەڵگەیـەی کـە دەشێت سەرەوکاری ژیانی کۆمەڵایـەتی خـۆی بـەرژێمی ئیسـلامی بکـات. چـونکە بڕیاری ئەوەی داوەو لەسەرەتاوە ڕەزامەندی دەربڕیووە کە هەموو ژیانی خۆی لەسـەر ئـەو بناغەیـە دادەمـەزرێنێت‌و غـەیری حـوکمی خـوا لـە هـیچ بـوارێکی ژیانیـدا بەکارناهێنێت.

دوای ئەوەی ئەم کۆمەڵگەیە دێتە کایەوەو، رژێمی ئیسلامی بـەکردەوە پێشچـاو دەخات، ئەوجا ئیتر خۆی یاسا بۆ خـۆی دادەنێـت، بـەو شـێوەیەی کـە واقیعەکـەی پێویسـتێتی لەچوارچـێوەیەکی گشـتی رژێمـی ئیسـلامیدا. ئەمەیـە هـەنگاو هەڵهێنانەوەی راستەقینەو رێك وپێکی پرۆگرامی ئیسلامی لە واقیعی کردەوەییدا.

گەلێك جار هەندێك لە دڵسۆزەکان (لەوانەیان کە پەلە لە ئیش وکاردا دەکەن) وا دێتە خەیاڵیان ـ چونکە بەشێوەیەکی تەواو شارەزای سروشتی ئەم ئایینەو سروشتی پەیڕەو پرۆگرامە راستەکەی نەبوون، کە لەسەر بناغەی حیکمەتی خوای زاناو شارەزا دامەزراوە ـ یان لەوانەی بە تەواوی دەرك بە سروشتی مرۆڤو پێداویستییەکانی ژیانی ناکەن زۆرجار ئەوانە وا دەزانن کە ئەگەر ئوصولو بنەماکانی رژێمی ئیسلامیو، یاسا ئیسلامییەکان بخرێنە پێش چاوی خەڵکی، بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان ئاسانتر دەبێتو خەڵکی زووترو زۆرتر بەدەم بانگەوازەکەوە دێن! بەڵام ئەمە خەیاڵە..هۆی پەیدابوونیشی پەلەکردنە! خەیاڵە وەك ئەو پێشنیارانە وایە کە هەندێك دەڵێن: ئەگەر بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتاوە لەژێر ئالای نەتەوایەتی یا کۆمەڵایەتی، یان ئالای خووڕەوشتدا بوایە چاکتر دەبووو، زووتریش بڵاودەبووەوە. بەڵام پێویستە پێش هەموو شتێك لەسەرتاوە ـ هەر لە یەکەمین هەنگاوەوە ـ دڵ تەرخان بکرێت بۆ خواپەرستن.. بە وەرگرتنو قبوڵکردنی شەریعەتەکەی خوا، وە رەفزکردنی هەموو یاساو شەریعەتێکی تر.. دەبێت ئەم بڕیاردانەش ئاشکرا بکرێت، پێش ئەوەی سەرنجی خەڵکی بۆ هیچ خاڵو بەندێکی تری شەریعەتی ئیسلامی رابکێشرێت! ئارەزو حەزکردنو خۆشەویستی شەریعەتی ئیسلامی، پێویستە لە دڵسۆزیو راستی خواپەرستی یەوە هەڵقوڵابێت، وە لە ئازادبوونی دڵەوە لە دەسەڵاتداریێتی غەیری خوا هەڵقوڵابێت.. نەك لەو لایەنەوە کە: ئەم رژێمەی دەخرێتە پێش چاو چاکترە لەو رژێمانەی لەبەر دەستدان لە فلان لایەنو فیسار مەسەلەیدا...

شەریعەتەکەی خوا، خۆی لەخۆیدا لە چاکە خوازانەیە چونکە لەلایەن خواوە دانراوە.. هەرگیزو هەرگیزیش یاساو دەستوری مرۆڤ لە هی خوا چاکتر نابن. بەڵام هێشتا ئەمە رێسای بانگەوازەکە نیە. بەڵکو رێسای بانگەوازەکە ئەوەیە کە شەریعەتکەی خوا قبوڵ بکرێت، بە هەموو ئەو بەندو خاڵانەیەوە کە تێیدان. وە هەموو شەریعەتو یاسایەکی تری غەیری هی خوا رەفزبکرێن بە هەموو بەندو خاڵێکەوە کە تێیاندان. ئەمەیە ئیسلامەتی.. ئیسلام لەم مانایە زیاتر مانای تر

نابەخشێت. جا هەرکەسێك ئیسلامی لەم مانایە زیاتر خۆش ویستو حەزی لە ئیسلام کرد، ئەوا هەموو کێشەکانی داهاتووی چارەسەرکردووەو، پێویستی بەوە نیە جوانیو چاکی ئیسلامی لا شیرین بکرێت.. ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەنەویستەکانی باوەڕهێنان!!

# شــەڕی بێ ووچــان

ئەوجا پێویستە ئەوە بڵێین: کە ئایا قورئانی مەککی چۆن لەماوەی سیانزە ساڵدا چارەسەری کێشەی عەقیدەی کرد؟ ئاشکرایە کە قورئان ئەم کێشەیەی لە شێوەی "تیۆر" یان "لاهوتی"دا پێشچاو نەخست، یان لە شێوەی ئەو "موناقەشە"دا نەبوو کە پێیان دەووت: (علم الکلام).

نەخێر بەڵکو قورئانی پیرۆز لەگەڵ سروشتی "مرۆڤ" دەدوا. دڵو دەروون هەستو هۆشو بوونی مرۆڤی دەدواند، دەربارەی ئەوانەو ئەوانەی کە لە دەوروبەری مرۆڤدا هەن دەدوا. وەك ئەو بەڵگەو نیشانانەی لە سروشتدا هەن. چونکە قورئان دەیەوێت سروشتی مرۆڤ لە خۆڵ وتۆز رزگار بکات. بۆیە لەسەرتاوە ئامێری وەرگرتنی مرۆڤ پاك دەکاتەوەو ئەوجا دەیخاتە گەڕ. پاشان قورئانی پیرۆز هەستو چاوو دڵی مرۆڤی دەکردەوەو تا زووترو زۆرتر بکەوێتە ژێر کارتێکردنی دروستکراوەکانی دەورەبەری.. ئەمە بە شێوەیەکی گشتی. بەڵام قورئان بە شێوەیەکی تایبەتی هەر بەم چەکی عەقیدەیە کەوتبووە شەرێکی زیندوی واقیعییەوە. هەر بەو چەکەش بوو دەچوو بەگژ ئەو خۆڵو تۆزەدا کە لە ئێستای واقیعدا لە فیطرەی دەرونی مرۆڤ نیشتووە، لەبەرئەوە بوو کە شێوەی "تیۆر" لەگەڵ ئەو واقیعە تایبەتییەدا نەدەگونجا. بەڵکو دەبوو هەر بەو شێوە بێت کە بەرەنگارییەکی زیندوانەی ئەو هەموو کەندو کۆسپە دەرونیو واقیعیانە ببێتەوە، کە لە دڵو دەرونی مرۆڤدا دروست بووبوون. هەر لەبەر ئەوەشە کە موناقەشەکردن (بەو شێوە شیکلییەی کە زانایانی "علم التوحید" لە چەرخەکانی دواییدا گرتبوویانەبەر) شێوەیەکی شیاوو سەرکەوتوو نەبوو. بەڵکو قورئان رووبەڕوی (واقیع)ێکی تەواوی مرۆڤ بوو بووەوە.کە هەموو جۆرە پشێوییەك لەو واقیعەدا هەبوو. بۆیە قورئان لەگەڵ کیانی بوونی مرۆڤدا دەداو. لە گێژاوی ئەو واقیعەدا. هەروەها شێوەی "لاهوتی" گەری گونجاو نەدەبوو. ئەگەرچی عەقیدەی ئیسلامیش هەر عەقیدەیەکی ئایینیە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە عەقیدەی ئیسلامی

بریتیە لە پرۆگرامێكی واقیعی كردەوەیی ڕاپەڕاندن. هەروەها عەقیدەیەك نیە وەك لێكۆڵینەوە لاهوتییەكان لە گۆشەیەكی تەسكدا گیردرابن!

قورئان هەر لەوكاتەی ئەو عەقیدەیەی لە زەمیرو ویژدانی كۆمەڵەی موسڵماندا دەڕواند، كۆمەڵە موسڵمانەكەشی دەخستە ناو گەرمەی شەڕەوە لەگەڵ ئەو جاهیلییەتەی بەدەوریانەوە بوو. وە دەیخستە نێو گەرمەی شەڕێكی سەختی درێژخایەنو لەگەڵ هەموو پاشماوەكانی جاهیلی، چ لە زەمیردا بووبن، چ لە خووڕەوشتو واقیعیاندا بووبن.

دیسان شتێكی تر هەیە كە پێویستە داعیانی ئیسلامی بەو شێوەیەی روونمان كردەوە، دەرك بە سروشتی ئەم ئاینەو، بە سروشتی بزوتنەوەی ئیسلامی بكەن. تا بزانن كە قۆناغی دامەزراندنی عەقیدە ـ كە ئەو ماوە زۆرەی سەردەمی ژیانی مەككەی خایاند ـ دوورەپەرێز نەوەستابوو لە پێكهێنانی كردەوەیی بزوتنەوەی ئیسلامیو، بنیاتنانی كۆمەڵەی واقیعی موسڵمانان. چونكە خۆ قۆناغی مەككی بریتی نەبوو لە قۆناغی وەرگرتنی (تیۆر)و لێكۆلینەوەی! بەڵكو بریتی بوو لە قۆناغی بنیاتنانی ڕێساو بنكەی دامەزراوی جێگیر، بۆ عەقیدەو كۆمەڵەو بزوتنەوەو سەلماندنی بوونی كردەوەیی بوون (وجود)...

ئەگەر بویسترێت جارێكی تر ئەم بنیاتنانە بهێنرێتەوە كایەوە، پێویستە هەر لەسەر نەخشەی ئەو قۆناغە مەككی یەوە دەست پێ بكرێتەوە.

بەڵێ قۆناغی دامەزراندنی عەقیدە پێویستە ئاوا ماوە بكێشێتو، پێویستە هەنگاو هەڵهێنانەوەی بنیاتنانی كۆشكی ئیسلامی، ئاوا لەسەرخۆ دەستی پێبكرێت. دەبێت زۆر هاوسەنگو جێگیر بێت. نابێت بە هیچ شێوەیەك بكرێتە قۆناغی دیراسەكردنو لێكۆڵینەوەی تیۆریانەی عەقیدە كە. بەڵكو دەبێت بكرێتە قۆناغی سەلماندنی بوونی عەقیدەكە، لە زیندوترین شێوەیدا. كە دەبێت لە زەمیرو ویژدانێكدا دەربكەوێت كە ئەو عەقیدەیە گەشەی تێدا كردبێت. وەدەبێت لە بنیاتنانێكی كۆمەڵكاریو كۆمەڵێكی خاوەن بزوتنەوەدا دەربكەوێ، كە بووبێتە ئاوێنەی كارتێكردنی گەشەكردنی عەقیدەكە. هەروەها دەبێت لەبزوتنەوەیەكی واقیعیدا دەربكەوێت، تانیشانەكانی زیندوێتی ئاشكرا دەبێت وزیاتر لەنێو جەرگەی

ناکۆکی‌یەکاندا لەگەڵ جاهیلییەتدا ئاو دەدرێت بۆ گەشەکردنی.

بــە پێــوەری ئیســلام داڕشــتنی عەقیــدە لــە شــێوەی "تیــۆر"ی لێکۆڵینــەوەو فراوانکردنی زانیــاریو ڕۆشــنبیری، هەڵەیــەکی زۆر گەورەیــەو، دژوارییــەکی ئــاڵۆز دەخولقێنێت. دژوارییەکی زۆر گەورە.. چونکە خۆ ئیسلام کــە مــاوەی ئــەو ســیانزە ساڵەی مەککەی بەو شێوەیە بڕی، وەنەبێت لەبەرئەوە بووبێت کە ئایینێکی نوێیــەوە تازە دێتەکایەوە. نەخێر، خــۆ ئەگــەر خــوا بیویســتایە بەیــەکجار قورئــانی دەنــاردە خوارەوە، پاشان بواری بۆ پێغەمبەرو یاوەرکانی دەکردەوە تا مــاوەی ســیانزە ســاڵ ـ زیاتر یان کەمتر ـ خەریکی لێکۆلینەوەی بن، تابەتەواوی لە"تێوری ئیسلامی" حاڵی دەبن لە مێشکیاندا دەچەسپێنێت. بەڵام خــوای پــەروەردگار کــارێکی‌تری دەویســت. پرۆگرامێکی دیــاریکراوی جیــاوازی دەویســت. بنیاتنــانی کۆمەڵــەو بزوتنەوەیــەکی ئیسلامیو داڕشــتنی عەقیــدەی دەویســت هــەر سێکیشــیانی (کۆمەڵــەو بزوتنــەوە عەقیدە)ی لەیەك کاتــدا دەوویســت.. دەیوویســت کۆمەڵــەو بزوتنــەوە بــە عەقیــدە دروست بن. هەروەها عەقیــدەش بــە کۆمەڵــەو بزوتنــەوە دروســت بێــت دەیویست عەقیدەکە ببێتە واقیعی بزوێنەری کردەوەیی کۆمەڵەو، دەیویســت واقیعــی بزوێنــەر کردەوەیی کۆمەڵەش ببێتە وێنەیەکی هەســتپێکراوی عەقیدەکــە... خــوای گــەورە دەیزانی کە دروست بوونی دەرونو کۆمەڵە بــە شــەوو ڕۆژێــك دروســت نــابن. بۆیــە مومکین نەبوو هەر دەبوو بنیاتنــانی ئــەو عەقیدەیــە ئەوەنــدە مــاوە بخایــەنێت کــە دەروونی تێدا پەروەردە دەبێتو کۆمەڵەی تێــدا پێکــدێت.. هــەر کــە عەقیدەکــەش گەیشتە بەرهەم، کۆمەڵەکەش بووە دیاردەیەکی واقیعی ئەو پێ‌گەیشتنە.

# سێ گۆشەکە

ئەمەیە سروشتی ئەم ئایینە ـ وەك لەپرۆگرامی قورئانی مەککیدا دەردەکەوێت ـ دەبێت زۆر شارەزای ئەم سروشتە بین. نابێت بەهیچ جۆرێك هەوڵ بدەین لەبەرخاتری چەند حەزو ئارەزویەکی هەڵەشەی بەزیوو بەرامبەر تیۆرە مرۆڤییەکان! ئەم سروشتە تایبەتییە بگۆڕین.. چونکە ئەم ئایینە ـ بەهۆی ئەم سروشتەیەوە بوو، توانی نەتەوەیەکی موسڵمان بۆ یەکەمین جار دروست بکات. هەموو جارێکیتریش هەر بەو سروشتەی خۆی، دەتوانێت نەتەوەیەکی موسڵمان دروست بکاتەوە. هەموو کاتێکیش لە توانایدا هەیە ئەگەر وویسترا نەتەوەی موسڵمان بهێنرێتەوە کایەوە.

دەبێت زۆرباش بزانین کە هەوڵدانی گۆڕینی سروشتی عەقیدەی زیندووی ئیسلامی ـ کە دەیەوێت لە واقعێکی گەشەدارو زیندوو بزوارو، وکۆمەڵێکی بزوێنەردا دەربکەوێت ـ بۆ "تیۆر" ێکی لێکۆڵینەوەو فراوانکردنی زانیاری‌و رۆشنبیری.. هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.. ئەم، هەڵەیەش لەوەوە پەیدا دەبێت کە بمانەوێت بەربەرەکانێی تێورە لاوازە مرۆڤییەکان بە"تیۆری ئیسلامی" بکەین.

عەقیدەی ئیسلامی دەبێت لەدەرونێکی زیندووو، ڕێکخراوێکی واقیعی، وکۆمەڵێکی بزوێنەرو بزوتنەوەیەکدا دەربکەوێت، کە لەگەڵ جاهیلییەتی دەوروبەر بدا لە کارو کارتێکردندا بێت، وەك ئەوەی کە دەبێت لە پاشماوە جاهیلییەکانی دەرونی شوێنکەوتوانیشیدا لەکارو کارتێکردندا بێت. (چونکە شوێنکەوتووەکان پێشتر جاهیلی بوون، دەرونیان ئاساری جاهیلییەتی تێداماوە، بەڵام ئێستا خاوەنی عەقیدەی ئیسلامین) ئەو عەقیدەیەش بەو شێوەیە کە دەتوانێت بوارێکی زۆرترو روبەرێکی فراوانتر هەم لە دڵو دەرونو ژیریدا هەم لە واقیعی ژیاندا بگرێتەوە. رووبەرێکی گەورەتر لەوەی کە "تێور" ێك پێویستی پێیەتی.

ئایدیۆلۆژی ئیسلامی دەربارەی خوایەتی" الألوهية"و بوونی گەردونی‌و، ژیان‌و،

مـــرۆڤ، ئایدیۆلۆژییـــەکی تـــەواوەو هـــەموو کـــونجێکی ژیـــان دەگرێتـــەوە. چـــونکە ئایدیۆلۆژییەکی واقیعییە. هەر بە تەبیعـەتی خـۆی ئـەوە دەبوغزێنێـت کـە ببێتـە ئایدیۆلۆژییەکی فیکریو رۆشنبیری. چونکە ئەمە پێچـەوانەی سروشـتو مەبەسـتی بیروهۆشی ئیسلامییە. چونکە ئایدیۆلۆژیکی ئیسلامی دەبێت لە چەند کەسـانێكو، لە رێکخراوێكو، لـە بزوتنەوەیـەکی واقیعیـدا دەربکـەوێت.. رێبـازی گەشـەکردنو پێگەیشتنیشی دەبێت لە چەند کەسانێكو، لە رێکخراوێکی زینـدوو، بزوتنەوەیـەکی واقیعیدا دەربکەوێت. بۆ ئەوەی وەك لە واقیعدا دەگاتە پلەی تەواوێتی، لە تیۆریشدا بیگاتێ. چونکە ئایدیۆلۆژی ئیسلامی لە شێوەی "تیـۆر"دا جێـی نابێتـەوە. بـەڵکو هەردەبێت لە شێوەی "واقیع"ێکی بزوێنەردا دەربکەوێت.

هەر گەشەکردنێکی تیۆریانە پێش گەشەکردنی بزوتنەوەی واقیعی بکـەوێت. یـان پێکەوە شان بەشانی یـەك نـەڕۆن. ئـەو جـۆرە گەشـەکردنە بـە پێـوەری سروشـتو مەبەستو شێوەی پێکهێنـانی خـۆیی ئـەم ئایینـە، گەشـەکردنێکی دژوارو پـڕ لـە هەڵەیە.

خـــوا دەفەرموێت: **(وقُرآناً فَرَقْناهُ لِتَقرَأَهُ على النّاسِ عَلى مُكْثٍ ونَزَّلناهُ تَنزيلاً)** **(الإسراء– ١٠٦)**، واتە: قورئانێکمان مەبەست بوو، تـا بـۆ خـەڵکی بخوێنیتـەوە، بـۆ مەبەستێك، بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵیش بۆمان ناردونەتە خوارەوە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیـە تـا دروسـت بـوونو پێکهاتنەکـەی کۆمەڵـەی ئیسـلامی دامەزراوانـە بێتـەدی، کـە لەسـەر بناغـەی عەقیدەیـەو، لـەنێو (رێکخراوێکـی زیندوو)انەدا دادەمەزرێت. نەك لە شێوەی "تیۆر"دا.

پێویستە داعیانی ئیسلام زۆرباش بزانن کە ئەم ئایینە وەك چۆن بۆ ئەوە هـاتووە کە بیرکردنەوەو هەستوهۆش بگۆڕێت ئەوجا واقیعە زیندووەکە، هـەر بەوشـێوەیەش بۆ ئەوە هاتووە کە لەوکاتەی عەقیدە دەگۆڕێت لـە هـەمان کاتیشـدا نەتەوەیـەکیش پەروەردە دەکات. پاشانیش پەیڕەو پرۆگرامێکی بیرکردنەوەشـی بـۆ دادەڕێـژێت کـە تایبـەتی بێـت بەخۆیـەوە. کـەوابوو بەهـەمان شـێوە ئیسـلام دەیوێـت بیروهۆشـی عەقیدەییو واقیعێکی زیندوو دابمەزرێنێت، پرۆگرامێکی بیرکردنـەوەش دادەرێـژێت.

بۆیە ئەو سێیە: پڕۆگرامی بیرکردنەوە تایبەتییەکەی‌و، بیروهۆشە عەقیدەییەکەی‌و، پەیکەری بنیاتنانی واقیعە زیندووە تایبەتییەکەی، هیچیان ناکرێت لێك دابـبڕێن. چونکە هەموو یەك چەپکن.

کەوابوو کاتێك کە ئێمە پەیڕەو پڕۆگرامی ئیشکردنی ئیسلامیان بەو شێوەیە زانی‌و شارەزای بووین. دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم پڕۆگرامە ڕەسەن‌و هەمیشەییشە. وە نەبێت پرۆگرامی قۆناغێك، یان شوێنێك، یان باروزروفێکی تایبەتی بوبێت. یان تایبەت بووبێت بە کۆمەڵی نەوەی یەکەمینی موسڵمانانەوە. نەخێر. بەڵکو بریتیە لەو پەیرەو پرۆگرامەی کە ئەم ئایینەی ـ لە هیچ کاتێکدا ـ لێ دروست نابێت تەنها بەو نەبێت.

ئیشی ئیسلام هەر ئەوە نەبوو عەقیدەو واقیعی خەڵکی بگۆڕێت‌و بەس بەڵکو دەبوو پرۆگرامی بیرکردنەوەشیان بگۆڕێت. هەروەها شێوەی لێکدانەوەی واقیع بگۆڕێت لەبیری خەڵکیدا. چونکە ئیسلام پرۆگرامێکی خوایی یەو لە هەموو سروشتیدا لە پرۆگرامە کەم‌و کورتە لاوازەکانی مرۆڤ جیاوازترە.

ئێمە لە ڕێگای پرۆگرامی بیرکردنەوەی خوایی یەوە نەبێت ـ ئەو پرۆگرامەی کە خوا دەیەوێت بیرکردنەوەی خەڵکی لەسەر دامەزرێنێت، تا بیروهۆشی عەقیدەیی‌و پێکهاتنی زیندوی یان بناغەیەکی ڕاستی هەبێت ـ لە ڕێگای ئەو پرۆگرامەوە نەبێت، ئەستەمە بگەینە بیروهۆش‌و ژیانێکی خوازراو.

## بەرنامـەی بیـرکردنەوەو بزوتنـەوە

کاتێـك ئێمـە دەمانـەوێت ئیسـلام خـۆی بکاتـە "تیـۆر"ێـك بـۆ دیراسـەکردنو لێکۆڵینەوە بەم کارەمـان ئیسـلام لـەوە دەردەکـەین، کـە پرۆگرامـی بنیاتنـانێکی خواوویستانەیە، هەروەها سروشتی بیرکردنـەوەی خواوویسـتی دەشـێوێنینو، ئیسـلام بچوك دەکەینەوەو دەیخەینە ژێردەستی پرۆگرامـی بیرکردنـەوەکانی مرۆڤـ ئەمـەش ئەوە دەگـەێنێت کـە گوایـا ئیسـلام ـ کـە پرۆگرامێکـی خواوویسـتە ـ نـزمترە لـە پرۆگرامەکانی مرۆڤـ!! ئەوە دەگەێنێت کە ئێمە دەمانەوێت پرۆگرامـەکانی خوا لـە ڕووی ئایدیۆلۆژیو بزوتنـەوەوە بڵند بکەینەوە تا بیگەێنیتە ئاسـت پرۆگرامـەکانی مرۆڤـ.

مەسەلەکەش لەم لایەنەوە زۆر دژوارەو، چونکە ئەمە بەزینو تێـك شـکاندنێکی کوشندەیە.

ئیشی ئەم پرۆگرامە خوایی یە ئەوەیە کە بەرنامەیەکی تایبەتی بدات بـە ئێمـەی خاوەن بانگەوازی ئیسلامی (بـۆ بیرکردنـەوە. بـۆ ئـەوەی بـەهۆی ئـەو پرۆگرامـەوە پاشماوەو شوێنەواری بیروهۆشە جاهیلییەکانی سەرزەمین بسڕینەوە، کە هێشـتا تـۆزو خۆڵو ئەسەریان لەمێشکماندا ماوە.. ئەو بیروهۆشە جاهیلییەی پاڵەپەستۆی لەسـەر ژیریمان دروست کردووە، وکونجی ڕۆشنبیریمانی گرتووە..) ئەگەر ئێمە وویسـتمان ئـەم ئایینە لە روانگەی پرۆگرامێکەوە ببینین کە لـە سروشـتی ئـەم ئیسـلامەوە دوورە ـ وەکو پرۆگرامی بیروهۆشە جاهیلییەکان کە ئەمڕۆ هەن ـ بـەم ئیشـەمان کـاری ئـەم ئایینەمان پەك خست، کەدەبوو بگەێنرێتە مرۆڤایـەتی. هـەروەها خۆشـمان نـابووت دەکەین لەو مۆڵەتەی کە دراومانەتێ بۆ ئـەوەی خـۆڵو تـۆزی نیشـتووی پرۆگرامـی جاهیلی کە لەسەر مێشكو ژیریو پەروەردەکردنمان پەیدابووە دووربخەینەوە.

**مەسەلەکە لەم لایەنەشەوە دیسان زۆر دژوارەوە زیانەکەشی کوشندەترە.**

بەرنامەی بیرکردنەوەو شێوازی بزوتنەوە لە ئیسلامدا لە بەرنامەی بیروهۆشی عەقیدەییو رژێمی زیندوانە کەمتر نین، پێویستریش نین. هەروەها لێکیش دانابڕێنو لێك جویێ ناکرێتەوە. ئێمە ئەگەر وویستمان ئەم ئایدیۆلۆژیو ئەم رژێمە بخەینە چوارچێوەیەکی دەڕبرینەوە، پێویستە لەیادمان نەچێت کەئەم شێوەیە (ئیسلام)مان لە شێوەیەکی بزوتنەوەیی واقیعیدا لەسەرزەمین بۆ ناهێنێتە کایەوە.

بگرە پێویستە هەر لە یادمان بێت کە پێشچاوخستنی ئیسلام بەم جۆرە تەنها ئەوانە سوودی لێوەردەگرن کە بەکردەوە لە واقیعی ژیاندا خەریکی ئیسلامەتین.. ئەوپەڕی ئەو سوودەش کە بەوان دەگات کە بەو شێوەیە ئیسلامیان وەرگرتووە، ئەوەیە کە خێرا خۆیان لەگەڵ ئەو ئیسلامە بسازێنن بەو رادەیەی کە وەریانگرتووە.

جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە، کە بیروهۆشی عەقیدەیی (ئایدیۆلۆژی ئیسلامی) پێویستە دەستبەجێ لە کۆمەڵەیەکی بزوێنەردا دەربکەوێتو، پێویستە کۆمەڵە بزوێنەرەکەش لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی راست ئاوێنەی بیروهۆشی عەقیدە بێ.

دیسان جارێکی تریش دووپاتی دەکەمەوە کە ئا ئەمەیە پرۆگرامی سروشتی ئیسلامی خوایی یەکەمان. کە ئەمەش پرۆگرامێکی راسترو بەرزترو کاریگەرترەو، زیاتریش لەگەڵ فیطرەی سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت وەك لەوەی لەقالبی تیۆری سەربەخۆو تەواودا دابڕێژرێتو، بە شێوەیەکی ساردو سڕانە بخرێتە مێشکی خەڵکییەوە. پێش ئەوەی ئەو خەڵکە بە کردەوەیەکی بزواوی واقیعی، پەروەردە کرابن. یان پێش ئەوەی خۆیان بووبنە نموونەی زیندووی ئەو پرۆگرامەی کە دەبێت هەنگاو هەنگاو پێ‌هەڵبنێن پێی تا ئەو ئایدیۆلۆژییە تیۆرییە لە واقیعی کردەوەییدا دەنوێنرێت .

مادام ئەم شێوەیە لەگەڵ ئەسڵی تیۆرەکەدا دەگونجێت.. گومانی تێدا نیە کە لەگەڵ پێشکەش کردنی ئوصولی رژێمەکەشدا دەگونجێت کە لە بیروهۆشی ئیسلامیدا دەردەکەوێت هەروەها لەگەڵ پێشکەشکردنی بەندەکانی یاساکانی ئەم رژێمەشدا دەگونجێت.

ئەم جاهیلییەتەی لە دەوروپشتمانە. وەك چۆن جاری وا هەیە پاڵەپەستۆ دروست دەكات لەسەر مێشكی هەندێك لە داعییە ئیسلامییەكان. لەوانەی هەڵەو پەلە دەكەن لە هەنگاو هەڵهێنانەوەی چاسپاندنی ئەم پرۆگرامە ئیسلامییە، هەروەها جاری واش هەیە هەر ئەو جاهیلییەتە بەرپرسیاركردن ئەو جۆرە كەسانە ناڕەحەت دەكات. وەك ئەوەی پرسیاریان لێدەكات: كە كامەیە لق و بەندو یاسای ئەو رژێمەی ئێوە بانگەوازی بۆ دەكەن؟ كوا چیتان ئامادە كردووە لە لێكۆڵینەوەو دیراسەكردن بۆ ڕاپەراندنی رژێمەكەتان؟ چیتان هەیە دەربارەی ئەم لایەنە تازانەی ژیان كە چەرخی نوێ هێناویێتییە كایەوە؟... ئەم جۆرە كەسانە وا دەزانن ئەوەی ئێستا خەڵكی پێویستیێتی ـ لە دامەزراندنی شەریعەتی ئیسلامیدا ـ بریتییە لە ئەحكامی شەرعناسی (الفقه)ی ئیسلامی، یان وەكو بڵێی خەڵكەكە گەیشتبێتنە قۆناغێكی وا كە هەموو رازی بووبن بەوەی شەریعەتەكەی خوا حوكمیان بكات.. بەڵام خۆ ئەو كەسانە جاریێ هێشتا چەند (مجتهد)ێكیشیان نیە بتوانێت یاسا لە ئیسلام دەربهێنێت بە شێوەیەك كە لەگەڵ رێبازو پێداویستییەكانی ئەم چەرخەدا بگونجێت، ئەم جۆرە كارەش هەر گاڵتەبازارە، پێویستە ئەوەی دڵو دەروونی بۆ ئەم ئیسلامە دەجۆشێتو رێزی لێدەگرێت لەم جۆرە هەڵسوكەوتو گەڕەلاوژێیە دوور بكەوێتەوە!!

جاهیلییەت كاتێك كە ئەو ناڕەحەتیانە دروست دەكات دەیەوێت نەخۆشیو پشێوی بخاتە نێو شەریعەتەكەی خواوە دەیوێت مرۆڤ هەر لەسەر مرۆڤ پەرستی بمێنێتەوە دەیەوێت كۆمەڵەی موسڵمانان لەسەر پرۆگرامە خواییەكەیان پەروەردە نەبن، تاوایان لێبكات قۆناغی بنیاتنانی عەقیدەكە نەبڕنو عەقیدەكە نەكەنە هۆی بزوتنەوە، بەو هیوایەی سروشتی پرۆگرامیی داعی ئیسلامی بگۆڕنو نەهێڵن تیۆر بە بزوتنەوە دابڕێژنو، دیاردەو رواڵەتی رژێمەكە لە مومارەسەكردندا دیاری بكەن ـ تا بواری وا نەكەنەوە بۆ كۆمەڵەی ئیسلامی كە یاسای ئیسلامی دابڕێژێتو، چارەسەركردن بخاتەروو، بەرامبەر هەموو كێشە حەقیقەتەكان كە لە ڕووبەڕووبوونی واقیعو ژیانیدا تووشی دێن.

هەروەها پێویستییەکی گەورەی داعی ئیسلامی ئەوەیە کە نەچن بەدەم ئەو جۆرە موناوەرانەوە.. پێویستە هەموو پرۆگرامێکی تر رەفز بکەن، کە هەوڵ دەدرێت بخرێتە نێو بزوتنەوەکەیانەوە.. دەبێ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ئیسلام هەیە، چاو نەترس بن‌و بەو موناوەرانە شەخسیەتی ئیسلامی خۆیان سووك نەکەن.

هەروەها پێویستە لەسەریان ئەو جۆرە موناوەرانەی دەکرێت بەرامبەریان ـ بە هیوای پشێوی‌و ناڕەحەت کردنیان ـ زوو پەردە لە ڕوویاندا هەڵماڵن‌و پەرپوتێتی ئاشکرا بکەن. لەملاوەش خۆیان لەوە بەرزتر بگرن. دەبێت رەفزی ئەو بەیت‌و بالۆرە بێنرخە بکەن کە پێی دەڵێن : (پێش خستنی شەرعناسی ئیسلامی ـ تطوير الفقه الأسلامي) کە لە کۆمەڵگەیەکدا دروست دەبێت کە ملکەچی دەرنابڕێت بۆ شەریعەتەکەی خوا. وەك چۆن دەبێت هەموو شەریعەتێکی غەیری ئیسلامی رەفز بکەن، پێویستە لەسەریان کە ئەم گڕوگاڵەش فڕێ بدەنە ئەولاوەو خۆیانی پێوە خەریك نەکەن... پێویستە لەولاوە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بکەونە ئیشی جیددی.. ئەم گڕوگاڵ‌و بەیت‌و بالۆرانە لاڕێخەن.. ئەمانە تۆو چاندنن لە هەوادا.. ئەمە فێڵێکە بۆ خەریککردنی داعیی ئیسلامی.. بۆیە پێویستە رەفزی بکەنەوە.

دیسان پێویستە لەسەر داعی ئیسلامی خاوەن بزوتنەوە، یەك بن‌و بەگوێرەی پلانی پرۆگرامی ئیسلامی بجوڵێنەوە. چونکە ئەم جۆرە بزوتنەوەیە یەکێکە لە نهێنیەکانی هێزی ئەم ئایینە. وەك چۆن کە نهێنی هێزی خۆیان هەر ئەوە.

"پرۆگرام" لە ئیسلامدا بریتیە لە "حەقیقەت"..هیچیان لێك جوێ ناکرێنەوە. هیچ پرۆگرامێکی نەناسراو ناتوانێت ئیسلام بهێنێتەدی‌و بیچەسپێنێت.. ئەو پرۆگرامانە دەتوانن رژێمی مرۆڤی خۆیان بچەسپێنن، بەڵام نەك هەر ناتوانن ئیسلامەکەی ئێمە بچەسپێنن بەڵکو هەر لە سەرەتای هەوڵدانەکانیانەوە دەسەوەسان دەکەون.. چونکە ئیلتیزام کردن بە پرۆگرامەوە وەك ئیلتیزام کردن وایە بە عەقیدەوە. وەك چۆن ئەمیش وەك ئیلتیزام کردن وایە بە رژێمەوە.. ئەمەش لە هەموو بزوتنەوەی ئیسلامیدا هەروایە:

(إنّ هذا القُرآنَ يَهدي للتي هيَ أقوَمُ = ئەم قورئانە خەڵکی رێنمایی دەکات بۆ

ژیانێکی دامەزراوتر).

## بنیاتنان و پێکهاتنی کۆمەڵگەی ئیسلامی

بانگەوازی ئیسلامی، کە لەسەر دەستی پێغەمبەر بوو ﷺ بریتیە لە کۆتا ئەڵقەی زنجیرەی ئەو بانگەوازە کۆنەی ئیسلامەتی، بە سەرکردایەتی قافڵە بەرێزەکەی پێغەمبەران. ئەم بانگەوازە بەدرێژایی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەوڵی هێنانەدی یەك مەبەستی دەدا.. ئەویش پێ ناساندنی خوای تاكو تەنها بوو بە خەڵکی، بەشێوە پاكو دروستەکەی.. وەنەبێت خەڵکی ـ جگە لە چەند ئەندامێك کە ناوبەناو لە مێژودا دەردەکەوتن ئینکاری بوونی خواو سیفاتی خوایەتی خوایان کردبێت بەڵکو لە ناسینی خوای راستەقینەدا، بەهەڵەدا دەچوون، یان هاوەڵیان بۆ بریاردەدا. چ لە بیروباوەڕو پەرستندا، چ لە وەرگرتنی حوکمی غەیری حوکمی خواو شوێنکەوتنی غەیری فەرمانی خوایی دابووبێت ئەم دوو شێوەش هەردوکیان بە کوفر حسابن و خەڵکی لە ئایینەکەی خوا دەبەنە دەرەوە. ئەو ئایینەی کە پێغەمبەران بە خەڵکیان دەگەیاند. کە پاش ماوەیەك لێیان لادەداو دەگەڕانەوە نێو ئەو جاهیلییەتەی کە پێغەمبەرەکانیان لێیان قوتار کردبوون.. وە جارێکی تر دەگەڕانەوە سەر هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن. چ لە بیرو باوەڕو پەرستنیاندا، چ لە وەرگرتنی حوکمی غەیری خوایی و شوێنکەوتنی ڕێبازی غەیری پەیامی خواییدا. وە چ لە هەردوو شێوەکەدا..

ئەمەیە سروشتی بانگەوازەکەی خوا بە درێژایی مێژوو.. کە هەموو مەبەستێکی بریتیە لە موسڵمان بوونی خەڵکی.. واتە تەسلیم بوونیان.. تەسلیم بوونی بەندەکان بە خوای خۆیان و.. رزگارکردنیان لە بەندەپەرستی بۆ پەرستنی خوای بەندەکان. هەروەها ئازادکردنیان لە ژێردەسەلاتی حوکم و یاساو نەریت و خووی مرۆڤ .. تا لە هەموو کاروبارو هەڵس وکەوتێکی ژیانیاندا بخرێتە ژێر دەسەلاتی خوا.. دەسەلاتی

حوکمو شەریعەتەکەی.

لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە ئیسلام لەسەر دەستی پێغەمبەر هات ﷺ وەك چۆن لەوەو پێش لەسەر دەستی پێغەمبەرە بەرێزەکانی تر هاتبوو.. بۆ ئەوە هات تا خەڵکی بگێرێتەوە ژێر دەسەڵاتی خوا. وەکو کە چۆن هەموو گەردون لەژێر دەسەڵاتدارێتی ئەو دایە. چونکە پێویستە ئەوی ئەو دەسەڵاتدارێتییەی ژیانیان رێك دەخات هەر ئەو دەسەڵاتدارێتییە بێت، کە بوونیانی هێناوەتەکایەوە. نەبادا خۆیان بەریو شوێنی پرۆگرامو دەسەڵاتدارێتییەکی تری غەیری ئەو پرۆگرامو یاساو دەسەڵاتەدا برۆن کە بۆ هەموو گەردون دانراوە، چونکە خەڵکی وان لەژێر چەند یاسایەکدا کە خۆیان دەسەڵاتیان بەسەریدا ناشکێت، کە بریتین لە چەند یاسایەکی سروشتی خوایی.. وەك دروست بوونو گەشەکردنیان، لەش ساغیو نەخۆشیان، ژیانو مردنیان، وەك چۆن کە وان لەژێر چەند یاسایەکی تری کۆمەڵایەتیشدا، هەروەها لە چارەنووسی هەڵسو کەوتە سەربەستەکانیشیاندا.. وەکو کە ناشتوانن نەخشەی خوایی بگۆڕن لەیاسا گەردونیەکاندا کە حوکمی هەوو جوڵانەوەیەکی گەردون دەکەن. هەر بەو پێیە لەو لایەنانەی ژیانیشیاندا کە کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی خۆشیانەوە هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆلای خوا. وەدەبێت لە هەموو لایەنێکی ژیانیدا شەریعەتەکەی خوا بکەنە حاکم تا لایەنی وویستو ئیرادە سەربەستەکەیان لەگەڵ لایەنە فیطرەکەیاندا پێکەوە بسازێن ـ بۆ ئەوەی لە لایەکی تریشەوە هەموو بوونیان لە هەردوو لقەکەیەوە لەگەڵ بوونی گەردوونیدا پێکەوە بسازێن[1].

بەڵام ئەو جاهیلییەتەی لەسەر بناغەی حاکمێتی مرۆڤو، لادانی لە سروشتی بوونی گەردونیو، پێککێشانی لایەنی ئیرادەی مرۆڤ و لایەنی فیطرەیدا دادەمەزرێت. ئەو جاهیلییەتەی کە پێغەمبەران لەکاتی بانگەوازە خوایەکەیاندا تووشی دەهاتن.. ئەو جاهیلییەتەی کە پێغەمبەری خۆمان ﷺ تووشی هات..

---

(1) بۆ زیاتر شارەزایی ئەم بابەتە تەماشای کتێبی (بەرەو ڕێبازی ئیسلام بەکوردیکردنی مستەفا عبدالله) بکە کە نوسراوی ماموٚستا ابو الاعلی المودودی. ئەمیری (جماعتی ئیسلامی) پاکستانە.

ئەمانە هەمووی وەنەبێت تەنها "تیۆر"ێك بووبن.. نا.. بەڵكو جاری وا هەبووە هەر "تیۆر"یان نەبوو.. بەڵام لە بزوتنەوەیەكی خاوەن تەنزیمدا دەركەوتوون. یان لە كۆمەڵێكدا كە سەركردەی ئەو كۆمەڵگەیەی دەدرایە دەست. كە ملكەچی بیروهۆش و خوونەرریت و هەست و سۆزی تایبەتی خۆی دەبوو.. ئەو كۆمەڵگەیەش كۆمەڵگەیەكی وابووە كە تاكەكانی كارتێكردن و گونجاون و یارمەتیدان و سەرپەرشتیارێتی تەواویان بۆ یەك بووە. ئەمانەش بوون وایانكردووە كە ئەو كۆمەڵگەیە زۆر هەوڵدەر بێت هۆشیارانە یان بێئاگایانە ـ بۆ پاراستنی مانەوەی بوون و، بەرگریكردن لە قەوارەی خۆی و، ڕیشەكێشكردنی رەگی هەر دژوارییەك كە هەڕەشەو مەترسی لەو بوون و قەوارەیە دەكات. جا ئیتر ئەو مەترسییە بە هەر جۆرێك بووبێت.

بۆیە جاهیلییەت بریتی نیە لە"تیۆر"ێكی ڕووت بەڵكو بریتیە لە تەنزیمێكی بزوێنەری خۆگر. لەبەرئەوەیە كە هەرچی هەوڵدانێك دەدرێت بۆ نەهێشتنی ئەو جاهیلییەتەو، گێرانەوەی خەڵكی بۆ پرۆگرامی خوایی ئەگەر لە شێوەی "تیۆر"ێكی ڕووتدا بێت، هیچ نرخێكی نیەو هیچ سوودێكیش ناگەیەنێت. چونكە ناتوانێت بەرامبەر ئەو جاهیلییەتە بووەستێت كە هەیە. ئەو جاهیلییەتەی لە تەنزیمێكی بزوێنەری خۆگردا دەردەكەوێت، چ جای ئەوەی لەو پتەوتر بێت ـ كە پێوستە وابێت ـ مادام دەیەوێت ئەو واقیعە بگۆڕێت و بیكات بە واقیعێكی تر كە لە سروشت و پرۆگرام و كۆو بەشیدا جیاوازە. لەبەر ئەوەیە كە دەبێت ئەم هەوڵدانە نوێیە، خاوەن تەنزیمێكی بزوێنەرو پتەوتر بێت لەهەموو ڕێساو تیۆرو ڕێخكستنێكدا. هەروەها لە پەیوەندی و پەیوەستییەكانی نێوان ئەندامەكانیدا. دەبێت لەو كۆمەڵگە جاهیلییە بەهێزتر بێت كە ئەم دەیەوێت بیگورێت. ئەو ڕێسا تیۆرییەش كە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ. ئیسلامی لەسەر دامەزراوە بریتیە لە (لا اله الا الله). واتە تەنهایەتی خوای گەورە لە هەموو سیفاتی خوایەتی و پەروەردگارێتی و سەرپەرشتیارێتی و دەسەڵاتدارێتی و فەرمانڕەواییدا.. بڕیاردانی ئەمەش دەبێت بەشێوەی قەناعەت پێكردن بێت لەدڵ و دەروندا، وە بەشێوەی پەرستن بێت لە دروشمەكاندا، وە بەشێوەی ڕاپەڕاندنی یاساو شەریعەت بێت لە واقیعی ژیاندا كەوابوو ئێستا. بەگوێرەی

شەریعەتی ئیسلامی (لا اله الا الله) بوونی نیە. چونکە بوونی ئەو بڕیارە ئەوکاتە دێتەدی کە بەوشێوە تەواوە، لە بوونێکی هەست پێکراوی ڕاستەقینەی وادا دەربکەوێت کە موسڵمانی پێ دەپێورێت).

مانای تیۆریانەی ئەم بڕیاردانەش ئەوەیە کە هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ خواو، بەهیچ جورێك، خۆیان هیچ یاسایەکی ژیانیان ـ هەرچەند بچوك بێت ـ دانەڕێژین. بەڵکو تەنها دەبێت شوێنکەوتووی پرۆگرامەکەی ئەو بن. وە تەنها لە یەك سەرچاوەشەوە وەربگرن کە **محمده** ﷺ، کە ئەوەش بەشی دووەمی روکنی شایەتمانە (**محمد** رسول الله)...

ئەمەیە ئەو ڕێسا تیۆرییەی کە ئیسلامی لەسەر بنیات دەنرێت. کە لەمەوە پرۆگرامێکی سەربەخۆی تەواو دێتەکایەوە. بەو مەرجەی بەراستیو تەواوی لە واقیعی ژیاندا بچەسپێنێت.

بەجۆرێك کە موسڵمان لە هەموو لایەنێکی ژیانیدا بەکاری بهێنێت. چ لایەنە شەخسییە خۆیی یەکانی بن، ئەو لایەنانە بن کە لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا بەکاریان دەهێنێت. لە (دار الأسلام) دابن، یا لە دەرەوەی. هەروەها لە هەموو جۆرە پەیوەندنیەکانی تری کۆمەڵگەی ئیسلامیو کۆمەڵگەکانی تر.

# ڕەنجی موسڵمان و کۆمەڵگەی جاهیلی

ئیسلام ـ وەکو ووتمان ـ وەنەبێت لە"تیۆر"ێکدا دەربکەوێت‌و بەس، کە هەرکەس وویستی وەری بگرێت‌و، پەرستنەکانی جێبەجێ بکات‌و، لە هەمان کاتیشدا شوێنکەوتووەکانی هەر بە ئەندامێتی لەو کۆمەڵگە جاهیلییە بزوێنەرەدا بمێننەوە. کە لە واقیعەکەیاندا هەیە. چونکە مانەوەیان بەو شێوەو لەو کۆمەڵگەیەدا ـ هەر چەند زۆربن ـ ناتوانن" ئیسلامێکی واقیعی" بهێننەدی. چونکە ئەو ئەندامانەی "ئیسلامێکی تیۆریانە" یان وەرگرتووە ـ کە خۆیان ئەندامن لە پێکهێنانی ئەو کۆمەڵگە جاهیلییەی تێیدا دەژین بەردەوام ناچار دەبن کە داواکارییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بهێننەدی.. بەردەوامیش لە جوڵانەوەیاندا ـ بیانەوێت یان نەیانەوێت، هۆشیارانە یان بێئاگایانە ـ خەریکی نەهێشتنی پێداویستبیە سەرەکبیەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگەیەن‌و، لە هەوڵدانێکی بەردەوامدان بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەم‌وکورتیانەی کۆمەڵگەکە هەنی.. وە بەردەوامش بەرگری لە قەوارەی ئەو کۆمەڵە دەکەن‌و دژی ئەو هۆیانە دەبنەوە کە هەڕەشە لە بوونی ئەو کۆمەڵگە جاهیلییە دەکات. چونکە خۆیان هێشتا ئەندامێکی لەشی ئەو کۆمەڵگەیەن. گومانیشی تێدانیە کە ئەندامێکی لەش ـ بیەوێت یان نەیەوێت ـ خزمەتی هێنانەدی خواستەکانی ئەو لەشە دەکات. جا ئەوانیش مادام بەشێکن لەو کۆمەڵگە جاهیلییە هەروا دەمێننەوە. واتە ئەو (موسڵمانە تیۆریانە) بەردەوام ـ بە کردەوە ـ هەوڵی پتەوکردنی کۆمەڵگەیەکی جاهیلی دەدەن کە هەر خۆیان "تیۆریانە" هەوڵی لابردنی دەدەن. هەروا بەردەوامیش دەمێننەوە تێیداو، دەبنە سێڵی (خانە)ی زیندووی لەشی ئەو کۆمەڵگەیەو، خزمەتی مانەوەو گەشەدانی دەکەن. چونکە هەرچی زانیاری‌و چالاکی‌و ووزەی خۆیان هەیە دەیخەنەکار تا ئەو بەهێزتر بێت. ئەمە لەجیاتی ئەوەی ـ وەك ئیسلامەکەیان داوایان لێ دەکات ـ جوڵانەوەو چالاکی‌و هەموو ووزەی

خۆیان بخەنە كار بۆ ریشەكێش كردنی كۆمەڵگەی جاهیلیو بنیاتنانی كۆمەڵگەی ئیسلامی!!!

قابیل نەبوو هەر دەبوو لە سەرەتاوە رێسای تیۆری ئیسلام (واتە عەقیدەكەی) لە كۆمەڵەیەكی بزوێنەرو پتەودا، دابمەزرێت.. چار نەبوو، هەر دەبوو لەنێو جەرگەی كۆمەڵگەی جاهیلییەوە كۆمەڵەیەكی بزوێنەرو پتەو دابمەزرێت. كە سەربەخۆو جیاواز بێت لەو كۆمەڵگە بزوێنەرو خۆگرەی جاهیلی، كە هەوڵی دەدا ئیسلام لە ناخەوە هەڵكێشێت. وە هەردەبوو تەوەری سەركردایەتی ئەو كۆمەڵە نوێیەش سەركردایەتییەكی نوێ بیكات، كە پێغەمبەر بوو ﷺ هەروەها لە هەموو سەركردایەتییە ئیسلامییەكانی تری پاش ئەویش. كە ئاواتیان گێڕانەوەی خەڵكی بوو بۆ خوایەتیو پەروەرگارێتیو دۆستایەتی (الولاء)، بۆ دەسەڵاتدارێتیو فەرمانڕەواییو شەریعەتەكەی خوا. وە هەر دەبێت ئەو كەسەی شایەتمانی (لا الـه الا الله محمد رسول الله) دێنێت وەلائی خۆی لە كۆمەڵگە جاهیلییەكەی بسەنێتەوەو، لەژێر ركێفی سەركردایەتی ئەو كۆمەڵە جاهیلییە دەرچێت كە خۆی بەشێك بووە لێی ـ جا ئیتر ئەو سەركردایەتییە بە هەر شێوەیەك بووبێت وەك سەركردایەتی قەشەو بطریك و سیحربازو جادوگەرو.. یان بەشێوەی سەركردایەتی سیاسیو كۆمەڵایەتیو ئابوری. وەك ئەوەی لە قورەیشدا هەبوو. هەروەها هەردەبوو ئەو كەسە وەلائی خۆی بە تەواوی بداتە دەست كۆمەڵە بزوێنەرە ئیسلامییە نوێكەو، سەركردایەتییە نوێكەی.

هەر لە سەرەتاوە .. هەر لە یەكەم هەنگاوی هاتنی موسڵمانەوە بۆ نێو ئیسلام.. هەر لەوساتەوە كە شایەتمانی (لا الـه الا اللـه محمد رسـول اللـه)ی تێدا دەهێنرا. مومكین نەبوو، هەر دەبوو هاتنە نێو ڕیزی كۆمەڵە نوێكەی ئیسلامەوە بەو جۆرە بێت. چونكە قابیل نیە هەردەبێت بوونی كۆمەڵگەی ئیسلامیو هێنانەكایەوەی، هەر بەو شێوەیە دەست پێدەكات. كۆمەڵگەی ئیسلامی هەر بەوەندە پێك نایەت رێسا تیۆرییەكەی لە دڵ ودەرونی شوێنكەوتوانیدا ـ هەرچەند زۆربن ـ دابین ببێت. مادام نەبوونەتە كۆمەڵەیەكی گونجاو پڕ یارمەتی بەهێزی خاوەن شەخسیەتێكی

سەربەخۆی وا کە ئەندامەکانی ـ وەك ئەندامانی لەشی زیندەوەرێك ـ هەوڵی داکوتانو پتەوکردنو فراوانکردنی کۆمەڵەکەیان بدەنو، بەرگری لەمانەوەو گەشەکردنی قەوارەکەی بکەن لە هەموو هۆیەکی داخورانو، لە هەموو مەترسییەك کە دێتە ڕێی بوونو مانەوەی. هەروەها هەتا هەمووشان پێکەوە لەژێر سەرکردایەتییەکی سەربەخۆدا نەکەونە کار، سەکردایەتییەکی وا جیاواز بێت لە سەرکردایەتی کۆمەڵگەی جاهیلیو دەبێت تەنها ئەو سەرکردایەتییە تەوجیهیان بکاتو نەخشەی مانەوەو پتەوکردنی قەوارەیان دابڕێژێتو، پلان بۆ ڕیشەکێشکردنی بوونی جاهیلییەت دابنێت..

بەو جۆرە ئیسلام هاتەکایەوە.. لە ڕێسایەکی تیۆریانەی تەواوی وادا دەرکەوت کە لە هەمانکاتیشدا کۆمەڵەیەکی بزوێنەری پتەویشی لەسەر دامەزرابوو، کە سەربەخۆو جیاوازبوو لە کۆمەڵگەی جاهیلیو، ڕووبەڕووی جاهیلییەتەکەش ڕاوەستابوو... هەرگیز ئیسلام لەشێوەیەکی "تیۆریانە"ی ووشکی دوور لەبوونی واقیعیدا دەرنەکەوتووە. هێنانەوەی ئیسلامیش جارێکی تر تەنها بەو شێوەیە دەبێتەوە. بنیاتنانەوەی ئیسلام لەژێر سایەی کۆمەڵگەیەکی جاهیلیدا ـ لەهیچ کاتو شوێنێکدا ـ مومکین نیە بهێنرێتەوە دی. وەك کە مومکینیش نیە بێ یاساو نەخشە سروشتییەکەی خۆی بێتەوەدی. ئەو نەخشەیەی کە خۆی بۆ پێکهێنانە بزوێنەرەکەی خۆی دایڕشتووە.

کەوابوو ئیسلام لەکاتێکدا نەتەوەیەکی موسڵمان بنیات دەنێت، لەسەر ئەو ڕێسایەو بەگوێرەی ئەو پرۆگرامە بنیاتی دەنێت.. لەسەر بناغەی کۆمەڵەیەکی بزوێنەری پتەو دایدەمەزرێنێتو، هەموو پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کۆمەڵەیە دەگۆڕێت بە پەیوەستی عەقیدە ـ کەمەبەستی لەوەوە دیارخستنی "مرۆڤایەتی مرۆڤ"و بەهێزکردنیو دابین کردنێتی، هەروەها ئەو سیفەتەی "مرۆڤایەتی مرۆڤ" بەسەر هەموو لایەنەکانی تریدا بەرزدەکاتەوە، ـ بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش تەنها بەپێی پرۆگرامەکەی خۆی هەنگاوی دەنا، لەهەموو ڕێساو تەعلیماتو ئەحکامو یاسایەکیدا.

چونکە مرۆڤ لە چەند سیفاتێکدا هاوبەشە لەگەڵ ئاژەڵدا بگرە لەگەڵ بێ

گیانەکانیشدا ـ بۆیە هەندێك لە هەڵگران بیری "نەفامی زانستی" ئەمڕۆ لە حوکمی مرۆڤدا بەهەڵەدا چوون...جارێك مرۆڤ وەکو ئاژەڵەکانی تر تەماشا دەکەن. جارێکی تر هەروەکو بێگیانەکانی تر تەماشا دەکەن! بەڵام مرۆڤ لەگەڵ ئەوەشدا کە لە (هەندێك) سیفاتدا لەگەڵ ئاژەڵ، یان لەگەڵ بێگیانەکاندا هاوبەشە، لە هەمان کاتیشدا "سیفات"ی تایبەتی تریش هەیە کە لەوانی جوێ دەکاتەوەو، سیفەتێکی سەربەخۆی دەداتیو دەیکاتە زیندەوەرێکی بێوێنە. ئەو سیفەتانەش کە لەم دوایی یەدا خاوەنانی "نەفامی زانستی" ناچارکرد دان بە حەقیقەتە واقیعییەکەداو، گەردن لە بەردەمیدا کەچ بکەن. بێئەوەی خۆیان حەزیان بەو ئەنجامە کردبێت[1].

---

١) پێشەوای ئەوانەش (جولیان هاکسلی)یە. کە یەکێکە لە پەیڕەوانی (داروونییزمی نوێ).

# توانــەوە لـە یەکـتـردا..

دامەزراندنو پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر بناغەی پەیوەستی ڕەگـەزو خاكو ڕەنـگ وزمـانو بەرژەوەندییـە زەمینیـە نزیکـەکانو، هەرێمگـەرێتی بـێنرخ دانەمەزراوە، بەڵکو تەنها لەسەر بناغەی پەیوەسـتی عەقیـدە بـووە... دەیوویسـت "سـیفەتەکانی مرۆڤــ" لــە کۆمەڵگــەدا دەربخــاتو، گەشــەی پێبــداتو بــەرزی بکاتەوە... دوور لە بایەخـدان بـەو سـیفەتانەی کـە لەگـەڵ ئـاژەڵو بێگیانەکانـدا هاوبەشــە.. ئــەنجامی ئــەو هۆیانەیــە وای کــردووە کــە کۆمەڵگــەی ئیســلامی کۆمەڵگەیــەکی کــراوە بێــت بــەرووی هــەموو جــۆرە ڕەگــەزو میللــەتو ڕەنــگو زمانێکداو، دوور بێت لە هەموو ئەم مەبەستە ئاژەڵییە بێنرخانە!

ئیسـلام هـەموو ئـەم شـتە جیاوازانـەش لـە قـەوارەی کۆمەڵگـەی ئیسـلامیدا توانەوەو. وای داڕشت کە تەنزیمێکی پتەوی زۆر سـەرکەوتوانەی پـێ هێنایـەدی، لـە ماوەیەکدا کە لەچاو خۆیدا، کەمە. ئـەم کۆمەڵـە بچـوکە سەرسـوڕهێنەرە گونجـاوو سـازاوەش بـوو. کـە شارسـتانێتییەکی زۆر گـەورەو مـەزنی هێنایـە کایـەوە، کـە سەرجەمی هەموو ووزەی مرۆڤی زەمانی خۆی تێدا خستەکار، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ناوچەکان لێکەوە دووربـوونو هۆکـانی هاتووچـۆ کـەمو سـادەبوون. لـەو کۆمەڵگـە ئیسلامییە سەرکەوتووەدا عەرەبو فارسو شامیو میسـریو مـەغریبیو تـورکیو چینیو هیندیو ڕۆمانیو ئیغریقیو ئەندۆنوسیو ئەفریقیو...هتد ڕەگەزەکانی تێدا کۆبووبوونەوەو، سیفاتی میللی هەمووشیان کۆبـۆوەو تێکـەڵ یـەك بـووو، پێکـەوە سازانو بوونە هۆی بنیاتنانی کۆمەڵگەی ئیسلامیو شارستانێتی ئیسـلامی.. هـیچ کاتێك.. هیچ ڕۆژێك ئـەم شارسـتانێتییە گـەورەو مەزنـە شارسـتانێتی "عـەرەبی" نەبووە. بەڵکو هەمیشە "ئیسلامی" بووە. وە هیچ کاتو هیچ ڕۆژێکیش "نەتەوەیی" نەبووە، بەڵکو هەمیشە "عەقیدەیی" بووە هەموو میللەتو ڕەگەزەکان بە پەیوەستی

خۆشەویستیو یەکێتی هیواو مەبەست، یەکسان بوو بوون. بۆیە هەموویان هەموو تواناو ووزەی خۆیان خستەکارو، بەرزترین سیفەتی ڕەگەزو میللەتی خۆیان دەهێناو دەیانخستە ژێر خزمەتی ئەو کۆمەڵگەیەی کە هەموویان یەکسانانە بوو بوون بە ئەندامی. چونکە پەیوەندییەکی پتەو هەموویانی یەکخستبوو، ئەویش ئەوەبوو کە هەموویان هەموو مەبەستێکیان تەنها خوابوو.. لە هەمانکاتیشدا گیانی مرۆڤپەروەرییەکەشیان بێئەوەی بەربەستێکی بێتەڕێ، دەردەکەوت.. ئەمەش هەرگیزاو هەرگیز لە هیچ کۆمەڵگەو شارستانیتییەکی تردا ـ بە درێژایی مێژوو ـ دەرنەکەوتووە!!!

گەورەترینو بەناوبانگترین کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ـ لە مێژووی کۆندا ـ کۆمەڵگەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان بوو.. لەڕاستیدا زۆر ڕەگەزو ڕەنگو زمانو تەبیعەتی جیاوازی لەخۆدا کۆکردبۆوە. بەڵام ئەمانە هەمووی لەسەر بناغەی "پەیوەستی مرۆڤایەتی"دا نەمەزرابووو، هیچ پەیوەستێکی گرنگی وەك عەقیدەی تێدا نەبوو. بەڵکو بریتی بوو لە کۆکردنەوەیەکی چینایەتی. وەك چینی بەگزادەو چینی کۆیلە. ئەمە لەناوەوە، لە دەرەوەش لەسەر بناغەی ئەوە دامەزرا بوو کە ڕەگەزی ڕۆمانی ـ بە شێوەیەکی گشتی ـ دەبێت سەر کردەو ڕێ پیشاندەر بێتو. ڕەگەزەکانی تر هەموو دەبێت پەرستیاری ڕۆمانی بن. جا چ کەم چ زۆر. لە هیچ شێوەیەکیشدا نەیتوانی بگاتە ئەو ئاسۆ بڵندەی کۆمەڵگەی ئیسلامی گەیشتبوێ. هەروەها نەشیتوانی ئەو بەرهەمە وەدەست بهێنێت کە کۆمەڵگەی ئیسلامی وەدەستی هێنا.

لە مێژووی نوێشدا کۆمەڵگەی تر زۆر دروست بوون، بۆ نمونە: کۆمەڵگەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، بەڵام ئەمیش هەروەك کۆمەڵگەی ڕۆمانی بوو، چونکە ئەم بریتی بوو لە میراتگری ئەو! ئەمیش بریتی بوو لە کۆمەڵگەیەکی نەتەوەگەری چەوسێنەر. لەسەر ئەو بناغەیە دروست بووبوو کە نەتەوەی ئینگلیزی دەبێت سەرکردەو ڕێ پیشاندەر بێت. هەروەها لەسەر چەوسانەوەی ئەو وولاتە داگیرکراوانە (مستعمرات) دامەزرابوو کە خستبوونیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.. ئیمپراتۆریەتی یە

ئەوروپایی یەکانی تریش هەروا بوون.. ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیاو پرۆتوغال، ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا. هەموویان هەر لەو ئاستە نزمە چەوسێنەرە بێزراوەدا بوون... کۆمۆنیزمیش وویستی کۆمەڵگەیەك پێکەوە بنێت... بەڵام لەسەر بناغەیەکی تر! هەوڵیدا بەربەستی رەگەزو نەتەوەو خاك وزمان ورەنگ ببڕێت. بەڵام نەیتوانی لەسەر رێسای "مرۆڤایەتی"یەکی گشتی، کۆمەڵگەکەی دابمەزرێنێت. بەڵکو لەسەر رێسای "چینایەتی"دایمەزراند. کەئەم کۆمەڵگەیەش بریتی بوو لە ڕووەکەی تری کۆمەڵگە کۆنەکانی رۆمان. ئەو کۆمەڵگەیەی لەسەرئەوە دروست بوو بوو کە سەرکردەو رێ پێشاندەر تەنها لە چینی چەوساوە "پرۆلیتاریا"دا دەبێت. ئەو هەستەش کە لەنێوان ئەندامەکانیدا پەیدابوو ـ تا ئێستاش ـ بریتی بوو لە رق وکینەو بوغزاندنی چینەکانی تر! ئەم کۆمەڵگە بچوکە رقن‌و بوغزنەش، هەرچی بەرهەمێکی وەدەست هێنا بریتی بوو لە پیسترین‌و خراپترین مرۆڤایەتی.. چونکە کۆمەڵگەی کۆمۆنیزم هەر لە سەرەتایەوە لەسەر ئەوە دروست دەبێت کە بایەخ تەنها بەسیفەتە ئاژەڵییەکان دەدات‌و، گەشەی پێدەدات‌و، مسۆگەریان دەکات! لەو لایەنەوە کە گوایە "داواکارییە سەرەکییەکان"ی مرۆڤن ـ (خواردن و خانوو سێکس = جنس). کە ئەمانە داواکاری سەرەکی ئاژەڵن. ئەمەش لەو روانگەوە بوو کە گوایە هەموو مێژووی مرۆڤایەتی بریتی بووە لە گەڕان‌و وێڵ بوون. بەدووی خواردندا!!

تەنها ئیسلام بوو ـ وە هەتا ئێستاش تەنها هەر ئەو هەیە ـ بتوانێت بە پرۆگرامە خوا وویستییەکەی خۆی بەرزترین سیفەتی مرۆڤ دەربخات‌و گەشەی پێبدات‌و، لە بەرزترین سیفەتی مرۆڤ دەربخات‌و گەشەی پێبدات‌و، لە بنیاتنانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەرزی بکاتەوە... ئەو کەسانەی لە ئیسلام لادەدەن بۆ پرۆگرام‌و ڕێبازی تر، کە لەسەر ڕێسای عەقیدە دانەمەزراون (جا ئیتر ئەو رێسایە نەتەوایەتی بێت یان رەگەزپەرستی یان خاك یان چینایەتی.. هتدی ئەم هەستە لاوازانە).. ئەو کەسانەی لەڕاستیدا دوژمنی راستەقینەی مرۆڤن! هەر ئەو کەسانەشن کە ناهێڵن ئەم مرۆڤە لەم گەردونەدا بەو سیفەتانەوە بژی، کە خوا لەسەری دروستی کردوون. وە ناشیانەوێت ئەم کۆمەڵگەیەی ئێمە سوود وەربگرێت لە وزەو توانای میللەت‌و

سیفەتو تاقیکردنەوەکانیان ـ بەشێوەیەکی گونجاوی رێكو پێك... نایانەوێت لێهاتوویی ئەندامانی رەگەزو زمانو نەتەوەو میللەتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی، یەك بخرێن.. بەو هیوایەی ئەو ووزانە بە لێکدابراوی هەریەکە لە کەنارێکەوە بە لاوازی ئیش بۆ خۆی بکات ئا ئەمانەش خوا لە باسیاندا دەفەرموێت: **(قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ١٠٣ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ١٠٤ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ١٠٥ ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ١٠٦)** (الكهف)= بلێ : پێتان بلێم ئەو کەسانە کێن کە لە کاروکردەوەیاندا زەرەرمەندترینن خۆشیان وادەزانن کاری چاکەو رەوایان کردووە.. ئەوانە، ئەوانەن کە باوەڕیان بەنیشانەو ئایەتی خوا نەبووو، باوەڕیان بەوە نەبوو کە دەگەڕێنەوە لای خوا، جا هەموو کردەوەی ئەوانە، وەك ئاژەڵی ئاوساوو فشۆڵە (کە خاوەنەکەی وا دەزانێت قەڵەو بووە)، ئێمەش لە ڕۆژی دواییدا هیچ کێشو نرخێك بۆ کارو کردەوەکانیان دانانێین. ئەوانە مادام باوەڕیان نەهێناو گاڵتەو بەزمیان بە ئایەتو نێرراوەکانی خوا دەکرد، تەنها پاداشتی ئەوانە دۆزەخە.

# جیــهاد

ئیمامی (ابن القیم) لەکتێبی (زاد المعاد)ەکەیدا جیهـادی ئیسـلامی بـە کـورتی باسکردووە لەو بەشەدا کە ناوی لێناوە (فصل في هدية مع الكفار والمنافقين من حيث بعثه الى حيث لقي الله عزوجل) کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

یەکەمین جار کە خوای پەروەردگار سروش (وەحی) بـۆ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی پێدا کە بەناوی خواوە دەست بکات بەخوێندنەوە، بەناوی ئەو خوایەوە کـە دروسـتی کردووە، کە ئەمەش سەرەتای پێغەمبـەرێتی بـوو، وای فـەرمان پێکـرد کـە تـەنها بۆخۆی بخوێنێت، چونکە لەوکاتەدا فەرمانی ئەوەی پێ نـەکرد کـە خـەڵکی ئاگـادار بکاتەوە. دوایی ئایـەتی (**يا أيّها المُدَّثِّر**) ی بۆهـات. بـە ئایـەتی (**إقرأ**) کـردی بـە پێغەمبەرو بەئایەتی (**يا ايها المدثر**)یش فەرمانی پێـدا کـە خـەڵکی تێبگـەیێنێت.. پاشان فەرمانی پێدا کە خزمو کەس‌وکارە نزیکەکانی تێبگەیێنێت. پاشان هۆزەکـەی. پاشـان خـەڵکی.. بۆیـە سـیانزە سـاڵ بانگەوازەکـەی هـەر بـە شـێوەی ڕاگەیانـدن بڵاودەکردەوە، بێ‌ئەوەی بکەوێتە شـەڕو مەسـەلەی (جزیـة) وەرگرتنـەوە. فـەرمانی ئەوەی پێدەدا کە بە ئارامو خۆگرو لێبوردوو بێت. پاشـان مۆڵـەتی درایـە کـە کـۆچ بکات، پاشان مۆڵەتی شەڕکردنی پێدرا. پاشان خوای گەورە فەرمانی پێدا کە بچێت بەگژ ئەوانەی دێن بەگژیاندا، ئەو کەسانە بکوژێت کە هەوڵی کوشتنی ئەمان دەدەن. پێی ڕاگەیاند کە واز لەو کەسانە بهێنێت کە لەمان دوورەپەرێز وەستاونو بەگژیانـدا نایەن. پاشان فەرمانی پێدا کە لەگـەڵ هـەموو (مشـرك)ەکاندا بجـەنگێت، تـا ئـەو ساتەی کە بەرنامەو پرۆگرامی خواوویستی هەموو لایەك دەگرێتەوە....

ئەوجا کافرەکان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ پاش فەرزکردنی جیهاد ـــ بـوون بـە سێ بەشەوە:

خاوەن پەیمان (اهل الصلح)، شەڕانی (اهل الحرب) و، خاوەن ئایینەکانی تـر (اهـل

الذمة).

خوای گەورە فەرمانی پێدا کە ـ مادام خاوەن پەیمانەکان لەسەر پەیمانی خۆیان دەمێننەوە ـ ئەمیش پەیمان نەشکێنێت‌و هەڵوێستی ئاشتیانەی بەرامبەریان هەبێت. جا ئەگەر ئەوان پەیمانیان شکاندو ئەم مەترسی خیانەتی لێکردن، پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوەو لەگەڵیاندا بجەنگێت ـ دوای ئەوەی ئاگاداریان دەکاتەوە ـ هەروەها فەرمانی پێدا کە بجەنگێت لەگەڵ هەر کەسێك ـ کە هەر لەخۆیەوە ـ پەیمانەکەی هەڵ دەوەشێنێتەوە.. پاشان کە سورەتی (البراءة) هاتە خوارەوە حوکمی ئەو سێ بەشەی ـ بەم جۆرە ـ تێدا بوو:

١. فەرمانی پێدا کە دژی دوژمنانی ئیسلام شەڕ کات (لەوانەی ـ خاوەن کتێبی ئاسمانین‌و دوژمنداریێتی لەگەڵ دەکەن) تا سەرەنجام یا دێنە ریزی ئیسلامەوە یا (جزية) دەدەن.

٢. فەرمانی پێدا کە دژی کافرو دووڕووەکان بجەنگێت‌و، توندو تیژی بنوێنێت بەرامبەریان. بۆیە ئەویش شمشێری لە کافرەکان هەڵکێشاو بەزمان‌و بەڵگەش بەرامبەر دووڕووەکان وەستا.

٣. فەرمانیشی پێدا کە لە هەموو جۆرە پەیمانێکی کافران دوورکەوێتەوەو واز لە پەیمانیان بهێنێت.

ئەوجا خاوەن پەیمانەکانی کرد بەسێ بەشەوە:

١- بەشێکیان فەرمانی پێدا کە لەگەڵیاندا بجەنگێت، ئەویش ئەمانە بوون کە پەیمانەکانیان ـ لە تەرەفی خۆیانەوە ـ هەڵوەشاندبۆوە. ئەمیش شەڕی لەگەڵیاندا کردوو بەسەریاندا زاڵ بوو.

٢- ئەوانەی کە پەیمانی کاتی (مؤقت) ی لەگەڵیان بەستبوو، پەیمانیشیان نەشکاندبوو. خوای گەورە فەرمانی پێدا کە لەگەڵ ئەمانە ئاشتیخوازانە بجولێتەوەو، ماوەی پەیمانەکەیان لەگەڵدا تەواو بکات.

٣- ئەوانەی کە نە پەیمانیان هەبوو نە شەڕیشیان لەگەڵدا دەکرد، هەروەها

ئەوانەش کە پەیمانی ماوەنادیاریان لەگەڵ پێغەمبەردا هەبوو. حوکمی ئەمانەش وابوو کە ماوەی چوار مانگیان بداتێ، ئەگەر ماوەکە تەواوبوو لەگەڵیاندا بجەنگێت.

لەسەر ئەم نەخشەیە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هاولوێستی خۆی دیاری کرد:

چوو بەگژ ئەوانەدا کە پەیمانیان شکاند، چوار مانگیشی مۆڵەتدا بەوانەی پەیمانی ماوەنادیاری لەگەڵیدا هەبوو هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە پەیمانێکی لەگەڵیاندا نەبوو. هەر بەپێی فەرمانی خوای گەورەش پەیمانی ئەو کەسانەی بردەسەر کە پەیمانەکەیان نەشکاند.

ئەمانەش هیچیان لەسەر کوفر نەماوەو موسڵمان بوون.

بەرامبەر خاوەن ئایینە ئاسمانیەکانیش: جزیەی لەسەر دانان.....

ئەوجا هەڵوێستی کافرەکان ـ بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ دوای هاتنە خوارەوەی سورەتی (البراءة = التوبة) سێ شێوە بوو:

شەڕانی، خاوەن پەیمانەکان، خاوەن ئایینە ئاسمانیەکان. پاشان کە زیاتر ئیسلام بڵاوبووەوەو، خاوەن پەیمانەکانیش موسڵمان بوون. ئەوجا کافرەکان بوون بەدوو بەش:

١. خاوەن ئایینە ئاسمانیەکان کە شەڕخواز بوون.

٢. ئەو شەڕانیانەی لێیان بەحەزەر بوون.

کەوا بوو هەڵوێستی خەڵکی سەرزەمین ئەم سێ بەشە بوون:

١- موسڵمان: ئەوی باوەڕی پێهێناوەو شوێنی کەوتووە.

٢- ئاشتی وویستی هێمنو سەلامەتخواز.

٣- ترساوێکی شەڕانی.

دەربارەی دووڕووەکانیش خوا فەرمانی پێدا کە سەرزارەکییەکەیان لێوەرگرێتو ئەوی پەنهانیشی دەکەن بیداتە دەست خوا.. وە لە هەمان کاتیشدا بە بەڵگەی بنبڕ لەگەڵیاندا بدوێت. پاشان روویان نەداتێ. پاشان توندووتیژ بێت

لەگەڵیاندا. بەردەوامیش بێت لە مژدە پێدانو ترساندنیان..

خوای گەورە نەشیهێشت نوێژی جەنازە لەسەر مردووەکانیان بکرێت، یا بچێتە سەرگۆڕی مردووەکانیان ـ ئەوەشی پێ ڕاگەیاند کە ئەگەر داوای لێبوردونیشیان لە خوا بۆ بکات خوای گەورە لێیان خۆش نابێت.

ئەمە بوو هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بێ باوەڕو دووڕووەکاندا.

لەم کورتە باسە جوانەی سەرەوەدا قۆناغەکانی جیهادی ئیسلامی دەردەکەوێت، هەروەها چەندین سیفاتی گرنگو سەرەکی ئاشکرا دەبێت کە بە بەردی بناغەی پرۆگرامی جموجۆڵو بزوتنەوەی ئەم دینە دادەنرێن.. ئەم سیفەتانەش پێویستە زۆر سەرنج بدرێنو زۆر لێیان بکۆڵرێتەوە.

وا ئێمەش ئەوەندەی بۆمان بکرێت هەندێك لەو سیفەتانە دەستنیشان دەکەین:

## سیفەتی یەکەم: الواقعية الجدية:

ئیسلام بزوتنەوەیەکە، کە بەرەنگاری واقیعی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی دەبێتەوە. بەرەنگاری کردنەوەشی بە شێوەیەکی پڕاوپڕی هاوکێش دەبێت.. بزوتنەوەی ئیسلامی کاتێك ڕووەو ڕووی جاهیلییەتێك دەوەستێتەوە کە خاوەن ئایدیۆلۆژیەو ڕژێمێکی کردەوەیی واقیعی لەسەر دامەزراوەو، پشتی بەدەسەڵاتێکی خاوەن هێزی ماددی بەستووە.. کاتێك بەرامبەر ئەم واقیعە دەوەستێتەوە، بە جۆرێکی وا دەوەستێتەوە کە پڕاوپڕی بێتو هاوکێشی هەموو لایەنێکی بێت. بۆیە دەبینین کە ڕاستکردنەوەکەی بیروباوەڕو عەقیدەی خەڵکی بە بانگەوازکردن وروون کردنەوەو شیکردنەوەی هێمنانە دەکات (واتە بە خەباتی سیاسیانە ـ الكفاح السياسي) وە بە ڕێگای بزوتنەوەو جیهادیش ـ کە بەکارهێنانی هێزە ـ(واتە خەباتی سەربازیانە ـ الكفاح العسكري) تێ دەکۆشێت بۆ ریشەکێش کردنو لابردنی ئەو سیستم دەسەڵاتدارێتییەی لەسەر ئەو بیروباوەڕو عەقیدانە دامەزراون. ئەو ڕژێمەی کە ناهێڵێت بانگەوازە ئاشتیانەکەی ئیسلام بگاتە خەڵکی تا بیروباوەڕو عەقیدەیان

ڕاست کاتەوە. ئەو رژێمەی بە ئـاگرو ئاسـن وگـومڕاکردن خەڵکەکـەی وا لێکـردووە غەیری خوا بپەرستن.

کەوابوو بزوتنەوەی ئیسلامی لەرووبەڕوو بوونەوەیدا لەگەڵ دەسەڵاتداریتیو هێزی ماددی تەنها ڕێگەی بانگەوازو ڕوونکردنەوەی هێمنانـە ناگرێتـە بـەر هـەروەکو کـە کوتەکیش بەکار ناهێنێت بەرامبەر زەمیرو ناخی خەڵکی بۆ باوەڕهێنان. چونکە ئەو دوو شـێوازە (بـەکارهێنانی ڕێگـای هێمنانـە دژی دەسـەڵاتداریتیو، بـەکارهێنانی کوتەك بەرامبەر بیروبـاوەڕ) لـە پڕۆگرامـی ئـەم دینـەدا، هـەردووکیان وەکویـەکنو هەردووکیان هەر هەڵەن.

## سیفەتی دووەم : الواقعية الحركية:

سیفەتی دووەمی پڕۆگرامی ئەم دینە بریتیە لـە (الواقعيـة الحركيـة): ئیسـلام بزوتنەوەیەکەو چەندین قۆناغی تایبەتی هەیە. هەر قۆناغێکیش شێوەو گرتنی هـۆو پێداویستی خۆی هەیە. کـە لەگـەڵ بـارودۆخی تایبـەتی ئـەو قۆناغـەدا هـاوکێشو گونجاوە. هەروەها هەر قۆناغێکیش قۆناغی تری بەدوادا دێت کە ناوەرۆکی قۆنـاغی یەکەم تەسلیمی قۆناغی دووەم دەکات.

ئیسلام بەتیۆر بەرەنگاری واقیع ناکات، هـەروەها لـەهیچ قۆناغێکـدا بەچـەند شێوەو شێوازێکی سادەو مەبیو بەرەنگاری واقیع ناوەسـتێتەوە. ئـەو کەسـانەی کـە ئایەتی قورئان وەك بەڵگە دێننەو بۆ پڕۆگرامـی جیهـادی ئیسـلامی بەداخـەوە ئـەم سیفەتە سەرەکییە ناخەنە پێش چاویان، دەرك بە سروشتی ئەو قۆناغە ناکەن کە ئـەم پڕۆگرامەی پێدا ڕۆیشتووە، هەروەها وورد سەرنج نادەنـە ئـەو ئایەتـە قورئانیانـەی دەربارەی قۆناغە جیاوازەکان دەدوێن.. ئەوانە کارێکی زۆر نارێكو تێکـەڵو پێکـەڵ دەکەنو پۆشاکێکی نامۆ دەکەنە بەر پڕۆگرامەکەی خوا. چونکە ئایەتە قورئانیـەکان لەغەیری شوێنی خۆیاندا بەکاردێنن کەلەگەڵ سادەترین ڕێسایدا ناگونجێـت.. ئەوانـە هەر دەقێکی قورئانی دەبیننو دەزانن ئیتر ئەو دەقە کۆتا بڕیاری ئەم دینەیە.

ئەوجا ـ چونکە خۆیان رۆح‌و ژیری‌و دەرون بەزیوون‌و کەوتوونەتە ژێر تینی ئەو پاڵەپەستۆیەوە کە ئەو واقیعە پەڕپووتەو ئەو گەلە موسڵمانە ڕەشۆکیانە تووشیان کردوون، کە جگە لە ناوە (ئیسلامی)یەکەیان هیچی تریان پێ‌نەماوە ـ دەڵێن: ئیسلام تەنها لەپێناوی بەرگری لە خۆکردنیدا دەجەنگێت، بەم قسەیەش وادەزانن چاکەیەکی گەورە لەگەڵ ئەم دینە لە ئامانجەکەی خۆی دوور دەخەنەوە، کە بریتیە لەڕیشەکێش کردنی هەموو طاغوتێکی سەرزەمین‌و، گێڕانەوەی خەڵکی بۆ یەکخواناسی‌و رزگارکردنیان لە مرۆڤپەرستی! نەك بە کوتەك بەکارهێنان‌و زۆر لێکردنیان بۆ وەرگرتنی دینەکە.. نا بەڵکو بۆ لابردنی ستەمکاران. تا بوار بۆ خەڵك بکرێتەوە کە بە سەربەستی خۆیان لەم دینە بکۆڵنەوە.. ئەمەش ئەستەمە بهێنرێتەدی تا ئەو رژێمە سیاسیانە نەڕوخێنرێن کە حوکم دەکەن، یان تا ناچار دەکرێن ملکەچی دەسەلاتی ئیسلامی بن‌و جزیة بدەن‌و جاڕی تەسلیم بوون بدەن‌و واز لە جەماوەری خەڵکەکە بهێنن تا سەربەستانە ئەم عەقیدەیە دیراسە بکەن.. ئەوجا سەرپشك (مخير) کرێن. یان وەری دەگرن یان وەری ناگرن.

## سیفەتی سێیەم:

بەردەوام بوونی ئەم بزوتنەوەیەو، ئەو شێوەو شێوازانەی بەردەوام دێنە کایەوە

ئەم ئایینەی لە رێسای دیاریکراوی خۆی نەدەبردە دەرەوەو ئامانجە کێشراوەکەشی نەدەشێواند. ئیسلام هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنیەوە ـ جا ئایا لەگەڵ خزمدا دوابێت، یا لەگەڵ قورەیش، یا لەگەڵ عەرەب، وەیان لەگەڵ هەموو مرۆڤی جیهان ـ دەربارەی یەك رێسای سەرەکی لەگەڵیاندا دەدوا. داوای ئەوەی لێ‌دەکردن کە لەیەك ئامانجدا یەکاندگیر ببنەوە کە بریتیە لە وازهێنانیان لە مرۆڤپەرستی‌و پاشان وەرگرتنی یەکخواناسی‌و خواوویستی تێیدا. هەر ئەم رێسایەش بوو، ببوە تەوەرەی سەرەکی بانگەوازەکە، کە بەهیچ جۆرێك موساوەمەی لەسەر نەدەکراو لێی لانەدەدرا.. ئەوجا دەکەوتە چەسپاندنی ئەم یەك ئامانجە، بە پێی نەخشەیەکی کێشراوی وورد، کە بە

چەند قۆناغێکدا دەڕۆیشت. هەر قۆناغەش شێوەو هۆزی نوێی خۆی هەبوو.

## سـیفەتی چـوارەم :

ئەمەش لەو یاسا دامەزراوو نەگۆڕەدا دەردەکەوێت کە بۆ پەیوەندییــەکانی نێـوان کۆمەڵگەی موسڵمانو کۆمەڵگاکانی تر دارێژراوە ـ وەکو ئەو شێوە ئاشـکرایەی کـە لەو کورتە باسەی سەرەوەدا دەردەکەوێت کە لەکتێبی "زاد المعاد"ەوە وەرمان گرتبوو ـ کە ئەو دامەزراویو نەگۆڕییەش لەوەوە وەردەگرێت کە ئیسلام دینی خوایەو تـەنها ئەو سەرچاوەی یاسای جیهانیە. کە پێویستە لەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی یان بێنـە ژێر سایەیەوە، یان دەبێت هەڵوێستێکی ئاشتیانەیان ببێت بەرامبەری. چونکە نابێت بەربەستی هیچ رژێمێکی سیاسی، یان هێزێکی ماددی بەرەنگاری بانگەوازی خـوایی بووەسـتێتو ڕێی لـــێ بگرێـت، وە نابــێ بــەهیچ جـۆرێکیش دژی بوەسـتن! هــەر کەسێکیش پێچەوانە جولایەوە بەرامبەری پێویستە ئیسلام لەگەڵیدا بجەنگێت تا یان ئەوەتا لەناوی دەباتو نایهێڵێت. وە یان جاڕی تەسلیم بوونی پێ دەدات!.

ئەو ژیریو دەرون بەزیوانەی دەربارەی "جیهادی ئیسلامی" دەنووسن، تا "تـاوان" لە ئیسلام دووربخەنەوە، دوو مەسەلەی سەرەکیان تێکەڵ یەك کردووە: مەسەلەی ئەو بەرنامەیەی کە ئەم دینە دەیگرێتەبەر دەربارەی ناچارنەکردنی خـەڵکی لـەوەرگرتنی ئەم عەقیدەیە. لەگەڵ مەسەلەی ئەو بەرنامەیـەی داڕشـتووە بـۆ ریشـەکێش کـردن ولابردنی ئەو هێزە ماددییە سیاسیانەی لە رێدان. کە نـاهێڵن ئـەم دینـە بگـات بـە جەماوەر. ئەوانەی خەڵکی لە خواویستی دوور دەخەنەوەو ناچـاری مـرۆڤ پەرسـتی دەکەن.. ئەم دوو مـەسەلەیەش لێك دوورنو نابێ تێکـەڵ یـەك بکـرێن.. ئـەو جـۆرە کەسانە چونکە خۆیان لە لایەکەوە لێیان شـێواوەو لەلایـەکی تـرەوە دەیانـەوێ ئـەو دەرون بەزینەشیان داپۆشن! هەوڵی ئەوە دەدەن کە جیهـادی ئیسـلامی لـە"جـەنگی بەرگری لەخۆکردن"دا گیر بدەن.. بەڵام خۆ جیهـادی ئیسـلامی شـتێکی تـرەو هـیچ پەیوەندییەکی بەهۆو ئەنجامی ئەو شەڕوشۆڕانەوە نیە کە ئـەمرۆ لـەنێو کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیدا هەن.. هۆی جیهادی ئیسلامی پێویسـتە لـە سروشـتو رۆڵـی ئیسـلام خۆیەوە وەربگیرێت، لەو ئامانجە مەزنانەیەوە وەربگیرێت کە خوا بڕیـاری لەسـەرداون

باسی کردوونو، پێغەمبەریشی لەپێناویدا ناردووەو کردووشیەتی بە کۆتا پێغەمبەرو پەیامەکەشی کردووە بەکۆتا پەیام.

ئامانجی ئەم دینە رزگارکردنی "مرۆڤ"ی "سەرزەمین"ە لە مرۆڤ پەرستی ـ هەروەها لە ئارەزوپەرستی کە هەر بەشێکە لە مرۆڤ پەرستی ـ ئەمەش بە ئاشکراکردنی خوایەتی (الالوهیة)و پەروەردگاریّتی (الربوبیة)یەکەی خوایە بۆ گشت جیهان.. لەراستیدا تەنها ئاشکراکردنی پەروەردگارێتی خوا بریتیە لە شۆرشێکی گەورە دژی حوکمی مرۆڤ، لە هەر شێوەو جۆرو بارودۆخو سیستمێکدا بێت.. یا لە هەر شێوەیەکی حوکم کردنی مرۆڤدا بێت.. یان بە جۆرێکی تر بلێین حوکمی مرۆڤ لە هەر شێوەیەکی خوایەتیدا بێت.. چونکە هەر سیستمێك کە مرۆڤ خۆی بۆ حوکمی مرۆڤی تری وەکو خۆی داناوەو کردوێتی بە سەرچاوەی دەسەڵاتەکانی مرۆڤ، بریتیە لە بەخوا دانانی مرۆڤ، چونکە هەندێکیان دەبنە خوای هەندێکی تریان. ئەوە دەگەیەنێت کە دەسەلاتی خوایەتی زەوت کراوەو بۆ مرۆڤ پچرێنراوە، لەبەرئەوە دەبێت بگێرِێتەوە بۆ خواو زەوتکراوانی ئەو مافەش ریسوا بکرین.. ئەوانەی بەکەیفو ئارەزوی خۆیان یاسایان بۆ خەڵکی داناوەو خۆیان لێ کردوون بەخوایانو ئەوانیشیان کردووە بە بەندەی خۆیان. واتە تێك ڕماندنی دەوڵەتی مرۆڤپەرستیو دامەزراندنو بنیاتنانی دەوڵەتی خواویستی لەسەر زەمین. وەیان بەپێی زاراوەی قورئانی:

**(هوَ الذى في السّماءِ إلهٌ وفي الأرضِ إلهٌ...)** هەرئەوە کە لە ئاسمانیش خوایەو لەسەر زەمینیش خوایە.( **إنْ الحُكمُ إلاّ لِلهِ ...)** حوکم کردن تەنها بۆ خوایە، خوا وای فەرمان داوە کە تەنها ئەو بپەرسترێت ئەوەشە دینی ڕاستو هەقخوازی..

**( قلْ ياأهلَ الكتابِ تَعالَوا الى كلمةٍ سواء بَينَنا وَبَينَكُم ألاّ نعبد إلاّ الله وَلا نُشرِكَ بِهِ شَيئاً ولا يَتَّخِذَ بَعضُنا بَعضاً أرباباً مِنْ دُونِ الله فَإنْ تولوا فَقولوا اشهَدوا بأنـّا مُسلِمونَ)** بلێ : ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان وەرنە سەر قسەیەك کە لای هەردوولامان هەیە.. جگە لە خوا هیچی تر نەپەرستنو هاوەڵ بۆ ئەو بە هیچ شێوەیەك دانەنێین. جا ئەگەر پشتیان هەڵکردو گوێیان نەدایە بلێین: شاهێدی بدەن کە ئێمە موسڵمانین.

دامەزراندنی دەوڵەتی خواوویستی بەوە نابێت کە کۆمەلێك کـەس ـ کـە پیـاوی دینین حوکمی وڵات بگرنە دەست ـ وەکو حوکمڕانی کەنیسە. هەروەها بەوەش نابێت کەسانێك بەناوی خواوە قسـە بکـەن وەك لـە رژێمـی سیۆکراسـی، (الثیوقراطیـة = حوکمی پیرۆزی خوایی)دا هەیە، بەڵکو بەوە نەبێت کە شـەریعەتەکەی خـوا حـوکمی ژیان بکات. بەوەی کە حوکمی هەموو کاروبارو هەڵسوکەوتێك بەگوێرەی شەریعەتی خوا بێت.

## خەباتی سیاسی .. بەس نیە

ڕیشەکێش کردنی دەوڵەتی مرۆڤپەرستیو سەندنەوەی افی دەسەڵاتدارێتی لە مرۆڤو دانەوەی بەخواو دامەزراندنی دەوڵەتی خواوویستی لەسەر زەمینو ڕاپەراندنی شەریعەتی خواو سڕینەوەی یاسا مرۆڤییەکان.. ئەمانە هیچیان مومکین نیە تەنها بە راگەیاندنو بانگەوازی ئایانەو خەباتی سیاسی بێنەدی. چونکە ئەو کەسانەی حوکمی گەردنی جەماوەریان گرتۆتە دەستو مافی دەسەلاتدارێتیو یاسادانانی بۆ خۆیان زەوت کردووە، مومکین نیە هەروا بە ئاسانی بێن بەدەم بانگەوازی ئاشتیانەو، واز لە حوکم بهێنن.. ئەگەر وا بوایە خۆ ئیش نەبوو لەئیشی پێغەمبەرو نێرراوانی خوا ئاسانتر بێت!! بەڵام ئەوەی مێژووی ئایین ـ بەدرێژای نەوەکانی مرۆڤایەتی ـ تۆماری کردووە پێچەوانەی ئەوە بووە!

ئەم ئامانجی رزگارکردنی "مرۆڤ"ی "سەرزەمین"ە لە هەموو دەسەلاتێك جگە لە دەسەلاتدارێتی خوا. ئەم ئاشکراکردنەی خوایەتیو پەروەردگارێتییەی خوا بۆ گشت جیهان، وە نەبێت شتێکی تیۆری فەلسەفەی سلبی بووبێت.. بەڵکو کارو بزوتنەوەیەکی واقیعی ئیجابی بوو.. چونکە ئیسلام دەبێت بەشێوەی کردەوەیی لەشێوەی سیستمێکی حوکمدا بهێنرێتە کایەوە. حوکمێك کە جەماوەرو کاربەدەستەکانی شەریعەتەکەی خوا ڕاپەرێنن حوکمێك کە خەڵکی لە جیهانی واقیعدا لە مرۆڤ پەرستی دەربهێنێتو بیانخاتە سەر رێبازی خواپەرستی.. بۆیە چار نەبوو هەردەبوو لەگەڵ شێوازی "بانگەوازی ئاشتیانەی خەباتی سیاسی"دا شێوازێکی "بزوتنەوەیی"ش هەبێت تا لە هەموو لایەنێکەوە ئەم دینە ڕووبەڕووی "واقیع" بکاتەوە..

ئەم دینە ـ دوێنیو ئەمڕۆو سبەی ـ لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا رووەوڕوو دەوەستێتەوە ـ بەو سیفەتەی کە بریتیە لە ئاگادارییەکی گشتی بۆ

رزگارکردنی "مرۆڤـ" ی "سەرزەمین" لەهەموو دەسەڵاتێك جگـە لـە دەسـەڵاتدارێتی خوا ـ جا بێگومان چەندین کەنـدو کۆسـپی بیروبـاوەڕو عـەقیـدەو، کەنـدو کۆسـپی ماددی واقیعی دێتەڕێ. کۆسپی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئـابوریو رەگەزپەرسـتیو چینایەتی، هەروەها کۆسپو کەندەڵانی ئایدیۆلۆژی گەنـدەڵو ئەفسـانەی پووچـەڵ.. ئەوجا هەردولا دەکەونە گیـانی یـەكو تێـك دەچـڕژێنو بەشـێوەیەکی زۆر دژوارانـە پێکدا دێنو دژی بوونی یەك دەوەستنەوە.

بەم شێوەیە کاتێك بانگەوازی ئاشتیانەو لێکۆڵینەوەو خەباتی سیاسی ڕووبەرووی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی دەبێتەوە، لەهەمان کاتیشدا "بزوتنەوە"ش ڕووبـەڕووی کەنـدو کۆسپە مادديیەکان دەبێتەوە ـ لە سـەروی هـەموو کەنـدو کۆسـپێکی مادديشـەوە حوکمی سیاسی ئەو جێگەیە کە لەسەر بناغەی ئایـدیۆلۆژی کـوفرو رەگەزپەرسـتیو چـینایەتیو بـاری کۆمـەڵایـەتیو ئـابوری ئـالۆز دامـەزاروە، کـەوابوو هـەردوکیان بانگەوازی ئاشتیانەو بزوتنەوە رووبەڕووی واقیع دەبنەوە لە هـەموو لایـەنو گۆشـەو کەنارێکیدا... هەردوکیشیان پێکەوە دەبێت بکەونە کار بۆ بەرێوەچوونی بزوتنەوەی رزگارکردنی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی.. هـەموو "مرۆڤــ"ی هــەموو "ســەرزەمین" ئەمەش خاڵێکـی زۆر گرنگە بۆیە دەبێت زووزوو بخرێتە پێش چاو !.

ئەم دینـە وەنـەبێت بـۆ ڕزگـارکردنی مرۆڤـی عـەرەبی هاتبێـت. پەیامەکەشـی وەنەبێت تایبەتی بێت بە کۆمەڵگەی عەرەبەوە!. بـەڵکو بابـەتی بایـەخ پێدانەکـەی بریتیە لە"مرۆڤـ".. ڕەگەزی مرۆڤـ.. بوارو مەیـدانی ئیشکردنیشی "سـەرزەمین"ە.. هەموو سەرزەمین..

خوای گەورەش وەنەبێت تەنها خوای عەرەب بێـت، وەنـەبێت تـەنها خـوای ئـەو کەسانە بێت کە شـوێنکەوتووی ئـەم دینـەن.. بـەڵکو خـوا "پـەروەردگاری هـەموو جیهان"ەو دەیەوێت خەڵکی لە مرۆڤـ پەرستیو پەرستنی غـەیری خـوا رزگاربکـات. مرۆڤـ پەرستی هەرەگەورەش ـ بەڕای ئیسـلام ـ بریتیـە لـە ملکەچـیو گوێڕایـەڵی خەڵکی بۆ یاساو رژێمێك کە مرۆڤـ دایڕشتووە.. ئا ئەمەشە ئـەو " پەرسـتن"ەی کـە خوا بڕیاری داوە هەر دەبێت بۆ ئەو بکرێتو بەس. بۆیە هەر کەسێکیش ئـەو جـۆرە

"پەرستن"ە بۆ غەیری خوا بڕیار بدات، یان رازی بێت پێی یان شوێنی بکەوێت لە ڕیزی پەیڕەوانی ئەم دینە دەچێتە دەرەوەو بە کافر دادەنرێت، هەر چەندە پاڵاَنتەو لافو گەزافی ئیسلامەتیش لێبدات. چونکە ئەم مەسەلەیە پێغەمبەر ﷺ روونی کردۆتەوە کە "شوێنکەوتنو پەیڕەوی کردن"ی حوکمو یاسا بریتیە لە "پەرستن" لەبەر ئەم هۆیەشە کە جولەکەو دیان بە "مشرك" دانراون. چونکە "پەرستن"ەکەیان بەشێوەیەکی تری غەیری ئەو شێوەیە کردووە کە خوا بۆی دیاری کردبوون.

ترمذی لە(عەدی کوڕی حاتەم)ەوە τ دەگێڕێتەوە کە کاتێك بانگەوازەکەی پێغەمبەری گەیشتێ کە موسڵمان ببێت، هەڵات و پەنای بردەبەر شام ـ چونکە لە جاهیلییەتیدا بوو بوو بەدیان دوای ماوەیەك خوشکەکەیو دەستەیەك لە پیاوانی هۆزەکەی لەشەڕدا بەدیل گیران ـ پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕێزی لە خوشکەکەی ناو ئازادی کرد. ئەویش خۆی گەیاندە لای براکەی. لەوێ باسی ئیسلامو پێغەمبەری بۆ براکەی کرد، تا وای لێکرد حەز لە گەڕانەوە بکات. کە گەرایەوە باسەکەی کەوتبووە نێو باسانەوە. ئەوجا هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە :

**(وأَتَّخذوا أُحبارَهُم ورُهبانَهُم أَرباباً مِن دُونِ الله)**، واتە: دیانەکان حیبرو راهیبەکانی خۆیان کردبوو بەخواو لەجێی خوا دایاننابوون. عەدی دەڵێ: کاتێك ئەو ئایەتەکەی تەواوکرد منیش ووتم : خۆ ئەوان حیبرو راهیبەکانیان نەدەپەرست.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، دەیانپەرستن! مەگەر حەڵاڵیان بۆ حەرامو حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردنو ئەوانیش شوێنیان دەکەوتنو پەیڕەویان دەکردن؟ ئا ئەوەیە پەرستنیان.

تەفسیری ئەم ئایەتە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵگەیەکی زۆر بەهێزو کاریگەرە لەسەرئەوەی کە شوێنکەوتنو پەیڕەوکردنو گوێڕایەڵی بریتین لەپەرستن. ئەوەشە ئەو پەرستنەی مرۆڤ لەدین دەباتە دەرەوەو دەیکاتە کافر. هەر ئەوەشە کە هەندێك کەسی پێ دەکرێت بەخوا.. ئەمە هەر ئەو مەسەلەیە کەدین بۆ ریشەکێش کردنی هاتووە چونکە ئیسلام داوای دەکرد کە "مرۆڤـ"ی "سەرزەمین" لە پەرستنی

غەیری خوا رزگار بکرێت.

لەبەر ئەوەیە کە لە توانادا نەبوو ئیسلام بکەوێتە ڕیو بە "سەرزەمین"دا بڵاوببێتەوەو بتوانێت ئەو (واقیع)ە پیسە بگۆڕێت کە پێچەوانەی ئەو ئامانجە بووبێ ئەوەی هەردوو شێوازی بانگەوازو بزوتنەوەکە پێکەوە بگرێتە بەر.. هەروەها لەتوانادا نەبوو بەتەنها شێوازی بانگەوازی ئاشتیانەو خەباتی سیاسی بتوانێت ئەو دەست وەشاندنە سەختو کاریگەرە لەهێزە سیاسییەکانی واقیع بوەشێنێت کە خەڵکیان ناچاری خوانەوویستی دەکرد... واتە بەغەیری شەریعەتو دەسەڵاتو حوکمی خوایی فەرمانڕەواییان دەکردن کە دەبوونە بەربەست لەرێی گەیشتنی "بانگەوازی ئاشتیانە"ی ئیسلام بەجەماوەرو وەرگرتنی ئەو "عەقیدە"یە، لەلایەن جەماوەرەوە بە سەربەستییەکی تەواوی دوور لەترسو لەرزەوە، هەروەها دەبوو ئیسلام ئەو دوو شێوازە پێکەوە بگرێتە بەر تا بتوانێت حوکمێکی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی وا بنیات بنێت کە بتوانێت پاڵپشتی ئەو بزوتنەوەو بانگەوازە بکات تا بتوانرێت ـ دوای ئەوەی هێزە دەسەڵاتدارەکان ریشەکێش دەکرێن ئیسلام بەکردەوە بگەیەنرێت بەخەڵکی..

کەوابوو زۆر پێویست بوو ئیسلام هەردوو شێوازەکە لەیەك کاتدا بگرێتەبەر تا بتوانرێت دەسەڵاتی سیستەمەکان لابدات. جا ئیتر ئەو سیستمانە سیاسییەکی رووت بووبن، یا رەگەزپەرستی بووبن، وەیان پینایەتی ناو یەك میللەت!

# ئــازادی بیــر

هەرگیزاو هەرگیز ئیسلام نەیوویستووە خەڵکی ناچار بکات عەقیدەی ئیسلامی وەربگرن.. بەڵام ئێستا خۆ تەنها "عەقیدە" نیە. بەڵکو ئیسلام ـ وەکو ووتمان ـ ڕزگارکردنی مرۆڤی لە مرۆڤپەرستی ـ ئیسلام پێش هەموو شتێك ئامانجێکی گشتییەو هەوڵی ریشەکێش کردنی ئەو رژێمو حکومەتانە دەدات کە لەسەر ڕێسای حوکم کردنی مرۆڤـو لەلایەن مرۆڤـ لەسەر مرۆڤپەرستی دامەزراون.. پاشان هەموو ئەندامەکان (بەکردەوە) ئازاد دەکاتو پاشان ـ دوای ئەوەی دەسەڵاتە سیاسییە حاکمەکان لادەدات هەموو شتێك بەروونو ئاشکرایی دەخاتە بەردەست ئەوجا سەرپشکیان دەکات لەوەرگرتنی ئەو عەقیدەیی یەی خۆیان دەیانەوێت، ئەمەش مانای ئەوە نیە بەرەڵایان بکاتو هەر کەس بەکەیفی هەواو هەوەسی خۆی بکات، یا بە ئارەزوی خۆی مرۆڤێك هەڵبژێرێتو جارێکی تر لەجێی خوا دایبنێتەوە. یان هەندێکیان ببنەوە بەخوای هەندێکی تریان!!!

نەخێر چونکە ئەو سیستمەی حوکمی کۆمەڵگەکە دەکات پێویستە لەسەر ڕێسای یەکخواناسی دابمەزرێت! بەوەی کە دەبێت تەنها شەریعەتی خوا حوکم بکات.

پاشان هەر ئەندامێك دەتوانێت لەژێر سایەی ئەم ڕێسا گشتییەدا ـ هەرچی عەقیدەیەکی لاپەسند بێت، وەری بگرێت! ئا بەم شێوەیە کە دەبێت "دین"ی هەموان خواوویستی بێت. واتە مل کەچیو گوێرایەڵیو شوێن کەوتنو پەرستن هەمووی بۆ خوا ئەنجام بدرێت.. مانای "دین" لەمانای "عەقیدە" بەربلاوترە. دین بریتیە لەو پرۆگرامو سیستمەی حوکمی ژیان دەکات. کە لە ئیسلامدا لەسەر عەقیدە دادەمەزرێت. بەڵام لە ناوەرۆکیدا لەمانای عەقیدە بەربلاوترە.. هەروەها دەشێت لە ئیسلامدا چەندین کۆمەڵەی جیاوازیش شوێن پرۆگرامە گشتییەکەی ئیسلام بکەون ـ کە لەسەر یەکخواناسی دامەزراوە ـ ئەگەرچی هەندێکیشیان عەقیدەی ئیسلامیان

وەرنەگرتبێت.

ئەو کەسەی هەست بەسروشتی ئەم ئیسلامە دەکات ـ بەو شێوەیەی باسمان کرد ـ دەست بەجێ هەست بەوەش دەکات کە مومکین نیە هەر دەبێت بزوتنەوەی ئیسلام شێوازی جیهادی چەکدارانە (خەباتی سەربازیانە) شان بەشانی جیهادی بانگەوازی ئاشتیانەو رون کردنەوەی (خەباتی سیاسیانە) بگرێتەبەر.. هەست بەوەش دەکات کە بزوتنەوە جیهادی نەوەی یەکەمینی ئیسلام، بەو مانا تەسکەی ئەمڕۆ نەبووە، کە پێی دەڵێن "شەڕی بەرگری لەخۆکردن". وەکو رای ئەو کەسانەی کە دەرونیان بەزیوەو تەوژمی واقیعی ئەمڕۆو هێرشی رۆژهەڵاتناسە فێلبازەکان تاساندوونی. نەخێر.. بەڵکو بزوتنەوەی ئیسلامی، بزوتنەوەیەك بوو بۆ رزگارکردنی "مرۆڤ"ی "سەرزەمین" هاتبوو. چەندین قۆناغی دیاری کراویش هەبوو، کە هەر قۆناغەو هۆو شێوازی سەربەخۆی بەرابەر (مکافيء)ی خۆی هەبووە کە بەرامبەر واقیعی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەو رۆژە دەبۆوە.

خۆ ئەگەر هەر چاوی ئەوەمان نەماو ناچار بووین بە بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی بڵێین بزوتنەوەیەکە بۆ (بەرگری کردن).. ئەو کاتە دەبێت مانای "بەرگری کردن"ەکەش بگۆڕینو بیکەین بە"بەرگری کردن لە مرۆڤـ" دژی هەموو بەربەستێك کە رێ لە سەربەستیو ئازادی مرۆڤ دەگرێت.. ئەو بەربەستانەی کە لە ئایدیۆلۆژیو بیروباوەڕەکاندا دەردەکەون. هەروەها لەو سیستمە سیاسیانەدا دەردەکەون کە لەسەر بناغەی پوچەڵی رەگەزپەرستیو چینایەتیو بەربەستی ئابوری دامەزراون، کە لەو رۆژەوەی ئیسلام هاتووە لەم سەرزەمینەدا هەبوون، وئیستاش چەندین شێوازو بنەمایان لە جاهیلیەتی نوێی ئەمڕۆدا ماوە!

دوای ئەوەی ئەم شێوە فراوانە لەووشەی "بەرگری کردن" تێگەیشتین، دەگەینە ئەو هۆیانەی وایان کرد کە ئیسلام بە جیهاد لە (سەرزەمین)دا بکەوێتە رێ. هەر لەم رێگەیەشەوە دەگەینە هۆی هاتنە کایەوەی ئیسلام خۆی، کە بریتیە لە بزوتنەوەی رزگارکردنی مرۆڤ لە مرۆڤپەرستی، وبریاردانو چەسپاندنی خوایەتیو پەروەردەگاریتی خوا بۆ گشت جیهان. هەروەها ریشەکێش کردنو لادانی

مـەملەكـەتی هەواوهەوەس پەرستی مرۆڤـ لەسەر زەمینو، دامەزراندنی مـەملەكـەتی شەریعەتی خوایی لە جیهانی مرۆڤدا.

كەوابوو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بەڵگەو هێنانەوەی بۆ ئەوەی كە گوایـە جیهـادی ئیسلامی بریتی بووە لە بـەرگری لـەخۆكردن، وخزاندنیـە قـاڵبی "جـەنگی بـەرگری لەخۆكردن"ی ئەمڕۆوە.. هەروەها گەڕانو خۆماندوو كردن بۆ سەلماندنی ئەو رایە كـە گوایە ڕوودانی جیهادی ئیسلامی تەنها لەبەر ئەوە بووەكە "نیشتمانی ئیسلامی" لـە مەترسیو گێچەڵی دەسەڵاتدارە بەهێزەكانی دەوروپشت بپارێزێت ـ كـەواش دەزانـن نیشتمانی ئیسلامی بریتیە لە نیوەدورگەی عەرەبی ـ ئەمە هۆی ئەوەیـە كـەخاوەنی ئەم جۆرە رایانە شارەزای سروشتی ئەم ئایینە نینو ناشیزانن.. ئەمە جگە لەوەی ئـەم جۆرە هەڵوێستە نیشانەی بەزینو خۆ نەگرتنە بەرامبەر تـەوژمی واقیعـی ئـەمڕۆو، بەرامبەر ئەو هێرشە فێڵاویو تەڵەكەبازییەی رۆژهەڵاتناسی دەیكاتە سـەر جیهـادی ئیسلامی!

باشە ئەگەر ئەبو بەكرو عومەرو عثمان ﵃ لـە دوژمنـداریێتی رۆمو فارسـەكان دڵنیا بوونایەو بیانزانیایە كە ئەوانە هێرش ناهێننە سەر نیوەدورگـەی عـەرەب، تـۆ بڵێیت وازیان لەوە بهێنایە كە دەنگی ئیسلام بگەیێننە هـەموو لایـەكی سـەرزەمین؟ باشە چۆن دەیانتوانی ئەو بانگەوازە خـوایی یـە بڵاوبكەنـەوە، لەكاتێكـدا كـە ئـەو كۆسپو كەندەڵانە ماددیانەی دەوڵەتە سیاسیەكانیشیان لەبەردەم بوو؟ ئـەو هـەموو سیسـتمە رەگەزپەرسـتو چـینایەتیانەی لـەنێو كۆمەڵگانـەدا دامـەزرا بـوون، كـە هەمووشیان هێزی ماددی دەوڵەت دەیپارستن؟!

نیشانەی سادەییو ساویلكەیی یە كەسێك وا بزانێت، بانگەوازێك كـە مەبەسـتی ڕزگاركردنی "مرۆڤـ" بێـت جـۆری رەگـەزی مرۆڤـ.. مرۆڤـی "سـەرزەمین" هـەموو سەرزەمین كەچی بیەوێت بە بانگەوازی زمانی ئەو كۆسپو كەندەڵانانـە لابـدات كـە لەرێیدان!

بانگەوازی ئیسلامی كاتێك بانگەوازی ئاشتیانە بەكاردەهێنێت كە بـواری نێـوان خـۆیو جـەماوەر كراوەبێـت. تـا بتوانێـت بەسەربەسـتی لەگەڵیانـدا بـدوێت،

لـێبکۆڵێتەوەو، روون بکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا پێویستە خەڵکەکەش هــیچ جـۆرە ترسێکیان نەبێتو هیچ جۆرە کۆتو زنجیرێکیان پێوە هەڵنەبەسترابێت، تــا بتوانرێــت دڵو ژیری یان بدوێنرێت!

# جیـهاد هـەموو کاتێك پێویستە

جیهـاد پێویسـتییەکی سـەرەکی بانگـەوازی ئیسـلامییە.. مـادام بانگـەوازی ئیسلامیش مەبەستی رزگارکردنی مرۆڤەو بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش رووبەڕووی واقیع دەبێتـەوە، بـۆ هـەموو گۆشـەو لایـەنێکی ئـەو واقیعـەش شـێوازی بەرابـەر بەکاردەهێنێت، کەوابوو نابێت تەنها رێگەی روون کردنەوەو لێکۆڵینـەوەی تیۆریانـە بگرێتەبەر! جا ئیتر نیشتمانی ئیسلامی ـ وە یـان بـە زاراوەی ئیسـلامی بڵـێین (دار الاسلام) ـ مەترسی پێش هاتبێت لەلایەن دراوسێکانیەوە یـان نـا، چـونکە ئیسـلام کاتێك هەوڵی هێنانەدی ئاشتی دەدات، مەبەستی ئەو ئاشتییە لاوازو هەرزانـە نیـە کە بریتیە لە پاراستنو بەرگریکردن لەو پارچە زەوییەی کە خەڵکەکـــەی عەقیـدەی ئیسلامیان وەرگرتووە. بەڵکو مەبەستی ئیسلام، ئەو ئاشتی یەیە کە هەموو خەڵکی دەبێت ئایینی خواویستی وەربگرن. واتە پەرستنی هەموو خـەڵکی بـۆ خـوا ئـەنجام بدرێتو، خەڵکی هەندێکیان نەبنـــە خوای هەندێکی ترو لە جێی خوا دانەنرێن.

دەرس وپەند وەرگـرتنیش دەبێـت لـە کۆتـا قۆنـاغی بزوتنـەوەی جیهـادی ئیسلامییەوە وەربگرین. کە بە فەرمانی خوا بووە ـ نەك لە ڕۆژانی سەرەتا، یـا رۆژانی ناوەڕاستی بانگەوازەکەوە.. چونکە ئەو قۆناغانـە وەکـو ئیمـامی (ابـن القیم) دەفەرمویێت، کۆتایی هات:

" .. ئـەوجا هەڵوێسـتی کافرەکـان بەرامبـەر بـە پێغەمبـەر ﷺ دوای هاتنـە خوارەوەی سورەتی (البراءة = التوبة) سێ جۆر بوو:

١- شەڕانی ٢- خاوەن پەیمانەکان ٣- خاوەن ـ دینە ئاسمانیەکان .

پاشان کە زیاتر ئیسلام بڵاوبووەوە، خاوەن پەیمانەکانیش موسڵمان بوون.

ئەوجا هەڵوێستی کافرەکان بوو بە دوو بەش: شەڕانیو خاوەن ئاینە ئاسمانیەکان.. شەڕانیەکانیش لێی دەترسان..

کەوابوو هەڵوێستی خەڵکی سەرزەمین بوو بە سێ بەشەوە :

١. موسڵمان: کە باوەڕی پێهێنابووو، شوێنی کەوتبوو.

٢. ئاشتیوویستی هێمن (بریتی بوو لە خاوەن دینە ئاسمانیەکان. وەکو کە ڕستەی پێشووتر روونی کردەوە.)

٣. ترساوێکی شەڕانی"...

ئا ئەمەیە هەڵوێستی مەعقولو دروست بەرامبەر سروشتو ئامانجی ئەم دینە. نەك هەڵوێستی ئەوانەی دەرونیان بەزیووەو واقیعی ئەمڕۆ ترساندونیو هێرشی فێلاوی ڕۆژهەلاتناسەکان کاسی کردوون!!

خوای گەورە لە ماوەی قۆناغی مەککەو لەسەرەتای کۆچ کردنی موسڵمانانەوە بۆ مەدینە داوای لەموسڵمانان نەکرد کە بجەنگن.. بەڵکو بە موسڵمانان ووترا:

(كُفُّوا أَيديَكُم وأَقيمُوا الصَّلاةَ وآتوا الزّكاة ) (النساء- ٧٧)

تا دەستیان لەشەڕ بگرنەوە چونکە کاتی نەهاتووە. لە جیاتی ئەوە با دەرونیان بەنوێژکردنو زەکاتدان پەروەردە بکەن...... پاشان مۆڵەتی ئەوەیان درا، پێیان ووترا:

(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ۞ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلآ أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللهُ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۞الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الآرْضِ أَقَامُوا الصَّلآةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ وَلِلّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ) (الحج: ٣٩-٤١)، واته: مۆڵەتی شەڕکردن بە ستەم لێکراوان درا ـ خواش بە توانایە سەریان خات (داوای ڕەنجدانو تێکۆشان دەکات) ـ ئەوانەی کە بە ناهەق لە وولاتو جیو ڕێی صفحه: ١٠٧

خۆیان دەرپەڕێنران، هەر لەبەرئەوەی دەیانووت خوای ئێمە (الله)یە. خۆ خوا

یاسای جیهادی دانەنایەو دوژمنانی لەنێو نەبردایە (و لەنێو نەبرێن)، حەتمەن کافرەکان دەستیان بەسەر زەمیندا دەگرتو دروشمی خواوویستی نەدەما بەوەی کە دێری راهیبو وکەنیسەی مەسیحیو پەرستگای جولەکە مزگەوتی موسڵمانان دەڕوخێنران (**ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيراً**) (مزگەوتەکانیش هەر دەڕوخێنران ـ خوا دەربارەی مزگەوت زیاتر باس دەفەرموێ بەو سیفەتەی زیاترو پاکتر یادو زیکرو پەرستنی خوای تێدا ئەنجام دەدرێت). سوێند بێت کە خوا ئەو کەسانە سەردەخات کە ووشەی خواوویستی سەردەخەن. خواش بەهێزەو هیچ شتێکی لێ عاسی نابێتو زاڵە وهیچ شتێك نیە بەسەر ئەودا زاڵ بێت. ئەوانە (ئەو کەسانەی سەر دەخرێنو شایانی کۆمەكو یارمەتی خوایین) ئەوانەن کە ئەگەر خوا دەسەڵاتدارێتی سەرزەمینی پێ بەخشینو لە حوکمڕانی جێگیری کردن خواپەرستی دەکەن: نوێژ ئەنجام دەدەنو زەکات دەدەنو، فەرمان بەچاکە دەکەنو بەرهەڵستی لەخراپە دەکەن، سەرەنجامی هەموو کارو کردەوەیەکیش بۆ خوا دەگەڕێتەوە.

پاشان شەڕیان لەسەر فەرز کرا، دژی ئەو کەسانەی کە بەگژ ئەماندا دێن. فەرمانیشیان پێدرا کە هەقیان بەسەر ئەوانەوە نەبێت، کە نایەن بەگژ ئەماندا (**قاتِلوا في سَبيلِ اللهِ الذينَ يُقاتِلونَكُمْ ..**) لەپێناوی خوادا دژی ئەو کەسانە بجەنگێن کە دێن بەگژتاندا بەهیوای کوشتنتان.. پاشان وا شەڕیان لەسەر فەرزکرا کەدژی هەموو موشریکان بجەنگێن. بۆیە پێیان ووترا:

(**قاتِلوا الذينَ لا يُؤمِنونَ باللهِ ولا بِاليومِ الآخِر وَلا يُحَرِّمُونَ ما حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولَه وَلا يَدينُونَ دِينَ الحَقَّ مِنْ الذينَ أُوتُوا الكِتابَ حَتّى يُعُطوا الجِزيةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صاغِرونَ**) (التوبة– ٢٩)، واتە: ئەو کەسانە بکوژن ـ لەخاوەن ئایینە ئاسمانیەکان کە بەراستی باوەڕیان بەخواوو بەڕۆژی دوایی نەهێناوە ـ ئەگەرچی بەقسەی خۆیان باوەڕیان هێناوە ـ ئەوانەی ئەو شتانە بە حەرام دانانێن کە خواو پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناوە (بەڵکو یاساو دەستوریان لە حیبرو راهیبەکانیانەوە وەردەگرن کە حەڵاڵیان بۆ حەرامو حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکەن)، ئەوانەی کە باوەڕیان بە دینی ئیسلام نەهێناوە کە دینێکی ڕاستە.. شەڕیان لەگەڵدا بکەن تا ناچار دەبن بە ملکەچیو گوێڕایەڵییەوە (جزیە) دەدەن..

چونکه شەڕکردن وەکو ئیمامی (ابـن القـیم) دەفـەرمویێت: "حـەرام بـوو، پاشـان مۆڵەتیان پێدرا، پاشان فەرمانیان پێدرا کە بجەنگن لەگـەڵ ئەوانـەی بەگـژ ئەوانـەی بەگژ ئیسلامدا دێن، پاشان بەرامبەر هەموو کافرەکان".

بەهێزیو پتەوی دەقە قورئانیەکان ـ کە دەربارەی جیهـادن ـ و بـەهێزیو پتـەوی حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لایەنگیرو هانـدەری جیهـادن. هـەروەها بـەهێزیو پتەوەی ڕووداوە جیهادییەکانی سەرەتاو ساڵەهای ساڵی مێژووی ئیسلام.

ئەم هەموو بەڵگە بەهێزو پتەوانە بەهیچ جۆرێك ڕێگا نادەن بەکەسێك ئەو جـۆرە لێکدانەوانە (کە گوایـە جیهـادی ئیسـلامی شـەڕی بـەرگری لەخۆکردنـە) بهێنێتـە کایەوە.. چونکە ئەو جۆرە لێکدانەوانە شاهیدی بەزیووی‌و خۆ ڕانـەگرتنن بەرامبـەر تەوژمی واقیعی ئەمڕۆو، بەرامبەر هێرشی فێڵاوی ڕۆژهەڵاتناسی کە دەکرێتـە سـەر جیهادی ئیسلامی!!

کێ هەیە فەرمایشتەکانی خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ ببیسـتی‌و ڕووداوەکـانی جیهادی ئیسلامی دیراسە کردبێت، ئەوجا وا بزانێت کە ئەمانـە هـەمووی شـتێکی لاوەکین‌و بایەخی تەواویان پێ نادرێت، یان قەناعەتی بێتە سەر ئەوەی کـە جیهـادی ئیسلامی بریتیە لەوەی کە بەرگرییەکی ناچارییەو لەووڵاتی ئیسلامی دەکرێت؟!!

خوای گەورە هەر لەسەرەتای ئایەتەکانی جیهادەوە کە ناردییە خوارەوە ئەوەی بـۆ موسڵمانان ڕوون کردەوە کە ڕێسـای سـەرەکی‌و هەمیشـەیی سروشـتی ژیـانی دنیـا بریتیە لەوەی کە خەڵکی هەندێکیان بە هەندێکی تریان لەنێو بچـن (لەنێوچـووەکان ستەمکارو شەڕ خوازانن) تا فەسـادو خراپـەکاری لەسـەر زەمـین بسـڕێتەوەو هێـزی شەڕخوازی تێك بشکێت:

**(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ۞ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلاَّ أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللهُ وَلَوْلآ دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ)** (الحج: ٣٩-٤٠)

کەوابوو ئەمە حاڵەتێکی کاتی نیە. بەڵکو حاڵـەتێکی هەمیشـەیی‌یـە. حاڵـەتی

هەمیشەیی ئەوە نیە کە هەق‌و ناهەق پێکەوە لەسەر زەمیندا بژین. چونکە هەر کاتێك ئامانجەکەی ئاشکرا کرد کە حاکمێتی خوایە بۆ گشت جیهان‌و، رزگارکردنی مرۆڤ لە مرۆڤپەرستی ئەوسا ئەو کەسانەی مافی خوایەتیان بۆ خۆیان پچڕیوە بەرهەلستی دەکەن‌و دژی دەوەستن لەبەر ئەوە دەبێت ئیسلام بکەوێتە ری‌و، هەموو دەسەڵاتدارێتی‌یەکی سەر رێی ریشەکێش بکات‌و رامالێت.. ئەمەشە بەرگریکردن لە"مرۆڤ"و "سەرزەمین"و رزگارکردنی "مرۆڤ" لەدەسەلاتی هەواو هەوەس پەرستی.. ئەمەش حالەتێکی هەمیشەیی‌یە، کە دەبێت جیهاد شان بەشانی بکەوێتەرێ تا دینی هەموو سەرزەمین دەبێە دینی خواوویستی.

# قۆناغی مەککەو خۆگرتن

دەستگرتنەوەو وازهێنان لە جیهاد لە مەککە، تەنها قۆناغێك بوو لە ماوە درێژەکەی ڕێبازی خواوویستی. سەرەتای کۆچ کردن بۆ مەدینەش هەر قۆناغێکی هەمان شێوە بوو. ئەوەی کە پاڵی نا بە کۆمەڵەی موسڵمانانی یەکەمەوە لەمەدینە بۆ جیهادکردن ـ پاش تەواوبوونی ماوەی سەرەتای کۆچ کردن ـ وەنەبێت تەنها لەبەر خاتری دوور خستنەوەی مەترسی بوو بێت لە مەدینە.. چونکە ئەمە ئامانجێکی سەرەکییەو هەر دەبێت زوو بهێنرێتەدی... ئەمەش وەنەبێت ئامانجی سەرەتاو کۆتایی بێت... بەڵکو ئەوە شێوازی بڵاوکردنەوەی ئیسلامی مسۆگەر کردو، بنکەی لێوە دەرچوون (قاعدة الأنطلاق)ی مسۆگەر کرد.. دەرچوونی بۆ ڕزگارکردنی "مرۆڤـ"و ڕیشەکێش کردنو ڕامالینی ئەو کۆسپانەی دێنە ڕێی "مرۆڤـ"!!

مەسەلەی دەسگرتنەوەی موسڵمانانی مەککە لە جیهاد شتێکی ئاشکرایەو روونە. چونکە بانگەوازی خواوویستی سەربەستییەکی تەواوی بڵاوکردنەوەی هەبوو لەنێو خەڵکی مەککەدا..

پێغەمبەریش ﷺ لەلایەن شمشێری (بەنی هاشم)ەکانەوە دەپارێزراو بواری بۆ کرابۆوە تا تێکەڵ بە خەڵك ببێتو گوێو ژیریو دڵی خەڵکی بدوێنێت.. هەروەها حوکمێکی سیاسی ڕێكوپێكو دەسەڵاتدارێتییەکی وانەبوو نەهێڵێت پێغەمبەرﷺ بانگەوازەکەی بگەیێنێت، یا ڕێ لە خەڵکی بگرێتو نەهێڵێت گوێ بۆ بانگەوازەکەی ئەم بگرن! هەروەها چەندین هۆی تر کە لەو قۆناغەدا هەبوون!... ئەم باسەم لە (في ظلال القرآن)دا فراوانتر باس کردووە، لە تەفسیری ئەو ئایەتەی سورەتی (النساء-٧٧) کە خوا دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ الى الذينَ قِيلَ لَهُم: كُفُّوا أيديَكُم وأقيمُوا الصَّلاة

وآتوا الزَّكاة...)، بەڵام هەر باشتر وایە بەم بۆنەیەوە هەندێكی لێرەدا بهێنێنەوە[1].

١- لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت كە قۆناغی مەككی بریتی بوو لە قۆناغی پەروەردەكردنو پێگەیاندن لە بارودۆخێكی تایبەتیو لەنێو كۆمەڵگەیەكی مرۆڤی تایبەتیدا ـ ئامانجی ئەم پەروەردەكردنو پێگەیاندنەش چەندین مەبەستی تێدا بوو، وەك:

أ ـ پەروەردەكردنو فێركردنو ڕاگرتنی دەرونی مرۆڤی عەرەب بەئارامگرتن لەسەر ئەو كارو ڕوداوانەی كە نەیدەتوانی ئارامی لەسەر بگرێ، وەك ستەم لێكردن لەخۆی، یا لەوانەی لەپەنایدا دەحەوانەوە.

ب ـ تا لەخۆیەتی خۆیو كەسێتیو خۆپەرستی خۆی ڕزگاربكرێتو وا پەروەردە ببێت كە نابێت ژیانو هەستو سۆزی تەنها بۆ خۆیو ئەو كەسانە بێ كە لەپەنایدان. تا وا لە دڵو ژیریدا بچەسپێت، كە جوڵانەوەی ژیانی تەنها هی خۆی نیە.

ج ـ پێویستی سەرپەرشتی دەرون ورق هەستانو هەستی خۆی بكاتو بتوانێت زەبتیان بكات، نەبادا هەر لە یەكەم ڕووداوەوە هەڵچێو پەلامار بدات (وەكو كە سروشتی عەرەب وابوو). بەڵكو پێویستی تەواو خۆی زەبت (كۆنترۆڵ) بكات، تا زەوتو هەڵسوكەوتی بێمەبەست ئەنجام نەدات.

د ـ تا فێری ئەوە ببێت كە ئەم سەر بە كۆمەڵەو سەركردایەتییەكی ڕێكوپێكە، كە دەبێت لەهەموو بەشێكی ژیانیدا پرسی پێبكاتو ڕای وەرگرێت، نەك هەر خۆی خۆ بەسەر بە كەیفی خۆی ـ وەك كە بەو شێوەیە ڕاهاتبوو ـ بجوڵێتو ڕەفتار بكات، ئەمەش بەهێزترین شت بوو كە ببووە بەردی بناغەی بنیاتنانی شەخسیەتی عەرەبی، كە"كۆمەڵگەی ئیسلامی" پێ هێنرایە كایەوە، ئەو كۆمەڵگەیەی سەركردایەتییەكی ڕێ پیشاندەری پێشكەوتووی ڕێك وپێكی

١) وامان بەباشزانی كە بەشێوە خاڵ (نقاط) بنوسرێت تا ئاسانتر بێت بۆ لەبەركردن ـ (م. كریَكار) ..

هەبوو، نەك سەركردەو كۆمەڵگەیەكی هۆزپەرستی سەرسەخت!

٢- وە لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت كە بانگەوازی ئاشتیانە كاریگەرترو بەسوودتر بووبێت.

ـ لەو جۆرە بارەزروفو كۆمەڵگەیەی قورەیشدا ـ كە پلەوپایە پەرستیو فیزو لەخۆبایی بوون وای لێ دەكردن بكەونە دوژمنداریێتیو یەكتر كوشتن. چونكە غەیری ئەو شێوە ئاشتیانە ـ لەو جۆرە قۆناغانەو لەو جۆرە باروزروفو كۆمەڵگانەدا ـ لەوانەیە كاری سەختترو قورستر بهێنێتە كایەوەو كەللەرەقیو عینادی زۆر دروست بكات. كە سەرەنجام شەڕی خوێناویو تۆڵەسەندنەوەی تیا پەیدا دەبوو. وەك ئەو شەڕو تۆڵە سەندنەوە بەناوبانگانەی لەنێو عەرەبەكاندا هەبوون. وەك شەڕی (داحسو غبراء)و شەڕی (بەسوس).. كە چەندەها ساڵی دوورو درێژی خوێناویان خایاند. كە هۆزی وا هەبوو ـ سەرەنجامی ئەو شەڕانە ـ وردو درشت تێدا دەچوونو دەفەوتان .. ئەو كاتەش حەتمەن ئەم تۆڵە سەندنەوەو دەمارگیریو دوژمنداریێتی یە لە مێشكیاندا تێكەڵ بە ئیسلام دەبوون. كە دانەدەمركایەوەو زیاتریش گەشەی دەكردو دەمایەوە.. ئەوسا ئیسلام لەجیاتی ئەوەی ببێت بە ئایینێكی بانگەوازو ئاشتیو هێمنی، دەبووە تۆڵەسەندنو شەڕخوازییەكی وا كە گیانی لێبووردنو چاكەخوازییەكەی دەبوو بەژێرەوەو نەدەما!!

٣- وە لەوانەیە لەبەرئەوە بێت كە نەبادا شەڕو دوژمنداریێتی لەنێو هەموو ماڵێكدا دروست ببێت. ئاشكرایە كە لە مەككە ئەو سەردەمەدا حوكمێكی گشتی وا نەبوو كە موسڵمانان ناچار بكات واز لە ئاینەكە بهێنن، بەڵكو ئەو جۆرە ئیشە درابوە دەست سەرپەرشتیارانو سەرۆك هۆزەكان كە ئەوانیش هەریەكەیان سزاو ئازارو (تەمێكردن)ی تاكەكانی سەربەخۆیان گرتبوو دەست. مۆڵەت دات بەسەرِ لەو جۆرە باروزروفەدا ـ بریتیە لە بەرپاكردنی شەڕو ناكۆكیو دوژمنداریێتی لەنێو هەموو ماڵێكدا.. ئەوسا دەوترا: ئا ئەوەیە ئیسلام!

خۆ ئیسلام ئەو ڕێگەیەشی نەگرتبوە بەرو فەرمانی جیهادیشی نەدابوو، وای پێ دەوترا. جا ئەگەر ئەو ڕێگەیەی بگرتایەبەر چ دەقەوما؟!.. ئەو پاڵانتەی قورەیش لەنێو هۆزە عەرەبەکاندا لەکاتی حەجو بازرگانیدا بڵاوی دەکردەوە. ئەوەبوو کە دەیانووت محمد جیاوازیو دژایەتی خستۆتە نێوان باوكو کوڕەوە. دوای ئەوەی کەناکۆکی خستە نێوگەڵو هۆزەکانەوە!.. جا ئەگەر ئیسلام فەرمانی دەربکردایە کە کوڕە موسڵمانەکان باوکیانو، کۆیلە موسڵمانەکان گەورەکانی خۆیان بکوشتایەو، ئەو شەڕو پێکدادانە بکەوتایەتە نێو هەموو ماڵو گەرەكو هۆزێکەوە، چی بەرامبەر ئیسلام دەوترا، چ هەڵوێستێکی دوژمندارانەی بەرامبەر دەکرا!؟

٤- وە لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە خوا خۆی دەیزانی زۆر لەو کەسانەی هەڵوێستی دژو سزادەرو دڵڕەقانەیان هەیە، لەوانەی کە موسڵمانانی یەکەمینیان سزا دەدا ـ بەهیوای پاشگەزبوونەوەیان ـ هەر ئەوانە خۆیان لە داهاتوودا دەبنە دڵسۆزترین سەربازی ئیسلام، وبگرە دەبنە سەرکردە.. مەگەر عومەری کوڕی خطاب لەو جۆرە کەسانە نەبوو!؟..

٥- وە لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە یەکێك لەسیفاتی پیاوانەی عەرەبو خووڕەوشتی عەشایری عەرەبی ئەوەبوو کە دەبێت هەموو کەسێك ستەم لێکراون سەرخاتو، بچێت بەهانای زۆر لێکراوانەوە، ئەگەرچی تووشی سەدان گیروگرفت ببوایە! بەتایبەتی ئەگەر زۆر لێکراوەکە لەپیاو ماقوڵانو بەگزادەکان بوایە.. چەندین ڕووداوی واقیعی هەن کە دەبنە بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیە، ئەوە بوو کە (ابن الدغنە)[1] ڕازی نەبوو ئەبوبەکری صدیق ـ کە یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی

---

١) کاتێك سزاو ئازار لەسەر ئەبوبەکری صدیق رَضِيَ اللهُ عَنْهُ زیاتر بوو لە مەککە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیدا تا ئەویش کۆچ بکات بۆ حەبەشە. ئەمیش کاتێك مەککەی بەجێهێشت (ابن الدغنە)ی تووش بوو، کە دوای ئەوەی بەسەرهاتی ئەبوبەکری زانی، پێی ناخۆش بوو. پێی ووت، وەرە لە داڵدە (کنف)ی مندا بژیو ناهێڵم هیچ کەس ڕێت لێ بگرێت، کە گەڕانەوە (ابن الدغنە) ئەم داڵدەدانەی لە کەعبە ئاشکراکرد.

مەککە ـ کۆچ بکاتو مەککە بەجێبهێڵێت. چونکە ڕۆیشتنی ئەبوبەکری بە شورەییو نەنگێکی گەورە دەزانی کە بەسەرشانی کۆمەڵگەی عەرەبدا دێت! لەبەرئەوە بوو کە پەنای ئەبوبەکری داو بەرگری لێکرد.

بەڵگەیەکی تر: هەڵوەشاندنەوەو لابردنی گەمارۆدانەکەی قورەیش بوو کە بەرامبەر تیرەی بەنی هاشم کرابوو، لەوانەی کۆچیان کردبوو بۆ دۆڵەکانی (ابو طالب لە طائف)[1].

دوای ئەوەی کە برسێتیو نارەحەتی تەواو شپرزەی کردن، ئەم ئارام گرتنو دەست نەکردنەوەیە ـ لەم جۆرە باروزروفو کۆمەڵگایانەدا ـ سوودبەخشە بۆ بانگەوازەکە بەڵام دەست نەکردنەوە لە باروزروفو کۆمەڵگەیەکی "شارستانێتی"ی بیرکۆندا کۆتا پلەی بەزینو زەلیلییە، چونکە خۆ ماتکردنو بێدەنگ بوون لەسەر سزاو ئازار مایەی سووکیو بێدەسەڵاتیو ترسنۆکی ئازاردراوو نیشانەی گەورەییو مەزنی ستەمکارو زۆردارانە!

٦- وە لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە ژمارەی موسڵمانەکان لەوکاتەدا کەم بوو. هەمووشیان هەر لە مەککە دابوون. چونکە هێشتا بانگەوازی ئیسلامی نەگەیشتبووە ناوچەکانی تری نێودورگەی عەرەب، وەیان رەنگە گەیشتبێت بەڵام بەشێوەیەکی کەمو پەرتوبڵاو، لەلایەکی تریشەوە، هۆزە عەرەبییەکان بێلایەن بوونو تەماشای ناکۆکی نێوان قورەیشیان دەکرد کەلەنێوان ئەندامەکانیدا دروست بوو بوو، چاوەڕوانی چارەنووسی ئەو ناکۆکی یەیان دەکرد.. لەم جۆرە کاتانەشدا ئەگەر شەڕ دابمەزرایە، ئەوەندەی نەدەخایاند، کە ئەو کۆمەڵە

---

۱) **موسڵمانەکان ناچارکران ـ دوای زیادبوونی سزاو ئازار ـ مەککە بەجێبهێڵنو بچن بۆ** طائف **تا لەژێر سایەی** ابوطالبی **مامی پێغەمبەردا** ﷺ **بتوانن بژین، بەڵام قورەیش دەنگ دابڕانێکی لەو موسڵمانانە کرد کە کەس شتی پێ نەدەفرۆشتن وکەس شتی لی نەدەکڕین و کەسیش ژنو ژنخوازی لەگەڵ نەدەکردن.. ئەمەش هەموو هۆزەکان پێی رازی بووبوون. بۆیە ئەم ڕازیبوونەیان لە تابلۆیەکدا نووسیو بە کەعبەدا هەڵیان واسی، بەڵام پاش چەند ساڵێك خۆیان ناچاربوون کە دەنگ دابڕان** (مقاطعة)**ەکە هەڵوەشێننەوە. کرێکار**

موسڵمانە كەمە بە كوشتن لەناودەبراو، كۆتایی دەهات ـ با ئەوەندەش لێهاتوو ئازاش بن بتوانن سێ ئەوەندەی ژمارەی خۆیان لە دوژمن بكوژنەوە ـ ئەو ساتەش هاوەڵ بۆ خوا پەیداكردن هەر دەما. لەولاشەوە موسڵمان نەدەماو لە هەموو سەرزەمیندا حوكمی ئیسلامی مومكین نەدەبوو دابمەزرێتو، قەبارەیەكی ببێت. بێگومان ئیسلامیش دینێكە بۆ ئەوە هاتووە كە پرۆگرامی ژیانو رژێمێكی واقیعی كردەوەیی لەژیاندا بهێنێتەكایەوە....

٧- (..... .. هتد).

هەروەها دەسگرتنەوە لە شەڕو وازهێنان لە جیهاد ـ لە سەرەتای كۆچ كردنەوە بۆ مەدینە ـ كە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ جولەكەو دانیشتوانی مەدینەو دەوروبەریدا بەستبوو ـ لەوانەی هێشتا بەكافری مابوونەوە ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەو چەندین هۆی تر بوو.

**ئەمەش حاڵەتێكە كە سروشتی ئەو قۆناغە وای پێویست كردبوو:**

یەكەم: چونكە بواری بانگەوازو گەیاندنی ئیسلام هەبوو، هیچ دەسەڵاتێكی سیاسی نەبوو بەرهەڵستی بڵاوكردنەوەی ئیسلام بكاتو، وەك بەربەستێك لەنێوان ئیسلامو جەماوەری خەڵكیدا بووەستێت. چونكە هەموو لایەك ئیعترافیان بەدەوڵەتی ئیسلامی نوێ بەسەرۆكایەتی پێغەمبەر ﷺ كردبووو، لەلایەن ئەنجام دانی كارە سیاسییەكانەوە رازی بووبوون.. كە یەكێك لە بەندەكان پەیمانەكەی مەدینە ئەوەبوو كە هیچ كەسێكیان هۆزو كۆمەڵێك بۆی نیە پەیمان لەگەڵ هۆزی تردا ببەستێت یان شەڕێك بەرپا بكات، یان پەیوەندی دەرەوە ببەستێت تا مۆڵەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرنەگرێت. ئەمەش بەڵگەیە كە دەسەڵاتدارێتی راستەقینە بەدەست سەركردەی موسڵمانانەوە بوو، بوارێكی زۆریش هەبوو بۆ بڵاوكردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی، هەروەها هیچ جۆرە كۆسپو بەربەستێك لەنێوان ئیسلامو جەماوەری خەڵكیدا نەبوو، هەموو خەڵكیش سەربەست بوون لە وەرگرتنی عەقیدەكەدا.

دووەم: پێغەمبەر ﷺ دەیویست ـ لەم قۆناغەدا ـ هەموو كارو كردەوەیەك دژی

قورەیش تەرخان بکرێت، کە ببووە گەورەترین کۆسپی سەر ڕێی بڵاوکردنەوەی دینەکەو، بە شێوەیەکی لاوەکی (غير مباشر) نەیدەهێشت ئیسلام بگاتە هۆزەکانی تر کە چاوەڕوانی چارەنووسی ناکۆکییەکەی نێوان قورەیش‌و ڕۆڵەکانیان دەکرد، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ کەوتە ناردنی (سرية)ی شەڕ. یەکەمین سریە بە سەرۆکایەتی حمزەی کوڕی عبدالمطلب کە لە مانگی ڕەمەزاندا بوو دوای حەوتەم مانگی کۆچی بوو ناردییە سەر قورەیش. پاشان لە شانزدەهەم مانگدا، پاشان سریەیەکی تر بە سەرۆکایەتی عبداللەی کوڕی جەحش کە لە مانگی ڕەجەبدا بوو دوای حەڤدەهەم مانگی کۆچی. کە ئەمەیان یەکەمین شەڕبوو ڕوویداو خوێنی تێدا ڕژا، کە لە مانگەکانی حەرامدابوون. چەند ئایەتێك لە سورەتی (البقرة) دەربارەی ئەو شەڕە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: **(يَسألونَكَ عَنِ الشَّهرِ الحَرامِ قِتالٍ فَيه! قُلْ: قِتالٌ فِيه كَبيرٌ، وَصَدٌّ عَن سَبيلِ اللهِ وكُفْرٌ بِه وَالمَسجِدِ الحَرام، وإخراجُ أهلهِ مِنهُ أكبَرُ عِندَاللهِ والفتنةُ أكبَرُ من القَتلِ وَلايَزالُونَ يُقاتِلونَكُم حَتّى يَردُّوكم عَنْ دينِكُم إنْ استَطاعُوا...)** (لبقرة-٢١٧)، واتە: پرسیارت دەربارەی شەڕکردن لە مانگە حەرامەکاندا[1] ـــ لێدەکەن! پێیان بڵێ: شەڕکردن لەو مانگانەدا تاوانێکی زۆر گەورەیەو گوناهێکی زۆری هەیە. بەڵام کافرێتی ئەوان‌و قەدەغەکردنی ئایینی خوا لە موسڵمانان‌و بەرهەڵستیکردنی (زیارەتی کەعبەو، دەرکردنی موسڵمانانی مەککە ـ کە خۆیان خەڵکی ئەوێن ـ لای خوا زۆر زۆر گەورەترە لە شەڕکردن لەو مانگانەدا ـ (واتە ئەگەر ئەوان مەسەلەی کوشتارو شەڕ هەڵگیرساندنیان لەو مانگانەدا بەلاوە تاوانێکی گەورەیە.. ئەو کردەوانەی ئەوان بەرامبەر موسڵمانان دەیکەن زۆر زۆر گەورەترە (لای خوا)، هەروەها تاوانی ناچارکردنی موسڵمان لەسەر وازهێنان لە ئایینەکەی‌و گێڕانەوەی بۆ کوفر، زۆر لە کوشتن گەورەترە، خۆ ئەوان ئێستاش هەر بەردەوامن لەسەر کوشتنیان بەو هیوایەی

١) ئەو مانگانەن کە لەپێش ئیسلامدا شەڕیان تێدا دەوەستێنرا کە بریتین لە (موحەڕڕەم، ڕەجەب، زیلقەعیدە، زیلحەججە).

ناچاریان بکەن بگەڕێنەوە سەر کوفرو گومڕایی. چەندیشیان لەدەست بێت بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستە درێغی ناکەنو دەیکەن.

پاشان شەڕی گەورەی بەدر لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا روویدا.. هەر لەو ساڵەشدا سورەتی "الأنفال" هاتە خوارەوە.

ئەگەر لەروانگەی روداوە واقیعییەکانەوە سەیری مەسەلەکە بکرێت گومانی ئەوە دروست نابێت کە هەڵوێست، هەڵوێستی "بەرگری کردن"ە لەبنکەی بزوتنەوەی ئیسلامی. وەکو کە دڵ بەزیوەکان دەیڵێن. ئەوانەی بەرامبەر واقیعی ئەمڕۆو، هێرشی ڕۆژهەڵاتناسی فێڵاوی خۆ ڕاناگرنو بەزیون!

ئەو کەسانەی پەنا دەبەنە بەر دۆزینەوەو هێنانەوەی بەڵگەی وا، کە گوایە جیهادی ئیسلامی تەنها لەپێناوی بەرگری کردن بووە لە بزوتنەوەی ئیسلامی ئەو جۆرە کەسانە بزوتنەوەی هێرشی رۆژهەڵاتناسی کاری تێکردوون! لەم رۆژەدا کاری تێکردوون کە موسڵمانان بوونو هێزێکی وایان نەماوە، بەڵکو هەر ئیسللامیشیان پێ نەماوە! (مەگەر ئەو موسڵمانانەی کە خوا بەبەزەیی خۆی پاراستونی، کە سوورن لەسەر ئەوەی کە ئامانجی ئیسلام رزگارکردنی "مرۆڤ"ی "سەرزەمین"ە لە هەموو جۆرە دەسەڵاتدارێتییەکی غەیریی دەسەڵاتی خوا، تا خواوستی دەبێتە ئایینی هەموو مرۆڤی سەرزەمین) ئەو جۆرە کەسانە بەهۆی بەزیوی خۆیانەوە دەکەونە هێنانەوەی تەبریراتی رازاوە بۆ جیهادی ئیسلامی!

## قورئـان خـۆی بەسـە بۆ بەڵگـە

بڵاوبوونـەوەی ئیسـلام پێویسـتی بـە تـەبریراتی رازاوە نیـە.. هـەر تەبریراتـە قورئانیەکانی خۆی بەسن.. خوا دەفەرموێت:

**(فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ وَمَنْ يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا وَمَا لَكُمْ لآ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا)**(النساء: ٧٤-٧٦)، واتـە: بـا ئـەو کەسـانەی ژیانی بڕاوەی دنیا دەفرۆشن بەرامبەر ژیانی نەبڕاوەی ئەو دنیا، بـا لـەپێناوی خـودا بجەنگێن، هەر کەسێك لەپێناوی خودا بجـەنگێت، لەئەنجامـدا چ بکوژرێـتو چ زاڵو سەرکەوتوو بێت بەسەر دوژمناندا، ئێمە پاداشتی گەورەی دەدەینـەوە، ئـەوە بۆچـی لەپێناوی خودا ناجەنگێنو جیهاد ناکەن بۆ رزگارکردنی رەشو ڕوتان (المستضعفين)ی خوشكو براتان لە پیاوانو ژنـانو منـداڵان.. ئەوانـەی کـە کافرەکـان رێگـای کـۆچ کردنیان لـێ بڕیونو زەلیلیان کردونو جۆرەها ئەشکەنجەو ئازاریان بۆ پـێش هێنـاون، ئەو بەسەزمانانەی هانایان بۆ خوا دەبردو هاواریان دەکرد: خوایـە لەدەسـت خـەڵکی ئەم وڵاتە (مەککە) ستەمکارە رزگارمان بکەو بە لوتفی خۆت پەناگەو هێمنگـەمان بۆ بـدۆزەرەوەو سەرپەرشـتیارو یاریـدەدەرێکمان لەلایـەن خۆتـەوە بـۆ بنێـرە. ئـەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو موسڵمانن لە پێناوی مەبەستێکی پیرۆزدا دەجەنگێن کـە بریتیە لە سەرخستنی ئایینی خوا لە دنیاو رەزامەندی خوا لە رۆژی دوایـدا ـ بـەڵام ئەو کەسانەی باوەڕیان نەهێناوەو کـافرن لـەپێناوی طـاغووتو هێـزی شـەڕخوازیو

ستەمکاریدا دەجەنگێن. دەسا ئێوە گوێڕایەڵو شوێنکەوتوانی شەیتان بکوژنو بیانفەوتێنن. دڵنیاش بن کە هەوڵو تێکۆشانی شەیتان هیچو پووچ ولاوازە.

**(قُلْ لِلّذينَ كَفَروا إنْ يَنتَهوا يُغْفَرُ لَهُمْ ما قَدْ سَلَفَ، وَإنْ يَعوُدوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَةُ الآولِينَ. وَقاتِلوهُم حتّى لا تكونَ فِتنَةٌ وَيكونَ الدِّينُ كُلَّه لِلّهِ، فَإنْ أنْتَهَوا فَإنَّ اللهَ بِما يَعْمَلُونَ بَصيرٌ. وَإنْ تَوَلّوا فَأعلَمُوا إنَّ الله مَولاكُمْ، نِعْمَ الْمَولى وَنِعمَ النَّصير)** (الأنفال: ٣٨-٤٠)، واتە: بەکافرەکان بڵێ: با واز لە کوفرو گومڕایی بهێننو باوەڕ بە خوا بهێنن، با واز لە شەڕخوازیو کوشتار بهێنن بەرامبەر بە تۆو موسڵمانان. (ئەگەر وازیان هێناو باوەڕیان هێنا) لە گوناەو تاوانەکانی پێشوویان دەبووڕێت. خۆ ئەگەر جارێکی تر بگەڕێنەوە سەریانو تێ‌هەڵچنەوە (لەبەرهەڵستیو کوشتار) ئەوا چۆن دوژمنانی پێغەمبەرانی پێشووم لەنێوبردنو فەوتاندمن، ئەمانیش وا لێ دەکەم. دەبیانکوژن تا هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن نەمینێتو کەس لە ئایینەکەی خوا پاشگەز نەکرێتەوە. وەتا سەرزەمین هەمووی، ئایینی خواوویستی وەردەگرێت. ئەگەر وازیان هێنا (لە کوفرو کوشتارو باوەڕیان هێنا) ئەوا ئیتر خوا خۆی وازیان نەهێناو هەر بەرهەڵستی باوەڕهێنانیان کرد، دڵنیا بن کە خوا لەگەڵ ئێوەیەو ئەویشە سەرخەرو سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرتان. متمانەتان بە لایەنگرێتی خوا هەبێتو گوێ مەدەنە دوژمندارێتی کافرەکان. خواش باشترین سەرپەرشتیارو باشترین کەسە کە زاڵو سەرکەوتوتان بکات.

**(قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ، وَقَالَتْ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللهِ ذَلِكَ قَوْلُهُمْ بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَبْلُ قَاتَلَهُمْ اللهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ، اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ، يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللهُ إِلاَّ أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ)** (التوبة: ٢٩-٣٢)، واتە: ئەو کەسانە بکوژن ـ لە خاوەن ئایینە ئاسمانیەکان ـ کە بەراستی باوەڕیان بەخواو بەرۆژی دوایی

نەهێناوە ئەگەرچی بەقسەی خۆیان باوەڕیان هێناوە ـ ئەوانەی ئەو شتانە بە حەرام دانانێن کە خواو پێغەمبەرەکەی بەحەرامیان داناوە (بەڵکو یاساو دەستوریان لە حیبرو راهیبەکانیانەوە وەردەگرن کە حەڵاڵیان بۆ حەرام حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکەن) ئەوانەی کە باوەڕیان بەدینی ئیسلام نەهێناوە کە دینێکی راستە.. شەڕیان لەگەڵ بکەن تا ناچار دەبن بەمل کەچییەوە (جزیە) دەدەن. جولەکەکان ووتیان عوزێر کوڕی خوایەو، دیانەکانیش ووتیان مەسیح (عیسا) کوڕی خوایە. ئا ئەوەیە قسەو رەفتاریان کە وەك قسەو رەفتاری کافرەکانی پێشوو وایە (ئەوانەی دەیانووت فریشتەکان کچی خوان). خوا فەوتو فەنایان کات، بزانە چۆن خۆ لە حەقو راستی لادەدەنو خۆیانی لێ گێل دەکەن.. جولەکەکان حیبرەکانیانو، دیانەکان راهیبەکانی خۆیان کرد بوو بە خواو لەجێی خوا دایاننا بوون (بەهەشت حەرامو حەڵاڵ کردن لەسەر قسەی ئەوان) هەروەها دیانەکان عیسای کوڕی مەریەمیشیان کردبوو بەخوا، ئەگەرچی فەرمان بە هەموو لایەکیان درابوو کە تەنها خوای تاكو تەنها بپەرستن کە هیچ پەرستیارێکی راستەقینە نیە شایانی پەرستن بێت جگە لەو، پاكو بێخەوشی بۆ خوا لەوەی کە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن. دەیانەوێت نووری خوا (ئیسلام) بە فوو بکوژێننەوە (بەقسەی درۆو دەلەسەو رای نابەجێ) بەڵام خوا ناهێڵێتو نووری خۆی هەر تەواو دەکات، ئەگەرچی کافرەکانیش ئەوە دەبوغزێنن.

ئەمانەشن تەبریراتی خوایەتی خوا لەسەر زەمینو، چەسپاندنی پرۆگرامەکانی خوا لە ژیانی خەڵکیو، راونانی شەیتانو شەیتان خوازانو، سڕینەوەی پرۆگرامی شەیتانخوازیو، ڕیشەکێش کردنو لابردنی دەسەڵاتدارێتی مرۆڤ، کە لەسەر مرۆڤپەرستی دامەزراوە. مرۆڤیش هەموو بەندەی خوان. بەهیچ جۆرێك کەس مافی ئەوەی نیە بەگوێرەی هەواوە هەوەس ورای خۆی حوکمی خەڵکی بکات، ئەمەش بەسە بۆ بنیاتنانی رێسای (**لا اكراه في الدين**= کەس لەسەر ئایین پەروەرێتی نابوغزێنرێت) بەو مانایەی، کە کەس ناچار نەکرێت ئایین وەرگرێت یان نا. هەروەها ئەوە بەسە بۆ دابینکردنی رێسای (هەموو دەسەڵاتێك هی خوایە) یان بڵێین : "هەموو کەس دەبێت خواویست بێت".

ئەمەیە تەبریراتی جیهادکردن بۆ رزگارکردنی مرۆڤی سەرزەمین، رزگارکردنیان لە مرۆڤپەرستی تا بخرێنە ژێر ئالاّی یەکخواپەرستییەوە.. ئەمەش بەتەنها بەس نیە.. ئەم تەبریراتانە بەتەواوی لە دڵی جەنگاوەرە موسڵمانەکاندا چەقیبوو، بۆیە لە هەرکەسێکیان دەپرسی دەربارەی هۆی جیهاد کردنەکەیان نەیادەووت: بۆ بەرپەچ دانەوەی ئەو مەترسیانەیە کە هەڕەشە لە وولاّتەکەمان دەکەن! یان نەیاندەووت: تا دوژمنداریێتی فارس‌و رۆمەکان لەخۆمان دووربخەینەوە! یان نەیاندەووت: جیهاد دەکەین بۆ ئەوەی وولاّتەکەمان زیاتر بەفراوان بکەین، یان تا زیاتر دەسکەوتمان دەست بکەوێت!!.

بەڵکو دەبینین کەسانی وەکو (روبعی کوڕی عامرو، حوذە یفەی کوڕی موحصن‌و، موغیرەی کوڕی شوعبە) یەك لەدوای یەك پێش دەست پێکردنی جەنگی قادسیە ـ کە رۆستەمی فەرماندەی سوپای فارس لێی دەپرسین کە هۆی چیە وا هاتوونەتە ئەو وولاّتانە؟ هەرسێکیان لە سێ ڕۆژو سێجاری جیاوازدا یەك لەدوای یەك ـ دەیانووت:" خوا ئێمەی هەڵبژاردووە تا خەڵکی لە مرۆڤپەرستی رزگار بکەین‌و بیخەینە ژێرسایەی یەکخواپەرستییەوە، وە لەتەسك‌و تاریکی دنیا خەڵك رزگار بکەین‌و بیانخەینە نێو بەرفراوانی دنیاوە. هەروەها تا لە ستەم‌و، زوڵمی دینەکان رزگاریان بکەین‌و بیانخەینە نێو دادپەروەری ئیسلامەوە.. خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیدا دینی خۆی بۆ هەموو مرۆڤ ناردووە.. هەرکەسێك ئەو دینەی لە ئێمە وەرگرت ئەوە لە ئێمەیەو لە ریزی خۆمان وەری دەگرین‌و، وازیشی لێدەهێنین تا هەر لە خاك‌و ئاوی وولاّتی خۆیدا بمێنێتەوە. هەر کەسێکیش لێمانی وەرنەگرت لەگەڵی دەجەنگێین تا سەرەنجام دەکوژرێین‌و دەچینە بەهەشت، یان سەرکەوتن وەدەست دەهێنین".

موسڵمان پێش ئەوەی بچێتە مەیدانی جیهادی سەربازییەوە پێشتر لەدەرونیدا چۆتە مەیدانی جیهادی گەورەترەوە، جیهادی دژی شەیتان.. دژی کەیف‌و هەواو هەوەس‌و ئارەزووەکانی خۆی.. دژی بەرژەوەندییەکانی پەرستنی خۆی، یا هی تیرەو هۆزەکەی.. دژی هەموو جۆرە خۆپەرستییەکی غەیری ئیسلام وویستی.. دژی

هەموو جۆرە پەرستنێکی غەیری خوا پەرستی جەنگاوە.. دژی هەموو بەربەستێك بۆتەوە کە بەرهەڵستی ئەوە دەکات دەسەڵاتی خواویستی بەسەر زەمیندا بڵاوبێتەوە. هەوڵی لابردنی هەموو جۆرە حوکمو دەسەڵاتێکی طاغوتانەی داوە کە دەسەڵاتداریێتی خوایان بۆ خۆیان زەوت کردووە.

## جیهـاد بەرگرییە لە عەقیـدە

ئەو کەسانەی بەڵگەی نارێك دێننەوە بۆ جیهادی ئیسلامی کە گوایە تـەنها بـۆ پاراستنی "نیشتمانی ئیسلامی"یە جا نازانن بەم کارەیان لـە نرخـی "پرۆگـرام" ەکـە کەمدەکەنـەوەو "نیشـتمان" بـەنرختر دەزانـن وەك "پرۆگـرام".. هەڵوێسـتی ئیسـلام ئاوانیە.. ئەم جۆرە ڕایانە نامۆن‌و تازە کەوتوونەتە نێـوبیرو هۆشـی ئیسـلامییەوە.. چونکە لەبیرو هۆشی ئیسلامیدا عەقیدەو ئەو پرۆگرامـەی لەسـەری دادەمـەزرێت‌و، ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو پرۆگرامە رادەپەڕێنێت، برتین لە هەموو شتێك.. بەڵام خـاك ـ بەتەنها ـ هیچ کێش‌و نرخێکی نیە! خاك ـ کە لە ئایدیۆلۆژیی ئیسلامیدا ـ بەنرخە، لەبەر ئەوەیە کە پرۆگرامەکەی خوا حوکمی دەکات، کە عـەقیدە خـوا وویسـتییەکەی تێـدا چەسـپێنراوەو، بۆتـە "دار الاسـلام"و بنکـەی لێـوە دەرچـوونی "مرۆڤــ" بـۆ رزگارکردنی "مرۆڤـ"ی "سەرزەمین".

لەڕاستیدا پاراستن‌و بەرگریکردن لە"دار الاسلام" بریتیە لە پاراسـتن‌و بـەرگریکردن لە عـەقیدەو لە پرۆگرامی ئیسلامی‌و، لەو کۆمـەڵگەیـەی عەقیدەکـەیان وەرگرتـووەو پرۆگرامەکەیان راپەڕاندووە، ئەمـەش وەنەبێت کۆتـا ئامـانجی بزوتنـەوەی جیهـادی ئیسـلامی بێـت، بـەڵکو ئـەو پاراسـتن‌و بـەرگریکردنی شـێوازێکی بـۆ بنیاتنـانی مەملەکەتی خوا‌ویستی لەسەر ئەو خاکە، هەروەها بـۆ ئـەوەی بکرێتـە بنکەیـەکی لێوە دەرچوون بەروە جێگایەکی تری سـەرزەمین، بـۆ رزگـارکردنی هـەموو رەگـەزی مرۆڤـ، چونکە رەگەزی مرۆڤــ مەسـەلەی سـەرەکی ئـەم دینەیـەو، سـەرزەمینیش مەیدانی تێکۆشانێتی!

هەروەکو ووتیشـمان گەیانـدنی رێبـازی خواویسـتی چـەندەها کۆسـپی مـاددی دێتەرێ. وەك دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتانە، وسیستمی کۆمـەڵگاکان‌و، بـاروزروف و... هتد ئەمانەشن دەبنە هـۆی ئـەوەی کـە ئیسـلام بکەوێتـە رێ بـۆ تێـك شـکاندن‌و

ڕیشەکێش کردنیان. تا هیچ کۆشپێك نەمینێت کە ببێتە بەربەست لەنێوان ئیسلام‌و جەماوەری خەڵکدا. تا ئیسلام بتوانێت ویژدان‌و بیروهۆشی خەڵکی بدوێنێت. تا لەزنجیرو کۆت‌و بەربەستی ماددی رزگاریان بکات. ئەوجا سەربەستی ڕایان بۆ زامن بکات‌و سەرپشکیان بکات لە وەرگرتنی ئیسلام یان وەرنەگرتنی.

پێویستە هێرشی رۆژهەڵاتناسەکان ـ کە دەیکەنە سەر جیهادی ئیسلامی ـ پاڵەپەستۆمان لەسەر دروست نەکات‌و، خۆ نەکاتە سەرباری واقیع، هێزی شەڕخوازی جیهانی نابێت وامان لێ بکات ئاوا بگەڕێین بەشوێن بەڵگەو تەبریراتی رازاوە بۆ جیهادی ئیسلامی، کە لەگەڵ سروشتی دینەکەماندا ناگونجێت، بەو هیوایەی کە گوایە بەرگری لەجیهادی ئیسلامی دەکەین. چونکە جیهاد هەر بەردەوام دەبێت ئیتر (وڵاتی ئیسلامی) لە مەترسیدا دەبێت یان نا ؟! پێویستە ئێمە لەکاتێکدا کە واقیعی مێژوو دەخەینەوە پێش چاو، سروشتی ئاینەکەو، ئامانجە گشتییەکەی‌و، پرۆگرامە واقیعییەکەی لەیاد نەکەین. هەروەها پێویستە سروشتی ئایینەکەو هۆ(کاتی)یەکانی بەرگریکردن تێکەڵ یەك نەکەین.

لەهەمان کاتدا ئەوەش دەڵێین کە ڕاستە هەر دەبوو ئیسلام بەرگری لەخۆی بکات، چونکە هەربوونی ئیسلام خۆی لەخۆیدا شۆرشێکە، ئاشکراکردنی ئامانجی ئیسلام لە حاکمێتی خواو، رزگارکردنی مرۆڤ لە زۆر خواپەرستی‌و، بوونی کۆمەڵەیەکی رێکخراوی چالاك‌و پتەو لەژێر سەرکردایەتییەکی نوێی غەیری سەرکردایەتی جاهیلی‌و، دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆی جیاواز کە ئیعتیراف بە غەیری حوکم‌و دەسەڵاتی خوا نەکات.. بوونی ئەمانە هەمووی مومکین نیە کۆمەڵگە جاهیلییەکانی دەوروپشتی ـ کە لەسەر رێسای مرۆڤپەرستی دامەزراون ـ نەهروژێنی‌و هەروا ئاسان لێی گەڕێن، بەڵکو بێگومان لەترسی بوون‌و مانەوەی خۆیان هەوڵی نەهێشتن‌و ڕیشەکێشکردنی دەدەن. کەوابوو هەر دەبێت کۆمەڵگەی نوێ ئامادەبێت بۆ بەرگریکردن لەخۆی.

ئەمە مەسەلەیەکەو ڕوودەدات. هەر لەگەڵ لەدایك بوونی ئیسلام دا پەیدا دەبێت، ئەمە شەرێکەو بەسەر ئیسلامدا دەسەپێ، کە ئیسلام ناچارە بۆی بێتە

مەیدانەوە، هەروەها ئەمە ناكۆكییەكی سروشتییە لەنێوان دوو بووندا ڕوودەدات كە مومكین نیە بتوانن بۆ ماوەیەكی زۆر پێكەوە بژین..

ئەوە هەمووی ڕاستە، بەپێی ئەم هەڵوێستە چار نیەو هەر دەبێت ئیسلام بەرگری لەبوون‌و قەوارەی خۆی بكات، چاریش نیە هەر دەبێت ڕووبەڕووی ئەو شەڕە بەرگری لەخۆكردنە ببێتەوە كە بەسەریدا سەپێنراوە. بەڵام ڕاستییەكی تر هەیە كە لەو گرنگترو ڕەسەنترە.. ئەویش ئەوەیە كە سروشتی بوونی ئەم ئیسلامە خۆی لە یەكەمین هەنگاوی پەیدابوونیەوە بەرەوەپێش دەچێت بۆ ڕزگاركردنی "مرۆڤ"ی "سەرزەمین" لە پەرستنی غەیری خوا، مومكینیش نیە لە سنوری جوگرافی وولاتاندا بوەستێت، وەیان لە چوارچێوەی سنووری میللەتێكدا گیربدرێت، لەو لاوەش "مرۆڤ".. مرۆڤی "سەرزەمین".. هەمووو سەرزەمین، واز لێ بهێنێت هەروا كلۆڵی دەستی شەڕخوازی‌و خراپەكەری‌و مرۆڤپەرستی بێت.

جاری وا هەیە بارودۆخ كار وولاتێكی دژ بەئیسلام دەكات بەوەی ناچاری دەكات خۆ مت كات‌و هێرش نەهێنێتە سەر ئیسلام. ئەگەر ئیسلام لێیگەڕێت‌و هێرشی نەباتەسەر! بەڵام مادام ئەو وولاتە خەڵكی لەسەر مرۆڤپەرستی لە چوارچێوەی سنوری هەرێمی خۆیدا دەهێڵێتەوە، حەزیش دەكات ئیسلام لێیگەڕێت‌و كەس هەقی نەبێت بەسەریەوە، تا هەر دوور بێت لە ئیسلام‌و ئامانجە گشتییەكەی، كە ڕزگاركردنی مرۆڤە! بەڵام ئیسلام هەرگیز ئامادە نیە لەگەڵ ئەو جۆرە وولات‌و سیستمانەدا پەیمانی ئاشتی ببەستێت، بەڵكو دەبێت بەلایەنی كەمەوە جاڕی تەسلیم بوون بدات و، "جزیە" بدات. ئەمەش زامنێكە بۆ ئەوەی كە ڕێگا بكرێتەوە لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامیدا، تا دوور لە بەربەستی ماددی دەسەڵاتدارە دەوڵەتییەكان بتوانرێت ئیسلام بخرێتە بەردەست خەڵكی وولاتەكە.

ئەمەش سروشتی ئیسلامەو، ئەمەشە كارە سەرەكییەكەی، چونكە ئیسلام بریتیە لە حاكمێتی خوا بۆ گشت جیهان‌و، ڕزگاركردنی هەموو مرۆڤ لە هەموو شێوەیەكی غەیری خواپەرستی.

جیاوازییەکی گەورەش هەیە لەنێوان ئەم بیروهۆشەی لە سروشتی ئیسلامەوە هەڵقوڵاوە، لەگەڵ ئەو بیروهۆشەی لە سنوری هەرێمایەتی، یان لەچوارچێوەی نەژادپەرستییەکدا گیر دەدرێت، کە لەترسی گێچەڵی دەست درێژیکردنی سەری نەبێت ناجوڵێت! ئەم بیروهۆشەی دوایی هەموو تەبریراتێکی خۆیی ئیسلامی دەفەوتێنێتو ناهێڵێت ئیسلام خۆبەسەر بکەوێتە رزگارکردنی مرۆڤەکانی دەوروبەری!

تەبریراتی دەرچوونی بزوتنەوەی ئیسلامی ـ لەو وولاتەی کە تێیدایەتی بەرەو وولاتانی تر ـ ئەو کاتە بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا دەردەکەوێت، کە ئەو خاڵە لەقەناعەتدا بچەسپێت کە دینەکە پرۆگرامێکی خوایی یەو بۆ رێکخستنی ژیانی مرۆڤایەتی هاتووە. پرۆگرامێك نیە کە مرۆڤ خۆی دایڕشتبێت. یان رێڕەوێکی تایبەتی کۆمەڵێك خەڵك نیە. یان رێبازێکی تایبەتی جۆرە میللەتو نەژادێك نیە!

ئێمە لەکاتێکدا بەشوێن بەڵگەو تەبریراتی رازاوەدا دەگەڕێین دەربارەی جیهادی ئیسلامی، هۆی ئەوەیە کە ئەم راستییە گەورەیە لەژێرماندا نەماوە، کاتێك ئەوەمان لەبیر دەچێت کە ئەمە مەسەلەی خوایەتی خواو پەرستیارێتی خوایە. کاتێك ئەو راستییە گەورەیە لەژێرماندا دەشێوێت دەکەوینە بەڵگەو تەبریرات هێنانەوەی نابەجێ دەربارەی جیهادی ئیسلامی!

لەسەرەتاوە هەست بەوە ناکرێت کە جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو دوو جۆرە رایەدا، رای ئەوەی کە ئیسلام ناچارە بچێتە مەیدانی ئەو شەڕەوە کە بەسەریدا سەپێنراوە (ئەنجامی بوونی قەوارەی سەربەخۆی خۆیو، ئەنجامی بوونی کۆمەڵگەی جاهیلی تر لە دەوروپشتی. کە حەتمەن هێرش دێننە سەری) و رای ئەوەی کە ئیسلام خۆی هەر لە سەرەتای پەیدابونیەوە دەبێت بجوڵێتو بۆ رزگارکردنی مرۆڤ بچێتە مەیدانی شەڕەوە.

لەسەرەتاوە هەست بەوە ناکرێت کە جیاوازییەکی گەورە هەیە. چونکە ئیسلام لە هەر دوو حاڵەتدا هەر دەچێتە شەڕەوە. بەڵام لە دواییدا هەست دەکرێت کە جیاوازی

زۆر زۆر گەورە هەیە، چـونكە لەكۆتاییـدا هـەموو جـۆرە هەسـتو بـیرو هۆشـێكی ئیسلامی بەشێوەیەكی زۆر گەورەو گرنگ دەگۆرێت.

جیاوازییەكی زۆر زۆر گەورە هەیە لە نێوان ئەوەی ئیسلام ئیعتیبار بكرێت بەوەی كە پرۆگرامێكی خوایی یەو، بۆ ئەوە هاتووە كـە مەسـەلەی خوایـەتی خـوا لەسـەر زەمیندا بهێنێتەدیو، مرۆڤ فێری یەكخواپەرسـتی بكـات، ئەمانـەش هـەموو لـە واقیعدا بهێنێتەدی، لـە كۆمەڵگەیـەكی مرۆڤایـەتی وادا كـە مرۆڤـی تێـدا رزگـار بووبێت لە مرۆڤپەرسـتیو، قەناعـەتی خواپەرسـتی تێـدا هێنرابێتـە دیو، غـەیری شەریعەتەكەی خوا حوكمیان نەكات، كە دەسـەڵاتی خـوا بەسـەر هـەموو كـونجێكی ژیاندا زاڵ بێت، وەیان بە شێوەیەكی تر بڵێین ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە تا خوایەتی خوا رابپەرێنێت.. ئەوسا ئیسلام مافی خۆیەتی كۆسپە ماددییەكانی سەررێی ریشـەكێش بكاتو لایان بدات، پاشان ژیریو ویژدانی خەڵكەكە راستەوخۆ بـدوێنێت، بێئـەوەی هـیچ جـۆرە بەربەسـتێك هـەبێت لـەنێوان ئیسـلامو جـەماوەری خەڵكیـدا. ئـەو بەربەستانەی سیستمی دەوڵەتە سیاسییەكانو، بارودۆخە كۆمەڵایەتییەكانی خـەڵكی دروستی دەكەن.. جیاوازییەكی زۆر زۆر هەیە لەنێوان ئـەوەی ئیسـلام بـەم شـێوەیە لەژێریدا بچەسپێتو لەنێوان ئەوەی ئیسلام بەم شێوەیە لەژێریدا بچەسپێتو، لەنێوان ئەوەی تەنها بەوە دابنرێت كە بریتیە لە سیسـتەمێكی حـوكمی هەرێمایـەتیو، لـە چوارچێوەیەكی تەسكی وڵاتێكدا حوكم دەكات. كە تـەنها مـافی ئـەوەی هەیـە كـە هێرشی هێنرایە سەر لە سنوری وولاتی خۆیدا بەرگری بكات!

ئەمەش رایەو ئەویش رایە... ئەمەش بیرو هۆشەو ئەویش بیروهۆشە.. ئەگەرچی ئیسلام لە هەردوو حاڵەتدا لە جیهاد دایە، بەڵام بیروهۆشی تەواوی ئامانجو ئەنجامی جیهاد جیاوازییەكی زۆر زۆری هەیە. سەرەرای ئـەوەی كـە بەشـێكە لـە مەسـەلەی عەقیدەو، خاڵێكی سەرەكیشە لە دارشتنی نەخشەو پلانو ئاراستەكردنی ئیسلامی .

## تا بەربەست ببێت جیهادیش هەر دەباَ ببێت..

هەر لەسەرەتاوە ئیسلام مافی ئەوەی هەیە بکەوێتە بزوتنەوە بزواندن. چونکە ئیسلام وەنەبێت تەنها بۆ نەتەوەیەك بێت، وەنەبێت رژێمی تەنها وولاتێك بێت، بەڵکو ئیسلام پرۆگرامێکی خوایی یەو، سیستمی حوکمی هەموو جیهانە.. بۆیە مافە ئەوەی هەیە بکەوێتە ڕێو هەموو بەربەستە ماددییەکان ریشەکێش بکاتو لایان بدات.. بەربەستی ئەو رژێمو باروزروفانەی کە سەربەستی "مرۆڤـ" دەگرن لەو عەقیدەیەی هەڵی دەبژێرێت. خۆ هەر ئەوەندە بەسە بۆ ئیسلام کە هەرگیز ئیسلام هێرش ناکاتە سەر کەسێك تا ناچاری بکات عەقیدەکەی وەربگرێت، بەڵکو هێرش دەباتە سەر سیستمو دەسەڵاتدارو بارودۆخەکان تا تاکەکانی خەڵکی لە کارتێکردنی خراپەکاریو هەرزەیی ئەو رێمو باروزروفانە رزگار بکات. ئەو رژێمە بۆگەنانەی سروشتی مرۆڤیان شێواندوەو بیری ئازادی خەڵکیان کۆتو زنجیرکردووە.

ئیسلام مافی خۆیەتی "خەڵکی" لە مرۆڤپەرستی رزگاربکاتو بیانخاتە ژێر ئالآی یەکخواپەرستییەوە. تەنها بەم شێوازەش دەتوانێت ئاگاداربییە گشتییەکەی بسەلمێنێت کە هێناویێتی بۆ بەدیهێنانو چەسپاندنی حاکمێتیو پەروەردگارێتی خوا بۆ گشت جیهان. هەروەها بۆ رزگارکردنی هەموو مرۆڤ.. یەکخواناسی بەپێی ئایدیۆلۆژی ئیسلامو، بەگوێرەی واقیعی کردەوەیی ژیان، مومکین نیە بهێنرێتە دی، مەگەر لەژێر سایەی حوکمێکی ئیسلامیدا. چونکە حوکمی ئیسلامی تەنها رژێمە کە تێیدا خوای گەورە یاسا بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەکە دادەرێژێت چ حاکمو چ حوکم کراو، چ سپی پێستو چ رەش پێست، چ دوور چ نزیك، چ هەژار چ دەوڵەمەند.. یەك یاسای یەکسان، کە هەموو چینو رەگەزو نەتەوەیەك لەژێر سایەیدا چوون یەك دەبن.. بەڵام لە هەموو رژێمەکانی تری حوکمدا، خەڵکەکە بوونەتە بەندەو کۆیلەی هەندێکی تر لەخۆیان، چونکە یاساو رژێمی ژانیان لەو چەندین

کەسەوە وەردەگرن کە بوونەتە یاسادانەرو حاکم، ئەمەش (مەسەلەی یاسادانان) سیفەتی مرۆڤ نیە، بەڵکو یەکێکە لە سیفەتەکانی خواو شیاوی ئەوە. هەر مرۆڤێکیش وای دەرخست کە لەلایەن خۆیەوە یاسای بۆ خەلکی داناوە ـ چ بەدەم بیڵێت، چ بەکردەوە بیسەڵمێنێت ئەوە ئەو کەسە خۆی کردووە بەخواو خوایەتی خوای ـ وەك پیشەیەك ـ بۆ خۆی زەوت کردووە.. هەر کەسێکیش رازی بوو بە کردەوەی ئەو مرۆڤە یاسادانەرە مانای وایە رازی بووە بەوەی ئەو کەسە مافی خوایەتی هەیە، جا ناوی خوای لێ نابێت، یان نا .

ئیسلام وەنەبێت تەنها عەقیدەیەك بێتو بەس، کە هەر بەوەندەی بەدەم بگەیەنرێت بەخەڵکی کۆتای بێت. بەڵکو بریتیە لە پرۆگرامێك کە لە کۆمەڵەیەکی رێکخراوی بزوتنەوەییدا دەردەکەوێت. کە لەپێناوی رزگارکردنی خەڵکی بەرەوپێش هەڵمەتە دەبات. کۆمەڵەکانی تری دەورو بەریشی هاوولاتانیان لەسەر رێبازی خاوویستی پەروەردەناکەنو ژیان بەپێی حوکمی خوایی نابەن بەڕێوە، لەبەر ئەوە ئەرکێکی زۆر سەرەکییە لەسەر ئیسلام کە ئەو حاکمانە لابدات کە دەبنە کۆسپی سەر رێی رزگارکردنی گشتی مرۆڤ. ئەمەش ـ وەکو لە سەرەتاوە ووتمان ـ ئەوەیە کە دەڵێین دەبێت سەرزەمین دینی خاوویستی وەربگرێت. ئیتر بەهیچ جۆرێك گوێڕایەڵی یاسا نادرێتە دەست مرۆڤێك یان چەند کەسانێك. وەکو کە لە رژێمەکانی تردا روودەدات، کە لەسەر بناغەی مرۆڤپەرستی دامەزراون!

نووسەرە موسڵمانە هاوچەرخەکان ـ ئەوانەی بەرامبەر تەوژمی واقیعی ئەمڕۆو، هێرشی پڕفێڵی رۆژهەڵاتناسەکان خۆرانەگرنو دەبەزن ـ لەوە نارەحەت دەبن کە ئەو راستییە ئاشکرا بکەن، بەڵکو دەشترسن. چونکە رۆژهەڵاتناسەکان ئیسلامیان بە مەسەلەی شەڕەشیر نیشانداوە وایان نوسیووە کە ئیسلام بەهێزی کوتەك خەڵکی وا لێکردووە عەقیدەکەی وەربگرن. ئەگەرچی ئەو رۆژهەڵاتناسە شەیتانانە خۆیان زۆرباش دەزانن کە ئەمە راست نیە، بەڵام هەر دەیانەوێت بەو شێوەیە مەسەلەی جیهادی ئیسلامی سووك بکەن.. دوابەدوای ئەوانیش بەستەزمانە بەزیوەکانی لای خۆشیان، بەسادەو ساویلکەیی خۆیان دەیانەوێت بەرگری لە ئیسلام بکەنو

ئەو"تاوان"ە لە ئیسلام دوور بخەنەوە. بەرگری لەخۆکردن! بێئاگـادەبن لـە سروشـتەو کاری سەرەکی ئەم ئیســـلامەو هەر لە سەرەتاوە مەسەلەی "رزگارکردن"ی مرۆڤ لە بیردەکەن.

مێشکی نووسەرە هاوچەرخە ـ بەزیوەکان ـ بەو ڕا ڕۆژئاواییە گیرۆدە بووە کە دەڵێ: "دین" بریتیە لە "عەقیدە"یـەکی رووت کـە لـە زەمـیرو ویـژدانی تاکەکانـدا دەچەسپێت، ئیتر هەقی نیە بەسەر رژێمی واقیعیانەی ژیانەوە. جیهادیش بریتیـە لـە سەپاندنی عەقیدە بەسەر زەمیرو ویژداندا!!

بەڵام لەئیسـلامدا مەسـەلەکە وانیـە. چـونکە ئیسـلام پرۆگرامـی خوایـەو، بـۆ رێکسختنی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایـەتی نێـرراوە. هـەروەها پرۆگرامێکـە لەسـەر بناغەیەك دروست دەبێت کە بریتیە لەوەی تەنها خوا حاکمێتی دەکات ـ ئەمەش لـە حوکم کردنو یاسادانانەدا دەردەکەوێت ـ کە بریتیە لـە حـوکم کردنـی هـەموو جـۆرە هەڵسوکـەوتێکی رۆژانـە! جیهـادیش هەوڵدانـە بـۆ چەسـپاندنی ئـەم پرۆگرامـەو، بنیاتنانیو دامەزراندنی حوکمی ئیسـلامی. عەقیدەکـەش مەسـەلەیەکە پەیوەنـدی بەسەر سەربەستی ڕاوە هەیە لەژێر سایەی رژێمێکی گشـتیدا، دوای ئـەوەی هـەموو جۆرە هێزێکی کاریگـەری دژ دەفـەوتێنرێت.. ئەوسـا ئـیتر مەسـەلەکە لەبناغـەوە دەگۆڕێتەو، شێوەیەکی تەواوی نوێ وەردەگرێت.

کۆمەڵەی ئیسلامی ـ ئەو کۆمەڵەیەی کە پرۆگرامی خوایی کردووە بە ڕێباز ـ لە هەر جێیەك بـوو خـوا مـافی بزوتنـەوەو کەوتنـە ڕێو هەوڵـدانی پـێ دەبەخشـێت، لەپێناوی وەدەست هێنانی حـوکمو چەسـپاندنی سیسـتمی خـوایی، کـە مەسـەلەی عەقیدەی زەمیرو ویژدانیش واز لـێ دەهێنرێت تا بەسەربەستی قەناعـەت بهێنێـت. خۆ ئەگەر خوا فەرمانیدا بە کۆمەڵەیەکی ئیسلامی کە بۆ ماوەیەك دەست لـە جیهادی سەربازیە بگرێتەوە، ئەمە پەیوەندی بە نەخشەی بانگەوازەکەوە هەیـە نـەك بـە ڕێبازەکـەوە. چـونکە ئـەم جـۆرە هەڵوێسـتە مەسـەلەی پێداویسـتی بزوتنەوەیەك نەك مەسەلەی عەقیدەکە.. بەم شێوە ئاشکرایەیە کە دەقێك لە دەقە قورئانیەکان تێبگەین، کە بەدرێژایی مێژووە نوێ بووەکەی ئیسلام هـەروا بـووە وە

دەبێت زۆریش ئاگاربین پلانی قۆناغەکانو نەخشــەی گشــتی ڕێبــازە درێــژو نــەگۆڕی بزوتنەوەکەمان تێکەڵ نەکەین.

## (لا اله الا الله) بەرنامـەی ژیانــە

خواپەرستی.. ئەمە نیوەی روکنی یەکەمی شایەتمانە کە عەقیدەی ئیسلامییە، کە لە بڕیاری (لا اله الا الله)دا دەردەکەوێت. نیوەکەی تری ئەم روکنەش لە بڕیاری (محمد رسول الله)دا دەردەکەوێت کە بریتییە لە وەرگرتنی (خواپەرستی)یەکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ .

دڵی پڕباوەڕی موسڵمان ئەوەیە کە ئەم ڕێسا (قاعدة)یەی بەهەردوو بەشەکەیەوە تێدا چەسپی بێت. چونکە هەموو بنەماکانی تری باوەڕو روکنەکانی تری ئیسلامەتی هەمووی هەر لەم ڕێسایەوە هەڵدەهێنجرێتو لقی چڵی ئەون.. باوەڕهێنان بە فریشتەکانی خواو کتێبە ئاسمانیەکانیو پێغەمبەرانو رۆژی دواییو خێروشەڕی قەزاو قەدەرو نوێژو رۆژوو زەکاتو حەجو، هەروەها سزاکانو سنوری حەڵاڵو حەرامو سەوداو مامەڵەی بازاڕو ڕێسادانانو تەوجیهاتە ئیسلامییەکان، هەر هەموویان لەسەر ڕێسای (خواپەرستی) دادەمەزرێن. سەرچاوەی لێوەرگرتنیشیان پێغەمبەرەکەی خوایەو بەس ﷺ.

کۆمەڵگەی موسڵمانیش ئەوەیە کە ئەم ڕێسایەو هەموو لقو چڵەکانی تێدا درەوشابێتەوە. چونکە مومکین نیە هیچ کۆمەڵگەیەك بە کۆمەڵگەی ئیسلامی دابنرێت کە ئەم ڕێسایەی تێدا نەدرەوشابێتەوە..

شایەتمان (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) بناغەی بەرنامەیەکی تەواوی ژیانە. کە هەموو ژیانی ئوممەتی موسڵمانی لەسەر دادەمەزرێت. ئەستەمیشە ژیانی ئیسلامی بێتەکایەوە پێش ئەوەی ئەو ڕێسایە چەسپی بێت.. هەروەها ئەستەمیشە ژیانێك کە لەسەر ڕێسایەکی تری غەیری ئەو ڕێسایە دروست بووبێتو ئیسلامیش بێت! دیسان هەر زۆر زۆر ئەستەمیشە ژیانی ئیسلامی لەسەر ڕێسایەکی تر، یان چەندین ڕێسای تری شان بەشانی ڕێسای (لا اله الا الله و محمد رسول الله) دابمەزرێت.. مەحاڵە..

**(اِنْ الحُکمَ الاّ للّه أمرَ ألا تَعبدوا اِلاّ اياه ذلكَ الدين القَيّم)** (يوسف–٤٠)

حوکم کردن تەنها هی خوایە کە فەرمانی داوە نابێ جگە لەو هیچ شتێکی تر بپەرستڕێت، ئەوەشە دینی ڕاستو دروست..

**(مَن يطِع الرَسولَ فَقَد أطاعَ اللّه)** (النساء– ٨١)

ئەوەی گوێرایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە گوێرایەڵی خوای کردووە.

❊ ❊ ❊

لەم بڕیارە کورت وبنبڕوکاریگەرەوە چەند خاڵێك وەردەگرین کە هەڵوێستمانی — دەربارەی کێشە سەرەکییەکانی حەقیقەتی ئەم دینەو بزوتنەوە واقیعییەکەی ئیسلامی — لەسەر دادەمەزرێت.

یەکەم : سروشتی کۆمەڵگەی موسڵمانی پێدەناسینەوە.

دووەم : پرۆگرامی پێکهێنانەوەی کۆمەڵگەی موسڵمانی پێ دیاری دەکەین.

سێیەم : شارەزای بەرنامەو ڕێبازی ئیسلام دەبینەوە لە چۆنێتی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگە جاهیلییەکاندا..

چوارەم : فێری چۆنێتی رووبەروو بوونەوەی ئیسلام دەبین لەگەڵ واقیعی ژیانی مرۆڤایەتیدا..

ئەمانەش کێشەی سەرەکینو زۆرگرنگنو لە بەرنامەی بزوتنەوەی ئیسلامی کۆنو نوێدا جێی بایەخن..

❊ ❊ ❊

یەکەم دیاردەی ناسینەوەی سروشتی (کۆمەڵگەی موسڵمان) بریتیە لەوەی کە ئەو کۆمەڵگەیە لە هەموو کاروبارێکدا، لەسەر رێسای (خواپەرستی) دادەمەزرێ ئەو

جۆرە پەرستنەی کە شایەتمان (لا اله الا الله و محمد رسول الله)ی تێدا دەردەکەوێ ئەم پەرستنەش لە بیروباوەڕ، دروشمی پەرستن[1] و، یاساو شەریعەتدا دەردەکەوێ..

١) ئەو کەسەی باوەڕی بە تەنهایەتی خوای گەورە نەبێ ئەوە بە بەندەی خوای تاكو تەنها ناژمێررێ.. خوای گەورە دەفەرموێ: **(وَقالَ الله لاتتَخِذوا الهَين إثنين، اِنّما هوَ اِله واحِد فايّايَ فارهَبون، وَله مافِي السّمواتِ والأرضِ وَلَهُ الدّين واصباً أفغيرَ الله تَتَقون)**. (النحل: ٥١-٥٢)، واتە: بڕیاری دوو خوا بۆ خۆتان مەدەن، بەڵکو خوا تەنها یەکێکەو هەر لەمن بترسن، خوا ئەوەیەکە خاوەنی ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایە، حوکمی دینی تایبەتە بەوەوە ئایا ئێوە لە غەیری خوا دەترسن؟

٢) ئەو کەسەی دروشمە پەرستنەکان لەبەر خاتری یەکێکی تری غەیری خوا بکات ئەوکەسە بەبەندەی خوای تاكو تەنها ناژمێررێ: **(قُلْ اِنَّ صَلاتي وَنسكي وَمَحيايَ وَمَماتي لله رَبّ العالمين ،لا شَريكَ لَه وَبِذلكَ أمرِت، وأنا أَوَلُ المُسلمين )**(الأنعام: ١٦٢-١٦٣)، واتە: بڵێ نوێژمو پەرستنمو ژیانو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانە کە هیچ هاوەڵی نیە، منیش وا فەرمانم پێدراوەو، منیش یەکەمین موسڵمانم.

٣) ئەو کەسەی یاساو شەریعەت لە یەکێکی تری غەیری خواوە وەربگرێ، و لە غەیری ئەو ڕێگایەوە وەربگرێ کە خوا خۆی پێی گەیاندوین، کەرێگای پێغەمبەرەکەی خۆیەتی ﷺ ئەوە ئەو کەسە بەبەندەی خوای تاكو تەنها ناژمێررێ: **(أَمْ لَهُمْ شُرَكاء شَرَعوا لَهمْ مِنَ الدّين ما لَمْ يأذَنْ بِهِ الله)** (الشورى-٢١)، واتە: یان هەڵبەتە خوا هاوەڵی وای هەیە کە یاساو شەریعەتی تری بۆ ئەوان داناوە لەو بوارانەدا کە خوا مۆڵەتی پێ نەداون .

---

[1] دروشمی پەرستن وەك نوێژو ڕۆژو قوربانی کردن و .. هتد (وەرگێر).

(وَما آتاكُمْ الرَسول فَخُذوه، وَما نَهاكُمْ عَنْه فَانتَهوا) (الحشر- ٧) پێغەمبەر ﷺ چیتان بۆ دێنیو پێی ڕازییە، وەری بگرن، وبەرهەڵستی چیشی لێكردن، وازی لێ‌بهێنێن.

كۆمەڵگەی موسڵمان ئاوادەبێ.. ئەو كۆمەڵگەیەی كە تەنها خوادەپەرستێ.. كە دەبێ ئەمەش لە هەموو شتێكیدا دەربكەوێ: لە بیروباوەڕو هەست هۆشی تاكەكانیو، لە دروشمی پەرستنەكانیو لە یاساو ڕێسا كۆمەڵكارییەكانیدا.. هەریەك لایەن لەم لایەنانە، دوابكەوێ یان لەسەر بناغەی (خواپەرستی) دانەمەزرێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە هەموو ئیسلام لادراوەو، هەموو ئیسلام لە بووندا سڕاوەتەوە، چونكە ڕوكنی یەكەمی ئیسلام كە (لا الـه الا الله و محمد رسول الله)یە لاسەنگ بووە.

كە ووتمان: خواپەرستی، لە بیروباوەڕدا دەردەكەوێ، دەبێ ئەوەش بزانین كە داخۆ بیروباوەڕی ئیسلام چیەو چۆنە؟

بیروباوەڕ بریتیە لەو هەستو هۆشەی سەرەنجامی وەرگرتنی حەقیقەتەكانی عەقیدە، لە سەرچاوە خوایی یەكەیەوە دروست دەبێ، كە لە بیرو ئیدراكی مرۆڤدا پەیدا دەبێو، ئەوجا بەگوێرەی ئەوە مرۆڤ هەست بە حەقیقەتی خوا دەكاتو بیروهۆشو فیكری خۆی لەگەڵ دەگونجێنی، هەروەها هەست بە حەقیقەتی ئەو گەردونە دەكات كە تێیدا دەژی — دیارو نادیاری — هەروەها هەست بە حەقیقەتی ئەو ژیانە دەكات كە ئەم سەربەوە — لە دیارو نادیاریدا — هەروەها هەستكردن بە حەقیقەتی خۆی.. واتە حەقیقەتی خودی مرۆڤ..

ئینجا لەسەر بناغەو بەگوێرەی تەوجیهاتی ئەو بیروباوەڕە، ڕەفتاری لەگەڵ خوا دەگونجێنێ بەشێوەیەك كە (خواپەرستی)ی تێدا دەربكەوێو.. ڕەفتاری لەگەڵ گەردونو جیهانی زیندەوەرانو، تاكو كۆمەڵو دامودەزگای مرۆڤایەتی دەگونجێنی، بەشێوەیەك كە هەموو سەرچاوەو ئەسڵێكی لە دینەكەی خوا وەردەگرێ — بەو ڕێگایەی كە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە — تا وەكو (خواپەرستی)ی تێدا

بچەسپێ.. ئـەو بیروبـاوەڕەش بـەم جـۆرە، هـەموو چـالاکییەکی ژیـان دەگرێتـەوە. ئەمەبوو راڤەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامی.

ئەگەر بڕیار لەسەر ئەوەدرا کە"کۆمەڵگەی موسڵمان "ئـاوادەبێ.. دەبـێ بزانـرێ ئایا چۆن ئەو کۆمەڵگەیە پێکدێ؟ ڕێبازی ئەو پێکهاتنە چۆنە؟

ئەو کۆمەڵگەیە: کاتێك پێك دێ، کە کۆمەڵێك خـەڵك بڕیـاردەن کـە پەرسـتنی تەواویان بۆخوا بی‌و بەس، بەهیچ جۆرێك هیچ پەرستنێکیان بۆ غـەیری ئەو نـەبێ،.. نە لە بیروباوەڕیانـدا، وە نـە لـە دروشمـی پەرسـتنیانداو، نـە لـە یاسـاو سیسـتمی حوکمیاندا.

ئەوجا ئـەو کۆمەڵـە دەبـێ بکەوێتـە ڕێکخسـتنی هـەموو گۆشـەیەکی ژیـانی، بەگوێرەی ئەو بناغە تایبەتیەی خواپەرستن.. دەبێ ئەو کۆمەڵە زەمیرو دڵ‌و دەرونیان پاك بکەنەوە، لە باوەڕکردن بە خوایەتی هیچ شتێکی تـری غـەیری خـوا — لەگـەڵی بێ، یان کەمتر لەو - دەبێ دروشمی پەرستنەکانیان پاك بکەنەوە لەوەی لەبـەرخاتری هیچ شتێك یان کەسێك بکرێ غەیری خوا — ئەو شتەش لەگەڵ خوابـێ یـان کـەمتر لەو-، هەروەها دەبێ یاساو شەریعەتیان لەوە پاك بکەنەوە کە لەغـەیری خـوا وەری بگرن — جا چ حوکمی یاساو رژێمێك بێ شان بەشانی تەعلیماتی شەریعەتەکەی خوا وەربگیرێ، چ هەر لە یاساو رژێمێکی تر وەربگیرێ‌و ئیسلام بخرێتە لاوە.

ئەو کاتە — تەنها ئەو کاتەش — ئەو کۆمەڵە بە موسڵمان دەدرێنە قەڵـەم، وئـەو کۆمەڵگەیەی ئەو کۆمەڵە دروستی دەکات بە کۆمەڵگەی موسڵمان دادەنرێ..

بەڵام پێش ئەوەی کۆمەڵێك خەڵکی بێن‌و بڕیاربدەن کە تەنها خوا دەپەرسـتن بـەو شێوەی باسکرا- ئەوە بە موسڵمان نادرێنە قەڵەم‌و، هەروەها پێشئەوەی کۆمـەڵێکی وا ژیانی خۆیان لەسەر بناغەی (خواپەرستی) ڕێك بخەن، کۆمەڵگەی موسڵمانیان پێ نایەتەکایەوە.. چونکە هێشتا یەکەمین ڕێسـا کـە ئیسـلامی لەسـەر دادەمـەزرێ‌و، کۆمەڵگەی موسڵمانی لەسەر پێکدێ — کە شایەتمانە (لا الـه الا الله و محمـد رسـول الله) لە ژیانی کۆمەڵێکدا بە هەردوو بەشەکەیەوە نەهاتۆتەدی..

كەوابوو پێش ئەوەی بیر لە دامەزراندنی سیستمی كۆمەڵایەتی ئیسلامیو، پێكهێنانی كۆمەڵگەی موسڵمان — كە لەسەر بناغەی ئەو سیستمە دادەمەزرێ — بكرێتەوە.. پێویستە یەكەم بایەخ بدرێ بە رزگاركردنی زەمیرو ویژدانی ئەندامانی كۆمەڵەكە لە پەرستنی غەیری خوا — لە هەر شێوەیەك دابێ لەو شێوانەی باسمان كردن — پاشان دەبێ ئەو ئەندامانەی زەمیرو ویژدانیان لە پەرستنی غەیری خوا ڕزگاركردووە، لە كۆمەڵە — جماعە -یەكی موسڵماندا كۆببنەوە..

ئینجا لەم كۆمەڵەیەی ئەندامەكانی زەمیرو ویژدانیان لە پەرستنی غەیری خوا ڕزگاركردووە — لە بیروباوەڕو پەرستنو یاساوەرگرتنیاندا — دەشێ كۆمەڵگەی ئیسلامی پێك بهێنرێ، ئەو كاتەش هەركەس كە ویستی لەو كۆمەڵگەیەدا بژی وە هەركەس ڕازی بوو ﴿بە عەقیدەو پەرستنو یاساو شەریعەتی ئەو كۆمەڵگەیە كە لەسەر بناغەی (خواپەرستن) دامەزراوە، وە یان بڵێین: كە شایەتمان (لا الە الا الله و محمد رسول الله)ی تێدا چەسپێنراوە﴾ دێتو دەچێتە ڕیزی ئەندامانی ئەو كۆمەڵگەیەوە.

دروستبوونی یەكەمین كۆمەڵەی موسڵمان، كە یەكەمین كۆمەڵگەی موسڵمانی لێوە پێك هات، بەو شێوەیە بوو.. بۆیە دروستبوونی هەموو كۆمەڵەیەكی موسڵمانو پێكهاتنی هەموو كۆمەڵگەیەكی موسڵمان هەردەبێ بەو شێوەیە بێ.

كۆمەڵگەی موسڵمان لەوەوە پێكدێ كە خەڵكی — چ تاك بن چ كۆ — لە پەرستنی غەیری خواوە بێتە ڕیزی پەرستنی خوای تاكو تەنهای بێ هاوەڵ — جا چ لەگەڵی بێ، چ لەو كەمتر.. هەروەها لەوەوە پێكدێ كە ئەم جۆرە تاكو كۆیانە بڕیار دەركەن كە دەبێ حكومەتێكی خۆیان هەبێ سەرەوكاری ژیانیان بكات، كە لەسەر بناغەی ئەو پەرستنە تایبەتییە دابمەزرێ .. ئەو كاتە لەدایكبوونێكی نوێی كۆمەڵگەیەكی نوێ دێتەكایەوە، كە هەر لە كۆمەڵگە جاهیلییە كۆنەكەوە گوێزراوەتەوە كە ئێستا ئەم وا ڕووبەڕووی بۆتەوە، بەڵام بە عەقیدەیەكی نوێو، سیستمێكی نوێی ژیان كە لەسەر بناغەی ئەو عەقیدەیە دامەزراوە، كە بریتییە لە شایەتمانی (لا الە الا الله و محمد رسول الله).

لەوانەیە ئەوكاتەی — كە كۆمەڵگەی ئیسلامی پێكدێت — كۆمەڵگە جاهیلییە كۆنەكە، بە هەموو ئەندامەكانیەوە بێنە نێو ڕیزی كۆمەڵگە ئیسلامییە نوێكەوەو،

لەوانەشە نەیەن.. یان لەوانەیە پەیمان ببەستێ لەگەڵ کۆمەڵگە موسڵمانە نوێکەو، لەوانەشە بەربەرەکانێی بکات — ئەگەرچی چەند وەختە مێژووی ڕێبازی خواویستی هەر وابووە کە کۆمەڵەی جاهیلی بەردەوام شەڕی سەختی لەگەڵ کۆمەڵگەی موسڵماندا کردووەو هێرشی گەورەگەورەی هێناوەتە سەر پێشڕەوانی ئەو کۆمەڵگە نوێیە، چ تاك تاك بووبن چ کۆمەڵ، وە لە هەرهەموو قۆناغەکانی دروست بوونیدا. ئەمەش ناکۆکییەکە، کە بەدرێژایی مێژووی بانگەوازی ئیسلامی روویداوە، هەر لەکاتی حەزرەتی نوحەوە —سەلامی خوای لێبێ— تا کاتی محمد ﷺ بێ جیاوازی.

شتێکی بەڵگەنەویستە کە کۆمەڵگە نوێکەی موسڵمانان نە دادەمەزرێتو نە بڕیاری بوونیشی دەدریو نە ئیعتیرافیشی پێ دەکرێت تا نەبێتە خاوەن هێز.. هێزی بیروباوەڕو هێزی خوورەوشتو ورەبەرزیو، هێزی ڕێکخستنو بونیادی کۆمەڵکاریو هەموو جۆرە هێزەکانی تر کە ئەو کۆمەڵگە موسڵمانە دەگەێنێتە ئەو رادەیەی بتوانێت بەسەر کۆمەڵگەی جاهیلیدا زاڵ ببێت، یان هەر هیچ نەبێت هێزێکی وابێت توانای ئەوەی هەبێت کە تەوژمو تینی کۆمەڵگەی جاهیلی ڕاگریو بەرهەڵستی بکات.

❊ ❊ ❊

## بەڵام ئایا (كۆمەڵگەی جاهیلی) چیە؟

### پرۆگرامی ئیسلامی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو كۆمەڵگە جاهیلیانەدا چۆنە؟

كۆمەڵگەی جاهیلی هەموو كۆمەڵگەیەكی غەیری كۆمەڵگەی موسڵمان دەگرێتەوە!

ئەگەر وویستمان بەشێوەیەكی مەوزوعیتر كۆمەڵگەی جاهیلی پێناسە بكەین دەڵێین: كۆمەڵگەی جاهیلی بریتیە لە هەموو كۆمەڵگەیەك كە (تەنها خواپەرستن)ی تێدا نایەتەدی، چ لەبیروباوەڕیدا، چ لە دروشمی پەرستنیدا، وە چ لە یاساو شەریعەتیدا بەپێی ئەم پێناسە مەوزوعیەش هەرچی كۆمەڵگەیەك، كە ئەمڕۆ لە سەرزەمیندا هەیە بە (كۆمەڵگەی جاهیلی) دەژمێررێ .

١) كۆمەڵگەی كۆمۆنیستی (شیوعی) جاهیلییە.. چونكە:

یەكەم: لە بیروباوەڕیدا باوەڕی بەخوای گەورە نیەو، ئینكاری بوونیشی دەكات، بەوەی كە كارگێڕی بوونەوەر دەداتە دەست (مادده) یان (سروشت)و كاروكارتێكردنی ژیانو مێژووی مرۆڤ دەداتە دەست (ئابوری) یان (ئامێرەكانی بەرهەم هێنان).

دووەم: رژێمێكی دامەزراندوەو - دایدەمەزرێنێ - كە حزبی تێدا دەپەرسترێ (ئەگەر ڕاست بیو سەركردایەتی كۆمەڵكاری - القیادة الجماعیة - حەقیقەتێكی واقیعی هەبیو وابێ) نەك بۆ خوای مەزن! هەروەها هەرەمییەكی تر كە دەكەوێتە ئەو جۆرە بیروهۆشو ئەو جۆرە رژێمەوە وەك بەفیرۆچوونی سیفاتی (مرۆڤ) بەو ئیعتبارەی كە (داواكارییە سەرەكییەكان)ی تەنها داواكاری ئاژەڵین كە بریتین لە: خۆراكو خواردنەوەو جێگاو تێركردنی سێكس (ئارەزوی جنسی) - هەروەها مەحرومكردنی مرۆڤ لە هەموو پێویستیە (مرۆڤایەتیەكانی) كە لە ئاژەڵ جوێ دەكرێتەوە پێی، وەك یەكەم: عەقیدەیەكی خوازویستیو، سەربەستی هەڵبژاردنو، سەربەستی ڕادەربڕین

هەروەها سەربەستی دەربڕینی ڕای خۆی بەرامبەر — (ئەندامێتی خۆی) کە بە گەورەترین سیفەتی (مرۆڤایەتی) دەژمێرری، ئەو ئەندامێتییەی لەتاکە خاوەنێتی (الملكية الفردية)دا دەردەکەوێ. وە هەروەها سەربەستی دەربڕینی ڕای خۆی بەرامبەر جۆری کارو پسپۆری تێیداو، دەربڕینی ڕای هونەری (خۆیی — ذاتی).. هەتا ئاخرشت کە (مرۆڤ) لە (ئاژەڵ) یان لە (ئامێر) جیادەکاتەوە! چونکە بیروهۆش‌و باوەڕی کۆمۆنیست (شیوعی)و رژێمی کۆمۆنیست (شیوعی) وەکویەکن. کە مرۆڤ لەژێر سایەیاندا زۆر زۆر دێتە خوارەوە بۆ پلەی ئامێر!

٢) کۆمەڵگەی بت پەرستی — کە هەتا ئێستاش لە هیندستان‌و یابان‌و فلیپین‌و ئەفریقادا هەرهەن — ئەم کۆمەڵگایانەش جاهیلین.. چونکە:

یەکەم : بیروباوەڕیان لەسەر ئەوە دادەمەزرێ کە غەیری خوا — الله — خوایانە — چ بڕیاری ئەوە بدەن کە لەگەڵ خوادا یەکێکی تر هەیە مافی خوایەتی هەبێ، چ لەو کەمتر دانرابێ.

دووەم: سیستەم‌و یاسای حوکمی خۆی هەیە کە غەیری خوای‌ویستین. جا ئەم سیستەم‌و یاسایانە چ لە پەرستگاو کاهین‌و سەدەنەو ئەفسانەگەرو سیحربازو پیرەکانیانەوە وەرگرتبێ، چ لەدەستی بێدین - علمانی — یەکانیەکانەوە کە دەسەڵاتی یاسادانانیان هەیە، کە لە شەریعەتی خوایی یەوە وەری ناگرن.. واتە حاکمێتی‌و دەسەڵاتی باڵایان هەیە کە بەناوی (گەل) یان بەناوی (حزب) یان بەهەر ناوێکی ترەوە بێ، حوکم دەکەن ئەمەش جاهیلیەتە چونکە حاکمێتی باڵا بۆ خوا نەبێ بۆ هیچ کەسێکی تریان شتێکی تر نیە. ئەم حاکمێتی یەش بەو ڕێگایە دەبێ، کە پێغەمبەر ﷺ ڕای گەیاندووەو، بەهیچ شێوەیەکی تر نابێ.

٣) هەروەها هەموو کۆمەڵگە مەسیحی‌و جولەکەش کە لەسەرزەمیندا هەن هەر جاهیلین چونکە یەکەم: لە عەقیدەو باوەڕی ڕاستی لایانداوە، چونکە خوایەتی خوای گەورە بەتاك دانانێن، بەڵکو هاوەڵی بۆ پەیدادەکەن، لە یەکێك لە

شێوەكانی هاوەڵ بۆ خوا پەیداكردن – الشرك –دا. جا ئایا بەبڕیاردانی ئەوەبێ كە خوا كوڕی هەیە، یان بە باوەڕیە سێ پیرۆزەكە – الثالوث الأقدس – وەك لە مەسیحیدا هەیە، یان بەوەی كە بەراستی دەرك بەخوا ناكەن، یان پەیوەندی نێوان بەندەو خوا لەسەر بناغەیەكی غەیری حەقیقەتی خۆی دەناسنو بڕیاری لەسەر دەدەن.

**(وَقالَتِ اليَهود عُزَير ابنَ الله، وَقالَتِ النّصارى: المَسيح ابنَ الله . ذلكَ قَولهُمْ بِأَفواهِهِمْ، يضاهِئون قَولَ الذينَ كَفَروا مِنْ قَبل . قاتَلَهم الله، أَنّى يؤفَكونْ)** **(التوبة– ٣٠)**، واتە: جوولەكەكان وتیان: عوزێر كوڕی خوایە، هەروەها مەسیحییەكان وتیان: مەسیح (عیسا) كوڕی خوایە، ئەمە قسەی سەردەمیان بوو، هەر قسەی ئەوانەی پێشوویانەو دەیكەنەوە، ئەوانەی كافربوون، هەی خوا بیانكوژێ چۆن لەحەق لادەدەن!

**(لَقَد كَفَرَ الذينَ قالوا إِنّ الله ثالِث ثَلاثة . وَما مِنْ اِله الاّ اِله واحِد، وإنْ لَمْ يَنتَهوا عَمّا يَقولون لَيَمَسّنَ الذينَ كَفَروا مِنْهم عَذاب أَليم)** **(المائدة– ٧٣)**، واتە: ئەوانەی ووتیان خوا سێیەمین كەسە، كوفریان كرد، یەك خوا نەبێ هیچ خوایەكی تر نیە، ئەوانە ئەگەر كۆتایی بەوە نەهێنن كەدەیڵێن، ئازارێكی زۆر كاریگەرو بەژان كافرەكانیان دەگرێتەخۆ ..

**(وَقالَتِ اليَهود يَد الله مَغلولَة، غلّت أيديهِم وَلعِنوا بِما قالوا . بَل يَداه مَبسوطَتان ينْفِق كَيفَ يَشاء)** **(المائدة– ٦٤)**، واتە: جولەكەكان وتیان: دەستی خوا داخراوە، هەی دەستیان بڕزێ، مادام وایان ووت ئەوا لەرەحمەتی خوا دوور خرانەوە، خۆ هەردوو دەستی خواكراوەنو هەر چۆنێك حەزبكات دەبەخشێت..

هەروەها بۆیە كۆمەڵگەی مەسیحیو جولەكە بە كۆمەڵگەی جاهیلی دادەنرێن چونكە دروشمی پەرستنو هەڵسوكەوتیان لەبیروهۆشێكی عەقیدەیی گومڕاو لەڕێ لادراوەوە، وەرگیراوە..

هەروەها شەریعەت وسیستمەكەشیان لەسەر (خواپەرستی) دانەمەزراوە، چونكە مافی حاكمێتیان تایبەت بەخوا نەكردووەو دەسەڵاتەكەی خۆشیان لە شەریعەتەكەی

خواوە وەرنەگرتووە. بەڵکو کۆمەڵێ مرۆڤیان داناوە کە مافی حاکمیێتی باڵایان داونەتە دەست ئەوەش خوا نەبێ هیچ کەس مافی ئەوەی نیە.. هەر لەکۆنەوە، خوای گەورە بەکافر ناوی بردوون، چونکە ئەو مافەیان دابووە دەست حیبرو راهیبەکانیان (پیاوانی دینی جولەکەو مەسیحی) کە ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان یاساو شەریعەتیان بۆ دادەنانو خەڵکەکەش لێیان وەردەگرتن.

(﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾)(التوبة– ٣١)، واتە: حیبرو راهیبەکانی خۆیان کردبوون بەخوا، وە لە جێی خوا دایاننابوون – هەروەها مەسیح (عیسا)ی کوڕی مەریەمیش – هەروا ئەگەر چی ئەمان وا فەرمانیان پێدرابوو کە تەنها یەك خوا بپەرستن، کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو. بێ خەوشیو پاکی بۆ خوا، لەوەی ئەوان ئاوا هاوەڵ بۆ خوا پەیدادەکەن!

ئەوان وەنەبێ حیبرو ڕاهیبەکانیان بە خوا زانیبێو دروشمی پەرستنەکانیان بۆ کردبن، بەڵکو تەنها دانیان بەوە دانابوو کە ئەوانە مافی حاکمیێتیان هەیە. بەوەی هەرچی یاسایەك کە ئەوان بۆیان دادەنان وەریان دەگرت، یاسای وا کە خوا پێی ڕازی نیە. لەبەرئەوە زۆر لەجێی خۆیدایەتی کە هەر بەکافر دابنرێن. ئەم مافەشیان داناوە بۆ چەند کەسانێك کە نەحیبرنو نە راهیبشن.. هەموویان هەر وەکو یەکن..

لە کۆتایدا دێینە سەر ئەو کۆمەڵگانەی خۆیان وا حاڵی دەکەن کە (موسڵمانن) ئەم کۆمەڵگانەش کە بە جاهیلی دادەنرێن، لەبەر ئەوە نیە وا بزانن یەکێکی تر هەیەو دەبێ لەگەڵ خوای گەورە وەك خوا دابنرێن یان لەبەرئەوە نیە کە دروشمی پەرستنەکانیان بۆ غەیری خوا بکەن، بەڵکو لەبەرئەوە بە کۆمەڵگەی جاهیلی دادەنرێن، چونکە پەرستنەکانیان بەتەنها بۆ خوا نیە. ئەمەش بەئاسانی لە ژیانیاندا دەردەکەوێ. چونکە ئەو کۆمەڵگانە ئەگەرچی باوەڕیشیان بەتەنها خوایەتی خوا هەیە بەڵام گەورەترینو گرنگترین سیفەتی خوایەتییان داوەتە دەست غەیری خوا، کە حاکمیێتییە.. ئەویش بەوەیە کە ڕێگا دەدات غەیری خوا سیستەمو شەریعەتو یاساو

ڕێسای ژین‌و خوڕەوشت‌و نەریت‌و هەموو بنەماکانی تری ژیانیان بۆ دابرێژێت..
خوای گەورەش دەربارەی ئەم کۆمەڵگایانە دەفەرموێ:

(وَمَنْ لَمْ يَحكُمْ بِما أَنزَلَ الله فَأولئِكَ هُمْ الكافِرون) (المائدة-٤٤) واتە: هەر کەسێك حوکم بەوە نەکات کە لەلایەن خواوە نێراوەتە خوارەوە — کە قورئانە — ئەوانە کافرن.

وە دەربارەی ئەوانەی حوکمیان دەکرێت دەفەرموێت:

(أَلَمْ تَرَ اِلى الذينَ يَزعمونَ أَنَّهم آمَنوا بِما أنزَلَ إليكَ وَما أَنزَلَ مِنْ قَبلِكَ يريدونَ أن يَتَحاكَموا اِلى الطاغوتِ. وَقَد أَمَروا أَنْ يَكفروا بِهِ) تا دەگاتە( فَلا وَربّكَ لا يؤمِنونَ حَتى يَحكموكَ فيما شَجَرَبَينَهم ثُمَّ لا يَجدوا فِي أنفسِهِم حَرجا" مِمّا قَضَيتَ وَيسّلموا تَسليما") (النساء: ٦٠-٦٥) واتە: ئەوانە نابینی کە خۆیان حاڵی کردووە گوایە باوەڕیان بەوە هێناوە کە بۆتۆو، بەوەی لەپێش تۆدا هاتۆتە خوارەوە. هەر ئەوانەش کە دەیانەوێ داوەری خۆیان ببەنە لای طاغوت (هەموو رژێم‌وکەسێکی خوا نەوویستە)، ئەگەرچی فەرمانیشیان پێدراوە کە طاغوت بە کافر دابنێن‌و شوێنی نەکەون.. پاشان دەفەرموێ: سوێند بێ بە خواکەی تۆ، باوەڕیان نیە تا وەکو تۆ نەکەن بەحاکم لەو کێشانەی لە نێوانیاندا ڕوودەدات. جا ئەوکاتەی کە حوکمت کردن هیچ گرێیەك لە دڵیاندا نامێنێ: ئەوجا بە موسڵمان حسابن چونکە بەتەواوی خۆ تەسلیم دەکەن.

هەروەها لەوەو پێش خوا باسی جولەکەو مەسیحی کرد کە کافرن‌و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوەو لەڕێبازی خواپەرستی لایان داوە، وە حیبرو راهیبەکانیان کردووە بەخوا. چونکە ئەو دەسەڵاتەی بۆ خوایە داویانەتە حیبرو ڕاهیبەکانیان ئەمانەش کە خۆیان ناوناوە (موسڵمان) ئەو ماف‌و دەسەڵاتەیان داوە بە مرۆڤی وەکو خۆیان!

خوای گەورە ئەمەی بەهاوەڵ پەیداکردن — شرك — لەسەر جولەکەو مەسیحی تۆمار کرد چونکە وەك ئەوەی حساب کرد کە ئەوانە عیسای کوڕی مەریەم بەخوا دادەنێنن وەسیفاتی خوایەتی پێ دەبەخشن، ودەیپەرستن.. ئەمەش لادانە لە ڕێبازی

خوا بەیەکناسینو وپەرستنی خوای تاك وتەنها، هـەروەها ئەمـە چوونەدەرەوەیە لـە دینەکەی خواو لە ڕێبازی (لا اله الا الله).

هەندێك لەم کۆمەڵگانە بەئاشکرا (بـێدینی - علمـانی) دەردەبـڕن، ئـەوەش ڕوون دەکەنەوە کەبە هیچ جۆرێك پەیوەندیان لەگەڵ دیندا نیە.. هەنـدێکی تریشـیان وا دەردەبڕن کە گوایە (ڕێزی دین دەگرن) بەڵام دین لە سیستمە کۆمەڵایەتییەکـەیان دەکەنە دەرەوەو دەڵێن ئێمە ئینکاری (نادیار) دەکەینو بەس! گوایـە سیسـتمەکەیان لەسەر بناغەی بێدینی — (علمانی) دادەڕێـژن — ئـەو ئینکاریکردنـەی نادیـاریش، لەبەر ئەوەیە کە زانست پێچەوانەی شتی نادیارە! ئەمەش پاڵانتەیـەکی نەفامانەیـەو نەزانەکان نەبێ، کەس نایڵێ[1]. هەندێکی تریشیان حاکمێتی خوای گەورە بۆ خۆیـان زەوت دەکەن، وە خۆیان چۆن حەز بکەن یاسـا وا بۆخۆیـان دادەنـێن! پاشـان دەڵـێن: ئەمە شەریعەتی خوایە! بەڵام ئەمانە هەموویان لەوەداچوون یەکن کە پەرستنەکانیان بۆ خوا نیە..

کۆمەڵگەی ئیسلامی ئیعتراف بە ئیسـلامەتی هـیچ یـەکێك لـەم کۆمەڵگایانـە ناکات کە هەنو هیچ ئیعتبارێکیان بۆ دانانێ.

ئیسلام تەماشای ئەو لافیتەو دروشم ونیشانانە ناکات کە ئەم کۆمەڵگایانە هـەر چەند لێك جیاوازبن — لەناو خۆدا — بەرزی دەکەنـەوە.. چـونکە هـەموویان لەیـەك حەقیقەتدا یەك دەگرنەوە.. ئەویش ئەوەیە کە ژیانیـان لەسـەر پەرسـتنێکی تـەواوی یەکخواناسین دانامەزرێ.. هەروەها ئەو کۆمەڵگانەش کە خۆیان ناونـاوە موسـڵمان، لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تردا، لەیەك جێدا یەك دەگرنەوە کە ئەویش بەشداربوونیانە لـە سیفەتی (جاهیلێـتی)دا.

ئەمەش دەمانباتەوە بۆ لای کۆتا کێشەمان، کە بریتیـە لـە چـۆنێتی بەرنامـەی ئیسلامی بەرامبەر هەموو واقیعێکی مرۆڤ.. ئەمڕۆو سـبەی.. تـا ئـاخر زەمـان..

---

١) بڕوانە بەشی حەوتەم لە (في ظلال القرآن) تفسیری ئـەو ئایەتـەی خوا دەفەرموێ: (وعنده مفاتیح الغیب لایعلمها الا هو).

ئەوەی لە بەندی یەكەمی بەشی (سروشتی كۆمەڵگەی موسڵمان)دا بڕیارمان دا كە وتمان ئەو سروشتە لەسەر (خواپەرستی) دامەزراوە، لێرەدا سوودی لێ وەردەگرین..

دیاربكردنی چۆنێتی ئەو سروشتە، وەڵامێكی كتومتی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە كە دەڵێ: ئەو بناغەیە چیە كە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر دادەمەزرێت؟ ئەو سەرچاوەیە چیە، كە دەبێ بۆ لێوەرگرتن لێی دیاری بكرێتو بشگەڕێینەوە سەری؟ ئایا ئەو سەرچاوەیە هەر دینەكەی خوایە كە وەك بەرنامە بۆ ژیان دانراوە، یان ئەو واقیعەیە كە مرۆڤی تێدادەژی، هەر چۆنێك بێت؟

لێرەدا ئیسلام بێ چەندوچوونو منجەمنج كردن بە ئاشكرایی وەڵامان دەداتەوە:

ئەو سەرچاوەیەی كە دەبێ ژیانی مرۆڤایەتی – لە هەموو كاروبارێكیدا – بگەڕێتەوە سەری، بریتیە لە دینەكەی خوا كە بۆ ژیانی داناوە.. وەبریتیە لە بڕیاردانی (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) كە یەكەمین ڕوكنی ئیسلامەتییە، تا ئەو سەرچاوەیەش ئیعتراف بەو بڕیاری (لا اله الا الله ومحمد رسول الله)یە نەكات مومكین نیە بچەسپیو بێتەدی.. چونكە (خواپەرستی)و شێوەی وەرگرتنی ئەو پەرستنە لەو ڕێگایەوە نەبێ، كە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە، مومكین نیە كۆمەڵگەی موسڵمان بهێنێتە دی.. پاشان ئیسلام دەفەرموێ:

**(وَما آتاكُم الرّسول فَخذُوه، وَما نَهاكُمْ عَنه فَانْتَهوا)** (**الحشر– ٧**)، واتە: پێغەمبەر ﷺ چیتان پێ ڕادەگەێنیو پێی ڕازی یە، وەریبگرن، بەرهەڵستی چیشی لێكردن وازی لێبهێنن.

پاشان ئیسلام دەپرسێ:

**(أأَنتُم أَعلَم أَم الله)**؟ (البقرة–١٤٠)، واتە: چما ئێوە زیاتر دەزانن یان خوا؟

هەر خۆشی وەڵام دەداتەوە:

**(وَالله يَعلَم وَأَنتُم لا تَعلَمونْ)**(البقرة– ٢١٦)، واتە: خوا دەزانیو ئێوە نازانن.

**(وَما أوتيتُم مِن العِلم الاّ قَليلا")**(الاسراء– ٨٥) واتە: ئێوە شتێكی كەم نەبێ لە زانستی هیچتان نەدراوەتێ .

ئەو کەسەی کە زانایە — ئەوەی کە بوونەوەرو مرۆڤی دروست کردووەو ڕۆزیدەرە هەر ئەویشە کە حوکم دەکات، دەبێ هەر دینەکەی ئەو بەرنامەی ژیان بێتو ببێتە سەرچاوەی ژیان.. چونکە ئەنجامی بیروهۆشو ئایدیۆلۆژیو بۆچوونی مرۆڤ خراپەکاریو بەدبەختیو لەراستی لادانە چونکە هەمووی لەسەر بناغەی زانستی مرۆڤ دادەمەزرێن کە هیچ نازانێ، ئەو مرۆڤەی شتێکی کەم نەبێ لە زانستی هیچی نەدراوەتێ!

دینەکەی خواش وەنەبێ ئاڵۆز بێ، بەرنامەکەشی کە بۆ ژیانی داناوە وەنەبێ ڕوونو ئاشکرا نەبێ، بەڵکو بەشی دووەمی شایەتمان، کە (**محمد رسول الله**)یە دیاری کراوە، لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ بە ووتارو ڕەفتار خۆی دەقەکانی دیاری کردووە.. لەهەرچی کاتێکدا دەق هەبوو، ئەوە حوکمەو ڕادەپەرێنرێ. چونکە اجتهاد لەدەقدا ناکرێ. ئەگەر دەق نەبوو (چ دەقی قورئان بێ چ هی حەدیس) ئەو کاتە بەپێی ئەو ئەسڵانەی لە بەرنامەکەی خوادا دیاریکراون، ئیجتهاد دەکرێ، نەك بەپێی هەواو هەوەسو ئارەزوی مرۆڤ:

**(فَأن تَنازَعتُمْ في شَيء فَردّوه اِلى الله وَالرّسول)**(**النساء- ٥٩**)، واتە: ئەگەر ناکۆکیتان لە شتێکدا بۆ دروست بوو، بگەڕێنەوە سەر فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

سنوری ئەسڵەکانی ئیجتهادو، شێوەی وەرگرتن لە قورئانوحەدیس، دیاریکراونو، بڕیاریان لەسەر دراوە، ئەوانیش وە نەبێ ئاڵۆزبن، یان ئاشکرانەبن..

کەس بۆی نیە لە خۆیەوە یاسا دەرکاتو بڵێ: ئەمە شەریعەتی خوایە. مەگەر لەو کاتەدا کە حاکمێتی بالاّ لە پەرستنی خواوە هەڵ هێنجراوەو فەرمانە خوایی یەکان ئاشکران.

ئەو کاتەی کە تەنها ئەو پەرستنە دەبێتە سەرچاوەی دەسەلاّتدارێتی خوایی، نەك (گەل)یان (حزب) یان مرۆڤی تر. دەبێ بۆ ئەوەی بزانرێ کە خواچی دەوێ، مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ قورئانو حەدیسی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش ئەوە نیە هەر کەسێك بێو بە ناوی خواوە لافی دەسەلاّت لێبدات. وەك ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئەوروپا

بەناوی (سیۆکراس) یان (حوکمی پیرۆز)ەوە بینرا. ئەوە لە ئیسلامدا نیە. کەس بۆی نیە بەناوی خواو پێغەمبەرەوە ﷺ حوکم دەربکات. چونکە هەموو دەقەکان ئاشکران.

ووشەی (دین واقیعییە) خەڵکی بەهەڵە لێی تێدەگەنو، خراپ بەکاری دێنن بەڵێ ڕاستە دین واقیعییە. بەڵام کام واقیع؟

دین بۆ واقیعێکە کە دینەکە خۆی هێنابێتیە دی، بەگوێرەی بەرنامەکەی خۆی هاتبێتە کایەوە، کە لەگەڵ فیطرەی مرۆڤدا دەگونجێو، حەقیقەتی پێویستییەکانی (مرۆڤایەتی) پێ دێتەدی کە هەموو شتێك دەگرنەوە. ئەو پێویستیانەی کە خوا بڕیاری لەسەرداوە کە خۆی مرۆڤی دروست کردووەو خۆشی دەزانێ چۆنی دروست کردووەو پێویستییەکانی چین وچۆن چارەسەردەکرێن .

**(ألا يَعلَم مَنْ خَلَق، وَهوَ اللَطيف الخَبير)** (**الملك– ١٤**)، واتە: بۆ ئەو کەسەی دروستی کردووە نازانێ ؟ کە شارەزاو ئاگاداریشە.

دین وەنەبێ لەگەڵ هەموو جۆرە واقیعێکدا بگونجێو شایەتی چاکی بۆ بداتو بە حوکمێکی شەرعی پشتگیری بکاتو بڵێ: ئەمە ڕاستەو لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگەی موسڵماندا دەگونجێ، یان لە شێوەی لافیتەیەکی نوسراودا ئاشکرای بکات: نەخێر ئەوە مەبەستی دین نیە! بەڵکو دین کە ڕووبەڕووی واقیع دەبێتەوە، پێش هەموو شتێك ئەو واقیعە بە تەرازوی خۆی دەکێشێ: ئەوجا ئەوەی خۆی دەیەوێ دەیهێڵێتەوەو بڕیاری لەسەر دەداتو، ئەوەی خۆشی نایەوێ بڕیاری سڕینەوەی دەدات. چونکە ئەگەر ئەو واقیعەی بەدڵ نەبوو، ئەوە هەر ڕەفزی دەکات.

واقیعی دین ئەوەیە کە دینەکە خۆی دەیهێنێتە کایەوە، دەبێ هەر بەم مانایەش بە ئیسلام بووترێ (دینەو بۆ واقیعە)، چونکە (دین واقیعییە) لە مەفهومی ڕاستیدا دەبێ بەوجۆرە بێ.

لەوانەیە لێرەدا پرسیارێك خۆقوت بکاتەوە:

**(ئایا نابێ بەرژەوەندی مرۆڤ خۆی واقیع بۆ خۆی داڕێژێ؟) !**

ئەوکاتە لەوەڵامدا جارێکی تریش دێینەوە سەر پرسیارو وەڵامە خوایی‌یەکە:

**(أَأنتُم أَعلَم أمْ الله)**؟ (البقرة-١٤٠)

**(وَالله يَعلَم وَأنتُم لا تَعلَمونْ)** (البقرة-٢١٦) .

بەرژەوەندی مرۆڤ لە شەریعەتەکەی خوادایە بەو شێوەیەی کە خۆی ناردویێتی‌و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕایگەیاندووە.. خۆ ئەگەر رۆژێك مرۆڤ وا تێگەیشت کە بەرژەوەندی مرۆڤ لە سەرپێچیکردنی شەریعەتەکەی خوادایە، ئەوە:

یەکەم: (گومان‌و هەڵە)یەو لە هەوەس پەرستییەوە هاتووە:

**(إن يَتّبعونَ الاّ الظَّنَ وَما تَهوى الآنفُس، وَلَقدْ جاءَهمْ مِنْ رَبِّهِمْ الهدى . أَمْ للأنسان ما تَمَنى ؟! فَللهِ الآخِرة والأولى)** (**النجم: ٢٣-٢٥**)، واتە: ئەوانە تەنها دوای گومان‌و هەواو هەوەس دەرون کەوتوون، ئەگەر چی ڕێنمایی‌و ڕێپیشاندانیان لەلایەن خوای خۆیان بۆ هاتووە. یان هەڵبەتە بەوە دەبێ کە مرۆڤ خۆی خۆزگەو ئاواتی بۆ دەخوازێ؟ بەڵام خۆ سەرەتاو کۆتا هەر بۆ خوایە..

دووەم: ئەوانە (کافرن) چونکە (ئەگەر یەکێك بڵێ: بەرژەوەندی مرۆڤ لەوەدایە کە سەرپێچی شەریعەتەکەی خوا بکرێت) مومکین نیە فری بەسەر دینەوە بمێنێ، وە مومکین نیە بە شوێنکەوتووی ئەم ئیسلامە بدرێتە قەڵەم.

# شەریعەتێکی گەردونی

ئیسلام کاتێك بونیادی بیروباوەڕەکەی لە زەمیرو واقیعدا، لەسەر بناغەی (خواپەرستی) دادەمەزرێنێ: وادەکات کە ئەو پەرستنە وەکو یەك لە بیروباوەڕو پەرستنو یاساو شەریعەتدا دەربکەوێ، بەو ئیعتبارەی کە ئەو خواپەرستییە لەو شێوەیدا دەبێتە ناوەڕۆکی کردەوەیی بڕیاری (لا الە الا اللّٰه) هەروەها چۆنیەتی وەرگرتنی ئەو پەرستنەش کە تەنها لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەبێتە ناوەڕۆکی کردەوەیی بڕیاری (محمد رسول اللّٰه)..

ئیسلام کاتێك بونیادی بیروباوەڕەکەی لەسەر ئەو بناغەیە دادەمەزرێنێت بەو جۆرەی کە بڕیاری (لا الە الا اللّٰه ومحمد رسول اللّٰه) دەکاتە بناغەی هەموو ژیانی ئیسلامیو سیفاتو سیما ئەو بەرنامەیەش ئاوا دەناسێنێ .. ئیسلام کە ئەو بونیادو پەیکەرەی خۆی بەو شێوە نایابە دەگمەنەی تایبەت بەخۆی دادەمەزرێنێت، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ هەر هەموو ئەو سیستمو دیدانەی کە مرۆڤایەتی ناسیونی..

ئیسلام کاتێك کە ئەمە دەکات، لەبەرئەوەیە دەیەوێت هەموو کارو ڕەفتارو دیدو هەڵسوکەوتو حوکمێك بگەرێتەوە بۆ ئەو ئەسڵە سەرەکییەی، کە بوونو بوونەوەری لەسەر دامەزراوە.. بگەرێتەوە سەر ئەو سیستمەی کە لەگەڵ روانگەی هەموو بووندا دەسازێت، نەك هەر لەگەڵ روانگەو دیدی خودی مرۆڤایەتی، دەیەوێت سیستمی رەفتاری مرۆڤایەتی – بەپێی بەرنامەی (لا الە الا اللّٰه ومحمد رسول اللّٰه)کەی خۆی واتەرتیب بکات، کە لەگەڵ سیستمو رێساو یاسای هەموو بووندا یەك بگرنەوە نەبادا بەرنامەیەك بۆ مرۆڤایەتیو ژینی بهێنرێتە کایەوە کە لەگەڵ سیستمی بوندا نامۆو نەشازبێت..

ئایدیۆلۆژی ئیسلامی لەسەرئەوە دادەمەزرێ، کە خوا هەموو بوونەوەری دروست کردووە، وویستی خوا وابوو کە ئەم گەردونە دروست بێ، بۆیە دروست بوو.

ئینجا خوای گەورە ئەو ڕێسایانەی بۆ دانا کە لەسەری دەڕوات، کە بەشەکانی لەنێو خۆیاندا پێکەوە گونجاون، وناموٚیان تێدا بەدی ناکرێ:

**(إنّما قَولنا لشَيء إذا أَرَدْناه أَن نَقول لَه كُنْ فَيَكونْ)** (النحل–٤٠)، واتە: بەڵکو وتەمان بەرامبەر شتێك کە بمانەوێ ببێ، هەر ئەوەندەیە بڵێین: ببە، دەبێ.

**(وَخَلَق كُل شَيء فَقَدّره تَقديرا)** (الفرقان– ٢)، واتە: خوا هەموو شتێکی دروست کردوو ڕادەی بۆ داناوە .

لەپشت ئەم بوونە گەردونیەوە، ویستو ئارەزویەك هەیە، کە کارگێڕێتی دەکات، هێزێك هەیە کە دەیجوڵێنی، دەسەڵاتێك هەیە کە ڕێکی دەخات، ئەم دەسەڵاتەش، تاکەکانی هەموو ئەم بونەوەوە پێکەوە دەسازێنێ، جوڵانەوەکانیان ڕێك دەخات، بەجۆرێك کە پێکدا نادرێنو لەنگ نابنو بەرهەڵستی یەکتری ناکەنو - هەتا خواش حەزبکات — جوڵانەوەیان هەروا بە ڕێكوپێکی بەردەوام دەبێ، بێئەوەی لەجوڵە بکەون. ئەم بوونەوەرەش هەمووی تەسلیمی ئەو ویستو ئارەزووە بووە کە کارگێڕێتی دەکات. تەسلیمی ئەو دەسەڵاتەیە کە دەیجوڵێنێ. تەسلیمی ئەو کارگێڕەیە کە دەیسازێنێ. بەشێوەیەك تەسلیمێتی کە لەو ویستو ئارەزووەی سەرپەرشتی دەکات، ناتوانێ یاخی ببێت، یان ئینکاری ئەو دەسەڵاتە بکات، یان سەرپێچی لەو کارگێڕە بکات.. لەبەر ئەم هۆیانەیە کە ئەم گەردونە شیاوی هەموو ساتو زەمانێکە، بێئەوەی خراپییەکی لێوە ڕووبدات، یان پەکی بکەوێت — هەتا ئەوکاتەی خوا حەزدەکات:

**( إنّ رَبكُمُ اللهُ الذي خَلَقَ السّموات وَالأرض في ستة أَيامٍ ثُمّ استَوى عَلى العَرش، يُغشي الليلَ النَهار، يَطلبه حَثيثاً والشَّمسَ وَالقَمَر والنجوم مسَّخرات بِأمرهِ، ألا لَه الخَلق والأمر، تَبارَكَ الله رَبّ العالَمين)** (الأعراف–٥٤)، واتە: خوای ئێوە ئەوەیە کە ئاسمانەکانو زەمینی بە شەش ڕۆژ دروست کردووە، پاشان لەسەر عەرش (تەخت) مایەوە، شەو ڕوناکی ڕۆژ لادەباتو ڕوناکی ڕۆژ تاریکی شەو دەسڕێتەوە هەردوکیشیان بەخێرایی بەدووی یەکدادێن، ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانیش هەموویان

ملكەچی فەرمانی ئەون. بەڵێ ئەو دەسەڵاتی دروستكردنو فەرمان دانی هەیە پـاكو پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە.

❊ ❊ ❊

مرۆڤ كە لەنێو ئەم بوونە گەردونیەیـەو، ئـەو یاسـایانەی كـەحوكمی فیطـرەتـی دەكەن، وەنەبێ دوورەپەرێز بێ لەو سیستمەی كە حوكمی هەمـوو بوونـەوەر دەكـات، وەنەبێ گۆشەگیر بـێ، چـونكە مـرۆڤیش خـوا دروسـتی كـردووە هـەروەك كـە ئـەم بوونەوەرەشـی دروسـت كـردووە — هـەروەها پێكهـاتنی لەشـی مرۆڤـ، هـەر لـە ماددەكانی قوڕی ئەم سەرزەمینەیەو، هەرچی سیفەتێكی زیادە، كـە هەیـەتی خـوا پێی بەخشیوەو هەمووی بەڕادەیەكی دیـاریكراو داوەتـێو، كردویـەتی بـەو مرۆڤـە. لەبارەی شێوەی دروستبوونی لەشیشیەوە — پێی خۆش بێ یان پێـی نـاخۆش بـێ — ئەو سیستمو ڕێسا سروشتییەی بەسەردا دەچەسپێ كە خوا بۆی دروست كردووە. خوا بوونی داوەتێ، هەر لە سەرەتایەوە بە ویسـتو ئـارەزووی خوایـەتی خـۆی دروسـتی دەكات، نەك بە ویستو ئارەزووی مرۆڤەكە خۆی، یان بە ویستو ئـارەزووی دایـكو باوكی — دایكو باوكی بەیەكتریش بگەن بەڵام خۆ ناتوانن بوونی كۆرپەیەك بـدەن — مرۆڤـ بەگوێرەی ئەو ناموسە لەدایك دەبێ كە خوا بـۆی دانـاوە، وەك مـاوەی سـك پڕبوونو باروزروفی لەدایك بوونن چونكە خۆ هەر لەو هەوایەوە هەناسە وەردەگرێ كە خوا بەڕادەیەكی تایبەتی دروستی كردووەو، هەر بەو بڕەش وەردەگرێ كـە خـوا بـۆی دیاری دەكات. بەڵێ مرۆڤـ هەسـت دەكـاتو ئازاریشـی پێـدەگات، برسـی دەبـیو تینووشی دەبێ، دەخوات ودەشخواتەوە، خۆراك وخواردنەوە دروست دەكـات.. بـەڵام بەپێی سیستمێكی خوایی دەژی.. بێ ئەوەی خۆی سەر پشك بێ . لەمەشـدا بـوونی مرۆڤـ وەك بوونە گەردونیەكـە وایـە — بـە هەرچـییەكەوە كـە تێدایـە — هـەمووی ملكەچو گوێڕایەڵی ویستو ئارەزوو دەسەڵاتو سیستمی خوایـین .

ئەو خوایەی کە مرۆڤـو ئەم بوونە گەردونیەی دروست کردووە، هەر ئەویشـە کـە مرۆڤی ملکەچی ڕێساکانی خۆی کردووە هەر بەو شێوەیەی کە بوونە گردونیەکەشـی ملکەچ کردووە.. هەر ئەو خوایەشە کە (شەریعە)تێکی بۆ مرۆڤـ داناوە، بـۆ ئـەوەی لەبەر ڕۆشنایی ئەودا مرۆڤـ ژیانی وویست وئـیرادەی خـۆی بەشـێوەیەکی ڕێكوپێـك ڕێك بخاتو، لەگـەڵ ژیـانی سروشـتی خـۆی بیگونجێنـێ — بـەپێی ئـەم ڕایـەش — شەریعەت بریتیە لەبەشێك لەو سیستمە خوایی یەی کە حوکمی فیطـرەتـی مرۆڤـــو فیطـرەتی بـوونی گشـتی دەکـات. کـە هـەموویانی لەشـێوەی ڕسـتەیەکی تـەواودا داڕێژتووە.

هەر ووشەیەك لە ووشەکانی خوا، هەر فەرماندانو بەرهەڵستییەك، هـەر بـەڵێنو هەڕەشەیەك، هەر بەنـدی یاسـاو تـەوجیهێك.. هـەر یـەکێك لەمانـە بەشـێکن لـە سیستمی گشتی هەر یەکەشیان ڕاستو ڕێکـەو لەسـەر ڕێسـای خۆیـەتی، وەك ئـەو یاسایانەی پێیان دەڵێین: یاسای سروشـت - واتـە یاسـا گەردونیـە خـوایی‌یـەکان — ئەوانەی کە هەموو ساتێك دایانبینین ڕاستو ڕێکن.. چـونکە فـەرمانێکی خواییـان بەسەر دادراوەو ئەوانیش ملکەچنو بوونیان بە دەسەڵاتو ویستی خوا دێنـەدیو بـە قەزاو قەدەری ئەو دەبزوێن ..

بۆیـە ئـەو (شـەریعەت)ەش کـە خـوا بـۆ ڕێکخسـتنی ژیـانی مرۆڤـی دانـاوە، شەریعەتێکی گەردونیە. واتە پەیوەندی بـە سیسـتمی گشـتی گەردونیـەوە هەیـەو، لەگەڵیدا گونجاوە..

لەبەر ئەوە پێویستە ئیلتزام بەو شەریعەتەوە بکرێ تا ژیانی مرۆڤـــو بزوتنـەوەی ئەو گەردونەی تێیدا دەژین، پێکەوە بگونجێن.. بگرە دەبێ ئیلتزامی پێوە بکـرێ تـا ئەو یاسا شاراوانەی حـوکمی فیطـرەتـی مرۆڤـ دەکـەن بسـازێن لەگـەڵ ئـەو یاسـا ئاشکرایانەی حوکمی ژیان دەکەنو، تا شەخسیەتی شـاراوەو شەخسـیەتی ئاشـکرای مرۆڤ پێکەوە بلکێن..

مادام مرۆڤـ توانای نیە هەست بە هەموو یاسا گەردونیەکان بکاتو، توانای نیە دەرك بە چوارلای سیستمی گشتی بوونەوەر بکـات — تەنانـەت ئەوەنـدەی زانسـتی

نیە، كە چ ڕێسایەك وا زاڵە بەسەر فیطرەتی خۆشیدا، شتێكە كە ئاوا مرۆڤ ملكەچی ئەو حوكمە دەكات — ئەوانە — پێیان خۆش بێ، یان پێیان ناخۆش بێ — زانیاریو توانایەكی ئەوەندەیان نیە یاساو شەریعەت وا بۆ ژیانی مرۆڤ دابڕێژن، كە ژیانی خەڵكیو بزوتنەوەی گەردون پێكەوە بگونجێنێ تەنانەت ناتوانن یاساو شەریعەتێكی واش دابڕێژن كە حەزو هەستە فیطرەییەكانو داواكارییە ئاشكراكانی مرۆڤ پێكەوە بسازێنێت.. ئەوە لەتوانای مرۆڤدا نیە، بەڵكو لە توانای كردگاری مرۆڤو كردگاری گەردون دایە. كە كارگێڕی كاروباری گەردونو مرۆڤی بەدەستە، هەر ئەوەكە شەریعەتێكیان بۆ بڕیاردەدات كە لەگەڵ ئەو سیستمەی خۆی بۆی هەڵبژاردونو خۆی پێی ڕازییە دەگونجێت..

لەبەر ئەوە ئیش پێكردنو چەسپاندی شەریعەتەكەی خوا پێویستییەكی سەرشانە تا ئەو گونجاندنە گەردونیە بهێنرێتەدی.. ئەمە بێجگە لەوەی كە پێویستە ئیسلام بچەسپێنرێ چونكە عەقیدەیە ئیسلام تا بە دڵسۆزییەوە خواپەرستی بەتایبەت بۆ خوا تەرخان نەكرێ، لەژیانی تاكو لەژیانی كۆمەڵدا نەبێ، بوونی نابێت.. دەبێ ئەو پەرستنەش تەنها لەو ڕێگایەوە بێت كە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە، بۆ ئەوەی ناوەڕۆكی ڕوكنی یەكەمینی ئیسلام بچەسپێنرێ كە (لا الە الا اللە محمد رسول اللە)یە. پێكەوە سازاندنی ژیانی مرۆڤو سیستمی گەردون خێرو سوودی خودی مرۆڤی تێدایە.. چونكە دەبێتە زامنی پاراستنی ژیان لە خراپەكاریو بەدی.. چونكە مرۆڤ — تەنها ئەو كاتە — بە ئاشتیو هێمنی لەنێو خۆیانو لەگەڵ گەردوندا دەژین.. ئاشتی لەگەڵ گەردون لەوەدا دەردەكەوێ كە بزوتنەوەی مرۆڤ ئەوكاتە لەگەڵ بزوتنەوەی گەردوندا دەگونجێو، هەردووك یەك ئیتیجاهیان دەبێ. ئەوكاتە ئاشتی نێو خۆشیان دێتەدی، چونكە بزوتنەوەی خۆیانو فیطرە پاكەكەیان پێكەوە گونجاوە. ئەوكاتە شەڕ لەنێوان خۆیانو فیطرەیان ڕوونادات، چونكە شەریعەتەكەی خوا زۆر لەسەرخۆ بزوتنەوەی ئاشكراو فیطرەتە شاراوەكەیان پێكەوە دەگونجێنێ .. لەمەشەوە گونجاندنێكی تر دروست دەبێ ئەویش ئەوەیە كە پەیوەندی خەڵكی لەگەڵ

چالاکییە گشتییەکانیاندا دەگونجێ چونکە ئەوکاتە هەموویان یەك ڕێبـاز دەگرنەبـەر کە ئەویش بەشێکە لەسیستمە گشتی‌یەکەی گەردون .

هـەروەها ئـەو کاتـە خێـرو چـاکەخوازی بـۆ مرۆڤایـەتی دێتەکایـەوە، بـەهۆی ڕێنماییکردنو شارەزابوونی نهێنیەکانی گەردوونو، ووزە شاراوەکانی ناویەوە کـە لـە توێیەکانیدا حەشاردراون.

ئینجـا ئـەم هـەموو ووزەیـەش بـەپێی شـەریعەتەکەی خـوا بـەکاردەهێنرێ بـۆ خێرخوازی گشتی مرۆڤ، بێ‌ئەوەی بەرهەڵستیو کەندوکۆسپ بێتە ڕێی.

بەرامبەر شەریعەتەکەی خواش هەرچی هەیە هـەر هـەڵقولاوی هـەواو هەوەسـی مرۆڤە:

(وَلَو اتبَعَ الحَق أَهواءَهُمْ لَفَسَدت السَّموات وَالآرض وَمَنْ فيهن)(المؤمنون– ٧١)، واتە: خۆ ئەگەر حەق شوێنی هەواو هەوەسیان بکەوتایە، ئاسمانەکانو زەمین هەرچـی تێیاندایە خراپ دەبوون.

پاشان دیتنو ناسینی ئەو حەقەی ئاسمانەکانو زەمینی لەسەر دروست بـووەو ئـەو حەقەی ڕێبازی شەریعەتەکەی ئەم دینەی لەسەر دامەزراوە، لە یەك ڕوانگـەوە دەبـن ئینجا کاروباری دنیاو قیامەت لەسەر ئەم دیدو لەم ڕوانگەوە دەردەکـەوێت. ئەوسـا کاروباری دنیاو ڕۆژی دوایی پێ چاك دەبێ، خواش محاسەبەی ئەو کەسانە دەکات کـە دەستدرێژی دەکەنەسـەر ئـەو حەقـە بـە لـێ‌لادانی. هـەروەها پاداشـتی ئەوانـەش دەداتەوە کـە لەسـەری دەڕۆنو ئیلتزامـی پێوەدەکـەن.. چـونکە هـەردووکیان یـەك حەقپەروەرین، کە بریتیە لەو سیستمە گشتییە گەردونیەی خوا لە هـەموو کاتێکـدا بۆ ئەم بونەوەرەی وویستووە. کە ئەویش دەسەڵاتی بەسەر هەموو بونـەوەردا هەیـە. هەر لە جیهانی شتومەکەوە تا جیهانی زیندەوەران[1]..

1) دەتوانرێ بۆ ڕاڤەی ئەم دیدەو شارەزابوون دیراسەی کتێبەکـەی المصـطلحات الاربعـة، ئیمـام مودودی بکرێت، باسی وشەی دین – (م.کرێکار) -

﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلا تَعْقِلُونَ ١٠ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ
كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ١١ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذا هُم مِّنْهَا
يَرْكُضُونَ ١٢ لا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَى مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ
١٣ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ١٤ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّى جَعَلْنَاهُمْ
حَصِيدًا خَامِدِينَ ١٥ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاعِبِينَ ١٦ لَوْ أَرَدْنَا
أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ١٧ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ
فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ١٨ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلا يَسْتَحْسِرُونَ ١٩ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ
وَالنَّهَارَ لا يَفْتُرُونَ ٢٠﴾(الأنبياء)

واتە: کتێبێکمان بۆ ناردونەتە خوارەوە کەباسی خۆتانی تێدایە، بۆچی عەقڵتان پێی ناشکێ؟ چەند ناوچەی ستەمکارمان وێران کردو خەڵکی ترمان لەجێی ئەوان دروست کرد. کە زانیان ژانیو ئازاری ئێمەیان دەگاتێ، کەوتنەخۆ تا هەڵێن!! نا ڕامەکەن.. بگەڕێنەوە ناو نازو نیعمەتو کۆشكو تەلارەکانتان تا لێتان بپرسرێتەوە کە چۆن شوکرانە بژێریتان کرد! هاواریان لێ‌هەستا: خوایە گیان ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد.. بەردەوام لەسەر ئەو ئیعتیرافکردنەیان مانەوە تا وەك پەریزی دوراوو پووشی خوراومان لێکردن.. خۆ ئێمە ئاسمانەکانو زەمینمان هەروا بە هەوەنتەو بۆ گاڵتە دروست نەکردووە.. خۆ گەر بمانویستایە بۆ ئەوە دروستی بکەین، هەرخۆمان دەمانکرد، بەڵام ئێمە وامان نەکردووە.. ئێمە حەق دەگرینو لە سەرەوە بەرەو خوار بە باتڵی دەکێشینو باتڵیش دادەڕزێو دەپروێو بەفەتارەت دەچێ.. هەی وەیلو واوەیلا بۆ حاڵتان (ئێوەی کە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن) بۆ ئەو قسەوقسەڵۆکەی هەڵیدەبەستن .. هەرکەسێك لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی ئەون، ئەو کەسانەش کە لای خوای پەروەردگارن بەردەوام دەیپەرستنو لە خواپەرستی بێزارنابنو خۆ بەگەورەتر لەو کارە نابینن.. شەوو ڕۆژ لە زیکری خوادانو مەلەل نایانگرێو سست نابن..

فیطرەی مرۆڤیش لەناخەوە هەست بەم ڕاستییە دەکات، چونکە سروشتی دروستبوونی خۆیو سروشتی دروستبوونی ئەم گەردونەی دەوروبەری وای حاڵی

دەکــات کــە هــەمووی لەســەر حــەقو حەقپــەروەری دامــەزراوەو، بناغــەی دامەزراندنەکەیان حەقپەروەرییە، کە لەگەڵ سیستمی گشتی گەردوندایــەو نــاگۆڕیو تێك ناچێو، تولــەڕێی تــری لــێنابێتەوەو، جیــاوازی لــەنێوان خولەکانیــدا نیــەو، هەندێکیان بە هەندێکی تریان ناکێشرێن، چــونکە وەنــەبێ لەســەر ڕێکــەوتی کــوێرو هەواو هەوەسی بگۆڕو ئارەزووی سەرشێت دامەزرابنو هەڵسوڕێن، بەڵکو ڕێســایەکی ووردی مەحکمەی دیاریکراویان هەیە، کــە لەســەری دەڕۆنو لێــی لانــادەن.. بــەڵام کاتێك پشێوی لەنێوان مرۆڤـ وفیطرەیدا ڕوودەدات — کاتێك کــە مــرۆڤ لــە ڕێبــازی حەقپەروەری — کە لە ناخیدا جێگیرە — لادەداتو شەریعەتێك بۆ ژیانی خۆی لەسەر بناغەی هەواو هەوەسی خۆی دادەڕێژی، نــەك لەســەر بناغــەی شــەریعەتەکەی خــوا ئەوجا دەکەوێتە ژێر پاڵەپەستۆی هەواو هــەوەسو ئــارەزوە بــەدەکانی خــۆیو خــۆی تەسلیم بەخوا ناکــات، وەك کــە ئــەم بونــە گەردونیــە بەتــەواوی تەســلیمی خــوای کردگاری خۆیەتی!

ئەم جۆرە پشێویەش دەکەوێتــە نێــوان تاکــەکانو کۆمــەڵ، یــان تاکــەکان لــەناو خۆیاندا، یان نەتەوەکانو نەوەکان هەندێك لەگەڵ هەندێکی تر، وەك چــۆن دەکەوێتــە نێوان مرۆڤــو ئەو گەردونــەی دەوروبــەری ئەوکاتــەش هەرچــی هێــزو تێشــوو هەیــە لــەجیاتی ئــەوەی بکرێتــە ئــامێری ئاوەدانکردنــەوەو ئــامێری خۆشــبەختی مرۆڤــ، دەکرێنە ئامێری وێرانکاریو هۆی نارەحەتی.

کەوابوو مەبەستی دیارو ڕوونــی دامەزرانــدنو چەســپاندنی شــەریعەتەکەی خــوا لەسەر زەمیندا، هەر ئەوەندە نیە کاربکرێت بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵکو بــۆ دنیــاو ڕۆژی دواییــە کە دوو قۆناغنو، یەکتری تەواو دەکــەن. تــەنها شــەریعەتەکەی خوایــە کــە دەتوانێ هەردوو قۆناغەکان لەژیانی مرۆڤدا پێکــەوە بســازێنێتو، هــەموو ژیــانیش لەگەڵ سیستمە گشتییە خواییە کەدا بگونجێنێ.

گونجاندنیش لەگەڵ ئەو سیستمەدا وەنەبێ بەختیاری مرۆڤــ بخاتــە ڕۆژی دوایــی، بەڵکو لە قۆناغی یەکەمیشدا، لەژیاندا دەیکاتە واقیعێکی چەسپاو، پاشان لە ڕۆژی دواییدا ئەو بەختیارییەی تەواودەکات.

❊ ❊ ❊

ئەمە بناغـەی تێڕوانینـی ئیسـلامە بـۆ هـەموو بوونـەوەرو، دەربـارەی بـوونی مرۆڤایەتی ناو ئەو بوونـەوەرە گشـتییە، ئەمـەش بیروباوەڕێکـە کـە لـە سروشـتدا جیاوازییەکی زۆر زۆری هەیە لەگـەڵ هـەموو بیروبـاوەڕێکی تـردا، کـە مرۆڤایـەتی دیوێتی. بۆیە ئەو پابەندییەش کە بەم شـەریعەتە دادەمـەزرێ، لـە هـیچ بیروبـاوەرو سیستمو تێوەرەکانی تردا دانامەزرێ .

ئیلتزامکردن بە شەریعەتەکی خواوە — لـە بیروبـاوەڕی ئیسـلامدا — بریتـی لـە پەیوەندی تەواوی نێوان ژیانی مرۆڤـو ژیانی گەردونو پەیوەندی نێوان ئەو سیستمەی حوکمی فیطرەی مرۆڤـو حوکمی ئەو گەردونە دەکات. هەروەها بریتیە لە هاریکـاری سیستمی گشتیو ئەو شەریعەتەی خوا کە ژیانی مرۆڤ ڕێـكو پێـك دەکـات. ئـەو ئیلتزامەش بەپەرستنی خوای تاك تەنها دێتەدی کە دەبـێ مرۆڤ ئـەنجامی بـدات. هەروەکو کە ئەو گەردونە ئەو پەرستنە ئەنجام دەدات. ئەو پەرستنەش هـەربۆ خـوای گەورە ئەنجام دەداتو کەس ناتوانێت لافی ئەوە لێبدات کە گەردون ئەم دەپەرستێت.

ئەم یەکگرتنو گونجاندنەش لەو ووتووێژەدا دەردەکەوێ کـە لـەنێوان بـاوکی ئـەم نەتەوە موسـڵمانە حـەزرەتی ئیـبراهیمو- سـەلامی خـوای لێبـێ — و (نـەمرود)دا ڕوویدا. کە نەمرودی حاکمی زۆردار لافی ئەوەی لێـدەدا کـە مـافی دەسـەڵاتدارێتی هەیە بەسەر مرۆڤی سەرزەمیندا — لەکاتێکدا کە نـەیتوانی لافـی ئـەوە لێبـدا کـە مافی دەسەڵاتدارێتی بەسەر گەردوندا هەیە. کـە لەبەرچـاوی حـەزرەتی ئیـبراهیم — سەلامی خوای لـێ بێ — تەریق بووەوەو سەری سـوڕماو بـۆی دەرکـەوت کـە هـیچ دەسەڵاتێکی نیە، چونکە حەزرەتی ئیبراهیم — سەلامی خوای لـێ بێ — پێـی ووت: ئەو کەسەی دەسەڵاتی بەسەر گەردوندا هەیە، هەر ئەویش دەبـێ دەسـەڵاتی بەسـەر ژیانی مرۆڤدا هەبێ. بۆیە کە حەزرەتی ئیبراهیم ئەمەی سەلماند نـەمرود هیچـی بـۆ نەمایەوە.

**ووتووویژەکەش بەم جۆرەبوو:**

**(أَلَمْ تَرَ إلى الذّى حاجّ إبراهيمَ فِي رَبهِ أنْ آتاه الله الملكَ إذْ قالَ إبراهيم رَبّيَ الذّى يحيِيّ وَيميـت قالَ أنا أحييّ وَأميت قالَ إبراهيم فَإن الله يَأتي بِالشّمس مِن المَشرقِ فَأتِ بِها مِنَ المَغرب فَبهتَ الذى كَفَر والله لا يَهدي القَومَ الظالمين)**(البقرة- ٢٥٨)

واتـە: مەگـەر کـابرا نـابینی کـە ئینکـاری بـوونی خـوای ئیبراهیمـی دەکـرد، ئەوکەسەی کە خوا دەسەڵاتی پاشایەتی پێبەخشیبوو. کاتێك ئیبراهیم ووتـی خـوای من ئەوەیە کە دەژێنیو دەشمرێنێ، ووتی منیش دەژێنمو دەمـرێنم. ئیـبراهیم ووتـی مادام وایە دەڕۆژ کە خوا لە ڕۆژهەڵاتەوە دەیهێنێ، تۆ بتوانە لە ڕۆژئـاواوە بیهێنـە. کابرا سەری سـوڕماو نـوتقی بەسـرا، چـونکە کـوفری کـرد، خـۆ خـواش ڕێنمـایی ستەمکاران ناکات .

فەرمودەی خواش ڕاستە کە دەفەرموێ:

**( أفَغَير دينِ الله يَبغونَ وَلَه أسلَمَ مَنْ فِي السّمواتِ والأرضِ طَوعا" وَكَرها" وإلَيه يَرجعونْ)** (آل عمران- ٨٣)

واتە: بۆ دەیانەوێ دینێکی تر، غەیری دینەکـەی خـوا وەربگـرن؟! ئـەو خوایـەی هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندان پێیان خۆش بێ، یان پێیـان نـاخۆش بـێ، هـەرهی خوان، هەمووشیان هەر بۆ خواوە دەگەڕێتەوە.

# ئیســلام خۆی شـارسـتانێتـی یە

ئیسلام تەنها دوو جۆر کۆمەڵگە دەناسێ .. کۆمەڵگەی ئیسـلامیو کۆمەڵگـەی جاهیلی..

(کۆمەڵگەی ئیسلامی) بریتیە: لەو کۆمەڵگەیەی ئیسلام لە عەقیدەو پەرستن، لە یاساو ڕێساو لە نەریتو خووڕەوشتیدا دەدرەوشێتەوە.

(کۆمەڵگـەی جـاهیلی)یش بریتیـە: لـەو کۆمەڵگەیـەی ئیسـلام لـە: عەقیـدەو بیروباوەڕو، پێـوەرو هەڵسـەنگاندن، ویاسـاو رژێـم، ونـەریتو خووڕەوشـتیدا تطبیق ناکرێ، واتە ئیسلام سەرپەرشتی ئەو بوارانەی ناکات .

کۆمەڵگـەی ئیسـلامی ئەوەنیـە کۆمەڵـە خـەڵکێك لەوانـەی بـەخۆیان دەڵـێن (موسڵمان) لەجێیەك کۆبووبێتەوە: کە یاسای کۆمەڵگەکەیان نائیسـلامییە.. باهـەر بۆ خۆیان نوێژو ڕۆژو حەجیش بکەن !.. هەروەها ئەوە کۆمەڵگەی ئیسلامی نیە کـە خەڵك — بە بیروڕای خۆیان — ئیسلامێکیان غـەیری ئـەو ئیسـلامەی خـوا بڕیـاری لەسەر داوە، پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕوونی کردۆتەوە داڕشتبێت جا حەزدەکەن با — بـۆ نموونە — بەو ئیسلامەی خۆیان بڵێن (ئیسلامی پێشکەوتوو) !

(کۆمەڵگەی جاهیلی)ش لەگەڵێك شێوەدا دەردەکەوێ — لەوانەیـە کۆمەڵگەیـەك بێ ئینکاری بوونی خوا بکاتو، مێژوو بە ماددەی دایالیکتیکی لێـك بداتـەوە، بـە دەردی خۆیان پێی دەڵێن (سوشیالزمی زانستی) لە رژێمەکەیدا تطبیق بکات. وەیـان لەوانەیە کۆمەڵگەیەك بێ، ئینکاری بوونی خوا نەکات بـەڵام تـەنها دەسـەڵاتدارێتی ئاسمان بدات بەخوا، وە دەسەڵاتدارێتی سەرزەمین بۆ خۆی لە خوا بسێنێ! بەوەی کـە شەریعەتەکەی خوا لە سیستمی ژیانیـدا تطبیـق نـەکات، یـان ڕەفتـاروکرداری بـەو تەرازوە نەگۆڕە هەڵنەسەنگێنێ، کە خوا بۆ مرۆڤی دیاری کردووە، لەوانەشـە بـواری خەڵکی بدات لە بیەع وکەنیسەو مزگەوتەکانیشدا خواپەرستی بکـەن، بـەڵام بـواری

ئەوەیان لـێ دەبڕێ کە داوابکەن شەریعەتەکەی خوا حوکمی ژیانیان بکات ئەم جـۆرە کۆمەڵگەیەش بەم کارەیان ئینکاری خوایەتی خوادەکـەنو نایانـەوێ خوایـەتی خـوا لەسەر زەمین هەبێت، ئەگەر چی خواش دەفەرموێ:

**( وَهوَ الذى في السَّماء إله وَفي الأرضِ إله)** (الزخـرف- ٨٤)، واتـە: خـوا هـەر ئەوەیەکە لە ئاسماندا خوایە، ولەسەر زەمینیش هەر خوایە .

ئەو جۆرە کۆمەڵگەیە ناکەوێتە ژێر سایەی ئاینی خواوە کـە خـوا لـەو ئایەتـەدا دیاری کردووە، کە دەفەرموێ:

**(إن الحُكمَ الاّ لله، أَمَر ألاّ تَعبدوا إلاّإِيّاه.. ذلكَ الدين القَيّم)** (یوسـف- ٨٤)، واتە: حوکم کردن بۆ خوانەبێ بۆ کەس نیە، ئەو فەرمانی داوە کە تـەنها دەبـێ ئـەو بپەرستن ئەوەشە دینی ڕاستو دروست .

ئەو کۆمەڵگەیە، بەوکارەی دەچێتە ڕیزی کۆمەڵگەی جاهیلییەوە! با بۆخۆی هـەر بڕیاریبوونی خواش بداتو، بواری خەڵکیش بدات لەبیەعو کەنیسەو مزگەوتەکانـدا خـوا بپەرسـتنو، دروشمـە پەرسـتنەکانیان بـەجێبهێنن، ئـا بـەو سـیفەتەش تـەنها (کۆمەڵگەیئیسلامی)دەبێتە(کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووی شارسـتانی). کۆمەڵگـەی جاهیلیش بە هەموو شێوە جۆربەجۆرەکانیەوە هەر کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووە!

دەبێ لێرەدا ئەم ڕاستییە گەورەیە زیاتر ڕوون بکرێتەوە:

جارێـك خـۆم بـڵاوم کـردەوە کـە کتێبـێکم لـەژێر چـاپدایە بـەناوی (بـەرەو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی پێشکەوتووی شارستانی پاشان شارستانی (متحضر)م لـێ لابرد، چونکە زانیم کە ناونیشانی کتێبەکە هەر (بەرەو کۆمەڵگەیەکی ئیسـلامی — نحو مجتمع اسلامي -) بێ، بەسە..

ئەم ڕاسـت کردنەوەیەم سـەرنجی نوسەرێکی جەزائیری — کە بە فەرەنسی دەنووسێ — ڕاکێشا، ئەو بەوەی لێکدایەوە کە هۆی دروسـتبوونی ئـەم هەڵوێسـتانە (بەرگری کردنێکی ناوخۆیی دەرونە لە ئیسلام) داخی بۆ ئەوە هەڵکێشـابوو کـە ئـەم ئیشـە — ناهۆشـیارانە — وام لێـدەکات لـە حەقیقـەتی خۆیـدا ڕووبـەڕووی (گێروگرفت)ەکە نەبـمەوە!

وە چونكە منیش وەك ئەو بووم .. كاتێك بۆ یەكەمین جار بیرم لەنوسینی ئەو بابەتە دەكردەوە وەكو ئێستای ئەو وامدەزانی كە گێروگرفتەكە بریتیە لە (پێناسینی شارستانێتی)! چونكە هێشتا لە پاڵەپەستۆی خڵتەی — ڕواسب — ی ئەو ڕۆشنبیرییە ڕزگار نەبووبووم، كە بەشداری پێكهاتنی ژیری‌و دەرونی كردبووم.. ئەو خڵتەیەی لەسەرچاوە بێگانەكانەوە پەیدابووە.. كە شتێكی غەریب بوو لەناو هەست‌و سۆزە ئیسلامییەكەمدا.. ئەگەرچی ئیتجاهی ئیسلامیشم لەوكاتەدا ڕوون‌و ئاشكرابوو، بەڵام ئەو خڵتەیە هێشتا كاریان لە ڕوشاندن‌و شێواندنی فیكرمدا مابوو! فیكرەی (شارستانێتی) — وەكو كە لە فیكرەی ئەوروپاییەكاندا هەیە — دەیخستمە خەیاڵێكی دیكەو بە جۆرێكی تر فیكری دەشێواندم كە نەمدەتوانی بەشێوەیەكی ڕەسەن‌و ڕوون ببینم !

پاشان ڕاستی وێنەكەم بۆدەركەوت.. كە (كۆمەڵگەی موسڵمان) خۆی (كۆمەڵگەیەكی پێشكەوتووی شارستانیە).. ئیتر ووشەی (پێشكەوتووی شارستانی) هەردەمەوەری‌و گەڕەلاوژێیە.. چونكە هیچ شتێكی نوێ ناهێنێتە كایەوە.. بە پێچەوانەوە، ئەو ووشەیە تارمایی یەكی بێگانەی غەریبیشی لەسەر هەست‌و سۆزی خوێنەر دروست دەكردو، فیكری دەشێواند، وەكو كە فیكری منی شێواندبوو، نەیدەهێشت بە جۆرێكی ڕوون‌و ڕەسەن ببینم!

كەوابوو جیاوازییەكە بریتیە لە (پێناسینی شارستانێتی) ئەم ڕاستیەش دەبێ ڕوونكردنەوەیەكی ووردی هەبێ !

❊ ❊ ❊

كاتێك لە كۆمەڵگەیەكدا، حاكمێتی باڵا تەنها بۆ خوا دەبێ — كە لەوەدا دەردەكەوێ كە دەسەڵات بەدەست شەریعەتەكەیەوە بێ — ئەمە تەنها شێوازێكە كە مرۆڤ تێیدا بە تەواوی سەربەستەو لە حەقیقەتدا لەوە ئازادبووە كە مرۆڤ بپەرستێ . ئەوەشە (شارستانێتی مرۆڤایەتی). چونكە شارستانێتی مرۆڤ ڕێسایەكی سەرەكی دەوێ بۆ ئازادكردنی ڕاستەقینەی تەواوی مرۆڤ.. هەروەها ڕێسایەكی سەرەكی

دەوێ بۆ ڕێزلێنانی تاك لەكۆمەڵدا.. لەڕاستیدا مرۆڤ نە ڕێزی هەیەو نە سەربەستو ئازادیشە لەو كۆمەڵگایانەدا كە كۆمەڵێك (هەندێ مرۆڤ) دەبنە خواو یاساو شەریعەت بۆ هەندێكی تر دادەنێن، ئەو هەندەی دووەمیش دەبنە بەندەو ملكەچی وگوێڕایەڵی یاساكانی ئەوانەی كە ئەو یاسایانەیان دەركردووە ڕێزو سەربەستیش دەبێ لە هەموو تاكێك لە تاكەكانی كۆمەڵدا دەربكەوێ .

لەبەر ئەوەی ووشەی شەریعەت، ئەمڕۆ لە مێشكی گەلێ كەسدا مانایەكی تەسكی هەیە، دەبێ ئەوە زۆر ڕوون بكەینەوە كە یاسادانان — تشریع — تەنها لە حوكمە یاسایی یەكاندا پەنگ ناخواتەوە.. چونكە بیروباوەڕو پرۆگرامو، نەریتو خووڕەوشت، هەموویان یاسانو تاكەكانی كۆمەڵ ملكەچن بەرامبەری .. كاتێك هەندێك كەس ئەم كوێخایەتییە دەكەنو، خەڵكەكەی تر گوێڕایەڵیان دەكەن، بەو كۆمەڵگەیە ناوترێ كۆمەڵگەیەكی ئازادو سەربەست، بەڵكو ئەوە كۆمەڵگەیەكە — هەروەكو ووتمان — هەندێكیان خوانو هەندێكی تریشیان بەندەن. لەبەرئەوەیە كە ئەو كۆمەڵگەیە بە كۆمەڵگەیەكی دواكەوتوو دادەنرێ .. وەیان بە زاراوە ئیسلامییەكە بڵێین: (كۆمەڵگەیەكی جاهیلی)یە!

تەنها كۆمەڵگەی ئیسلامییە كەتەنها یەك خوا دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێو، وە خەڵكی لە پەرستنی هەندێ مرۆڤی وەك خۆیان ئازادبووبن، وە چووبنە ژێر سایەی پەرستنی خوای تاكو تەنها. لەبەرئەوە ئازادیو سەربەستییەكی ڕاستەقینەی تەواویان هەیە، كە شارستانێتی مرۆڤایەتی دەتوانێ پشتی پێوە بدات، تەنها ئەو كاتەش تاكو كۆ ئەو ڕێزەیان دەبێ كە خوای گەورە لێی ناون، ئەویش كە جێنشینێتی خوایە لەسەر زەمین. جگەلەوەی كە لەلای خوا خۆی ڕێزێكی گەورەترو زۆرتریان دەبێت..

❊ ❊ ❊

کاتێك لە کۆمەڵگەیەکدا پەیوەندی عەقیدەو بیروباوەڕو فیکرو پرۆگرامی ژیان کە لەلایەن خواوە دیاری دەکرێن، دەبێتە پەیوەندی سەرەکی نێوان ئەندامانی کۆمەڵێكو، کاتێك دەسەڵاتی سەرکردایەتیو فەرماندێیتی باڵای مرۆڤ لەلایەن خواوە دیاری دەکرێت، نەك لەلایەن خوای زەمینییەوە کە مرۆڤ پەرستی تێدا ئاشکرایە.. ئەو کاتە ئەو کۆمەڵگەیە دەبێتە پێشانگای بەرزترین سیفاتی رۆحو فیکری (مرۆڤایەتی)، بەڵام کاتێك پەیوەندی کۆمەڵگەیەك دەبێتە رەگەزو ڕەنگی پێستو نەتەوەو خاكو پەیوەندییەکانی تر، ئاشکراشە کە رەگەزو ڕەنگی پێستو نەتەوەو خاك سیفاتی بەرزی مرۆڤایەتی تێدا دەرناکەوێ .. چونکە مرۆڤ بەبێ رەگەزو ڕەنگی پێستو نەتەوەو خاك هەر بە مرۆڤ دەمێنێتەوە، بەڵام بەبێ رۆحو فیکر بە مرۆڤی نامێنێتەوە. ئەوکاتە – بەپێی سەربەستی ویستو ئیرادەی خۆی – دەسەڵاتی ئەوەی دەبێ عەقیدەو بیروباوەڕو فیکرو پرۆگرامی ژیانی خۆی بگۆڕێ، بەڵام خۆ دەسەڵاتی ئەوەی نابێ ڕەنگو ڕەگەزی خۆی بگۆڕێ. کۆمەڵگەیەکیش خەڵکەکەی لەسەر شتێك کۆببنەوە کە پەیوەندی بە ویستو ئیرادەی سەربەستی خۆیانەوە هەبێ – خۆیان سەربەست بن لە هەڵبژاردنیدا – ئەوە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووی شارستانیە.

ئەما ئەو کۆمەڵگەیەی خەڵکەکەی لەسەر شتێکی دەرەوەی ویستو ئیرادەی مرۆڤایەتی خۆیان کۆببنەوە، ئەوە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووە.. وەیان بە زارەوە ئیسلامییەکە بڵێین: ئەوە (کۆمەڵگەیەکی جاهیلی)یە !.

تەنها لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا عەقیدە دەبێتە پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵگە. چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی عەقیدەکەی دەبێتە ئەو ڕەگەزنامەیەی کە ڕەشو سپیو سوورو زەرد، وعەرەبیو ڕۆمی وفارسیو حەبەشی و، هەموو ڕەگەزەکانی تری لە چوارچێوەی یەك نەتەوەدا کۆدەبێتەوە، کە خوایان (اللّٰه)یەو پەرستنیان تەنها بۆ ئەوەو، بەرێزترینیان ئەو کەسەیە کە زۆرتر لە خوا دەترسیو زۆرتر خۆی لە گوناه دەپارێزێ. هەموو لە وەرگرتنی شەریعەتەکەی خوادا یەکسانن، ئەو شەریعەتەی کە خوا دایناوە نەك مرۆڤ !

* * *

هەروەها کاتێك (مرۆڤایەتی) مرۆڤـ لە کۆمەڵدا.. دەبێتە بڵندترین نرخو، کاتێك سیفاتی (مرۆڤایەتی) لە کۆمەڵدا دەبێتە هۆی بایەخ پێدانو ڕێزلێگرتنـی مرۆڤـ .. ئەوکاتە ئەو کۆمەڵگەیە بە پێشکەوتوو شارستانی دادەنرێ.. ئەمما کاتێـك (مـاددە) — لە هەر شێوەیەکیدا بێ — دەبێتە بڵندترین نرخی تاك، چ لە شێوەی (تیۆر)دابـێ، وەکو کە مارکسیزم مێـژوو بـە مـاددە لێـك دەداتـەوە، چ لـە شـێوەی (بەرهـەمی ماددی)دابێ، وەکو لە ئەمەریکاو ئەوروپاو وولاٌتەکانی تـردا هەیـە، کـە بەرهـەمی ماددی بڵندترین نرخو هـەموو سـیفەتو بەهایـەکی مرۆڤایـەتی لـەپێناودا بـەخت دەکات.. ئەو کۆمەڵگەیە، کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووە.. یان بە زارەوە ئیسلامییەکە بڵێین کۆمەڵگەیەکی جاهیلییە! .

کۆمەڵگەی ئیسلامی کە پێشکەوتوو شارستانیە لە نرخی ماددە کەم ناکاتەوە — نە لە شێوەی تیۆردا (بەو ئیعتیبارەی کـە پێکهێنـەری ئـەم گەردونەیـە کـە تێیـدا دەژینو کاری تێدەکەینو کارمان تێدەکات) وە نە لە شێوەی (بەرهەمی ماددی)دا. چونکە بەرهەمی ماددی لە ڕای کۆمەڵگەی ئیسـلامیدا یەکێکـە لـەو بنەمایانـەی جێنشینێتی خوایی پێدەکرێت لەسەر زەمیندا. بەلاٌم ئەوەندە هەیە کـە کۆمەڵگـەی ئیسلامی ئەو تیۆرو بەرهەمە ماددییە ناکات بە بڵندترین نرخ، کە هەموو سـیفەتو بنەمایەکی (مرۆڤـ) بکاتە قوربانی. یـا ڕێـزو سەربەسـتی تـاکی لـەپێناودا بـەخت بکات، یان هەموو ڕێسـاو بنەمایـەکی (خێـزان)ی لـەپێناودا بفـەوتێنێ. هـەروەها بەهاکانی چاکەو پیاوەتی کە کۆمەڵگە جاهیلییەکان دەیکەنـە قوربـانی هێنانـەدیو زۆرکردنی بەرهەمی ماددی ئیسلام دەیانپارێزێت..

بۆیە کاتێك (ڕەوشتی مرۆڤایەتی) کە لەسەر (بەهای مرۆڤایەتی) دادەمـەزرێتو لە کۆمەڵگەیەکدا بلاٌودەبێتەوە، ئەوکاتە ئەو کۆمەڵگەیە بە پێشکەوتووو شارستانی دەژمێررێت. خوورەوشـتی مرۆڤایـەتیو بـەهای مرۆڤایـەتی وەنـەبێ مەسـەلەیەکی ئاڵۆزو تێکچڕژاوبن، یان بریتی بن لـە شـتێکی گـۆڕاوی قـابیلی بەرەوپێشچـوون —

متطور – ی وا کە لەسەر هیچ حاڵەتێك دابین نەبن‌و نەگەڕێنەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەك وەکو کە (سوشیالیزمی زانستی) لە لێکدانەوە ماددیانەکەی مێژوویدا دەیداتە قەڵەم! ئاراستەی ئیسلامی ئەو ڕەوشت‌و بەهایانە گەشە پێدەدات کە دەبنە هۆی هاندانی نەشونماو بەرفراوان‌و بەهێزبوونی ئەو تایبەتمەندێتیانەی مرۆڤ کە لە ئاژەڵی جویدەکاتەوە. ئەمەش جیاوازە لەگەڵ ئاراستەی تر، کە نرخ‌و بەها دەداتە ئەو تایبەتمەندێتیانەی کە لە مرۆڤ‌و ئاژەڵدا هەن‌و تەنها نەشونماو گەشە بەو لایەنە ئاژەڵیانەی مرۆڤ دەدات!!

کاتێك لەم ڕوانگەوە سەیری باسەکە دەکرێت‌و بەها دەناسرێت، سنورێکی جێگیرو چەسپاو دەردەکەوێت کە ناهێڵێت ئەو بنەما ڕەوشتیانە یەق بکەنەوەو بێنرخ بکەون‌و بکرێنە شتێکی نیسبی‌و قابیلی گۆڕان وەکو کە (پێشکەوتووخواز)و (سۆشیالە زانستی)یەکان حاڵی بوون..

ئەو کاتە دەوروبەرو نەریتەکانی کۆمەڵگە بەها ڕەوشتییەکان دیاری ناکەن، چونکە لەپشت خاڵە ئیختیلافییەکانی دەوروبەر تەرازوویەکی چەسپاوی نەگۆڕ دەبێ. ئەوکاتە ئەوە نابێ بلێی: ئەوە خووڕەوشت‌و بەهای (کشتوکاڵییە)و ئەوەشیان هی (پیشەسازی)، یان ئەوەش خووڕەوشت‌و بەهای (سەرمایەداری)و ئەوەشیان هی (سۆشیالزمی)، وەیان ئەوەیان خووڕەوشت‌و بەهای (بورژوازی)یە ئەوەشیان هی (پرۆلیتار)ی یە.. کە ئەم پێوەرە دەبێ ئیتر ناووتری دەوروبەرو ئاستی ژیان‌و سروشتی قۆناغ، ئەو خووڕەوشتانەی هێناوەتەدی! چونکە لەپشت ئەمانەوە – خووڕەوشت‌و بەهای (مرۆڤانە) پەیدادەبێ‌و، بەرامبەریشی خووڕەوشت‌و بەهای (ئاژەڵی) وەیان بە زارەوە ئیسلامییە کە بلێین: ئەوکاتە خووڕەوشت‌و بەهای (ئیسلامی) دەبی‌و بەرامبەریشی خووڕەوشت‌و بەهای (جاهیلی)!

خووڕەوشت‌و بەهای ئیسلامی بڕیار لەسەر (مرۆڤایەتی) ئەو لایەنانەی مرۆڤ دەدات کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جویدەکەنەوە. ئەوجا بەردەوام دەبێ لە دروستکردنی‌و چەسپاندن‌و پاراستنی ئەو مرۆڤایەتییە لە هەرچی کۆمەڵگەیەك دابێ کە ئیسلام سەرپەرشتی دەکات. جا ئیتر ئەو کۆمەڵگەیە لە قۆناغی کشتوکاڵی دابێ، یان لە قۆناغی پیشەسازیدا وە چ لە کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی‌و دەشتەکی دابێ کە لەسەر

شوانی دەژین، چ لە کۆمەڵگەیەکی شارستانی دابین بوو دابێ، یان ئەو کۆمەڵگەیە هەژارو کەم دەرامەت بێ، یان دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوو. کۆمەڵگە هەرچۆنێك بێت ئیسلام خۆی بەو سیفەتە مرۆڤایەتییانە بەرزی دەکاتەوەو پاسەوانی دەکات. نەبادا دابخزێتەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ .. چونکە ئەو هێڵەی لە ئیعتبارات‌و خووڕەوشتەوە بەرەوژوور هەڵکشاوە تاك‌و کۆمەڵ لە ئاستی ئاژەڵییەوە بەرەو ئاستێکی مرۆڤانە بەرز دەکاتەوە. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ئەو هێڵە — لەگەڵ شارستانێتی ماددەدا — بەرەو خوار درێژ بووەوە، ئەوە شارستانێتی نیە! بەڵکو ئەوە دواکەوتنە! یان بە زارەوە ئیسلامییەکە بڵێین (جاهیلی)یەتە!

کاتێك (خێزان) دەبێتە بنکەی کۆمەڵگەو، لەسەر مەسەلەی (شارەزایی کاروبار)ی نێوان ژن‌و مێرد دادەمەزرێ‌و کاتێك گرنگترین ئیشی خێزان دەبێتە پەروەردەکردن‌و سەرپەرشتیکردنی نەوەی نوێی تازە پێگەیشتوو.. ئەو کۆمەڵگەیە پێشکەوتوو شارستانیە.. چونکە خێزانی وا — کە تەنها لەژێر سایەی پرۆگرامی ئیسلامیدا دێتەدی — دەوروبەرێکی دروستکەر پێك دێنی‌و گەشە بەو خووڕەوشت‌و بەها (مرۆڤایەتی)یە دەدات کە لە بەندی پێشوودا باسمان کرد. ئەمەش لە نەوەی نوێی تازە پێگەیشتوودا دەردەکەوێ، کە ئەستەمە لە هیچ یەکە (وحدە)یەکی تری غەیری خێزاندا دابمەزرێ .. ئەمما کاتێك پەیوەندی جنسی (وەکو دەڵێن پەیوەندی جنسی سەربەست)و منداڵ بوونی (غەیرە شەرعی) دەبێتە بنکەی کۆمەڵگەیان کاتێك پەیوەندی نێوان ژن‌و مێرد تەنها لەسەر هەواو هەوەس‌و عاتیفەو ئارەزوی جنسی دادەمەزرێ لەجیاتی ئەوەی لەسەر بناغەی ئەرکی سەرشان‌و شارەزایی کاروباری خێزان دابمەزرێ.. کاتێك ئیش‌وکاری ئافرەت دەبێ بە خۆرازاندنەوەو فیتنەی خۆ جوانکردن‌و سەرنج ڕاکێشانی ئەم‌و ئەو. کاتێك ئافرەت واز لە ئیشە سەرەکییەکی خۆی دێنێ کە بریتیە لە پەروەردەکردن‌و سەرپەرشتیکردنی نەوەی نوێ. کاتێك ئافرەت کاردەکاتە سەر کۆمەڵگەکە — وەیان کۆمەڵگەکە کاردەکاتە سەرئەو — بەوەی دەکرێتە خزمەتچی فرۆکەو پاپۆرو ئۆتێلەکان!.. یان کاتێك هەموو ووزەی خۆی لە (بەروبوومی ماددی)دا سەرف دەکات یا لە (پیشەسازی ئامێر دروستکردن)دا، لەجیاتی ئەوەی لە (پیشەسازی مرۆڤ بەرهەم هێنان)دا سەرفی

بکات ﴿کە ئەوکاتە بەرهەمی ماددی زۆر بەرێزترو خۆشەویسترو بەنرختر دەبێ لە (بەرهەمی مرۆڤایەتی)﴾.. لە هەریەك لەو کاتانەدا ئەو کۆمەڵگەیە نموونەی (دواکەوتنی شارستانێتی) دەبێ — ئەگەر بە پێوەری مرۆڤایەتی بپێورێ — ئەو کۆمەڵگەیەش بەپێی زارەوە ئیسلامییەکە، کۆمەڵگەیەکی جاهیلییە!

مەسەلەی خێزانو پەیوەندی نێوان ژنو مێرد، مەسەلەیەکی گرنگو پێوەرییە باشترین پێوەری دیاریکردنی سیفەتی کۆمەڵگەیە، کە ئایا دواکەوتووە یان پێشکەوتووە؟ جاهیلییە یان ئیسلامی؟! چونکە ئەو کۆمەڵگەیەی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی دەبێتە خوورەوشتو بەهای ئاژەڵی، مومکین نیە بتوانێ کۆمەڵگەی پێشکەوتووو شارستانی دابمەزرێنێ، با پیشەسازیو ئابووریو زانستیشی هەر سەرکەوتووبێ! چونکە ئەم پێوەرە کاتێك ڕادەی پێشکەوتنی (مرۆڤایەتی) دەپێوێ هەڵە ناکات!

لە کۆمەڵگا جاهیلییەکانی ئەمڕۆدا مانای (خووڕەوشت) تەنها لەچەند بوارێکی تەسکدایە، بەجۆرێك کە واز لە هەموو پەیوەندییەك دەهێنرێ، کە (مرۆڤایەتی) لە دیاردە (ئاژەڵ)ییەکان جوێ دەکاتەوە! لەم کۆمەڵگایانەشدا پەیوەندی جنسییە غەیرەشەرعییەکان — تەنانەت پەیوەندییە نامۆ (شاذ)ەکانیش — بەبێ ڕەوشتیو داوێن پیسیو شورەیی دانانرێن.. بەڵکو مانای خووڕەوشت تەنها لە مامەڵەی ئابوریو لە سیاسەتدا گیر دەخواتو بەس، تەنانەت ئەویش لە سنوری (بەرژەوەندی دەوڵەت)دایە.. بۆ نمونە نەنگو بێ ئابڕووییەکەی (کریستین کیلەر)و (پرۆفیمۆ)ی وەزیری بەریتانی ئینگلیزی کە لە کۆمەڵگەی ئینگلیزیدا بەشورەیی دانرا، لەلایەنی جنسییەکەیەوە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە کریستین کیلەر هاوڕێی پاشگری دەریایی ڕووسی (الملحق البحری الروسی) بوو.. وەکە بە کارێکی دژوار (خطر)یان دانا، کە کارتێکردنی زۆرە لە نهێنیەکانی دەوڵەتدا، لەبەر ئەوەبوو کە چۆن ئەو وەزیرە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کچە پەیداکردووە؟! وە تەنها ئەو لایەنەیان لە مەسەلەکە دەبینی کە بۆچی وەزیر درۆی لەگەڵ پەرلەمانی ئینگلیزیدا کرد!.. هەروەها نەنگو ئابڕووتکانەکانی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکیو، ئابڕووتکانی ئەو فەرمانبەرو سیخوڕە ئینگلیزیو ئەمریکایانەی ڕایان کرد بۆ روسیاو بوونە پەناهێندە

.. ئەمانە هەموویان وەنەبێ لەبەر لایەنی جنسییەکەیان بەشورەییو ئابڕوچوون دانرابن، بەڵکو لەبەر ئەوە بوون کە کارێکی دژواراویان کردبووە سەر نهێنیەکانی دەوڵەت.

نووسەرو ڕۆژنامەگەرو ڕیوایەتنووسەکانی کۆمەڵگا جاهیلییەکان، لێرەو لەوێ، بۆ کچو ژنە خاوەن مێردەکانیان بڵاودەکردەوە کە (سەربەستی) سەرجێیی کردن، شورەییو ئابڕووچوونی ڕەوشتی نیە، بەڵکو ئابڕوچوونی ڕەوشتی ئەوەیە کە کوڕێك کچە برادەرەکەی خۆی، وەیان کچێك کوڕە برادەرەکەی خۆی هەڵ خەڵەتێنی، بەوە کە دڵسۆز نەبێ لە خۆشەویستییەکەیدا! هەروەها شورەیی ئەوەیە ژنێکی خاوەن مێرد بەدیار مێردێکەوە دانیشێ کە ئارەزوی خۆشەویستی کوژابێتەوە! وە ئەگەر خۆی بگەڕیو برادەرێك بدۆزێتەوەو سەرراستانە هەموو لەشی خۆی بداتە دەستی، ئەوە نموونەی سیفەتی چاکییە!.. دەیان چیرۆك لە خولگەی ئەم مەسەلانەدا دەگەڕێنو! سەدان تەوجیهاتی هەواڵدانو وێنەی کاریکاتێریو نوکتەو گاڵتەبازی هەر لەسەر ئەم مەسەلەیە دادەڕێژرێ.

کۆمەڵگەی وا بەڕای (مرۆڤ)و بەگوێرەی پێوەری هێڵی پێشکەوتنی (مرۆڤایەتی) کۆمەڵگەیەکی شارستانی نیەو دواکەوتووە.

هێڵی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەرەو ئیتجاهی (زەبت کردن)ی ئارەزووە ئاژەڵییەکان دەچی، وە لە چوارچێوەی (خێزان)و لەسەر بناغەی (ئەرکی سەرشان) دادەمەزرێ، تا لەو ڕێگایەوە (کارێکی مرۆڤایەتی) بهێنرێتە دی کە تەنها لەزەت کردن نەبێتە هەموو مەبەستێك. بەڵکو مەبەست ئامادەکردنو پەروەردەکردنی نەوەیەکی نوێی مرۆڤایەتی بێ، کە لەپاش ئەم نەوەیەی ئێستا بێتەدیو بتوانێ میراتی شارستانێتی (مرۆڤایەتی) بگرێتەدەست وابێ بەوانە جوێ بکرێتەوەو سیفەتە مرۆڤایەتییەکانی تێدا بدرەوشێتەوە.. مومکینیش نیە نەوەیەکی وا لە باوەشی خێزانێکدا بێتەدی کە ئاسایشو دابینبوونی عاتیفەو هەستو سۆزی بۆ زامن نەکرابێ، یان خێزانێك لەسەر بناغەی ئەرکی سەرشانو شارەزایی کاروبار دانەمەزرابێ وابێ کە ئینفعالاتی کتوپڕ شلۆقی نەکات.. ئەمما لە کۆمەڵگەیەکدا

کە ئەو جۆرە تـەوجیهات‌و ڕابەرێتییـە پیسـە ژەهراوییـە بیهێنێتـەدی، کـە مانـای خووڕەوشت تەنها لە چـەند بـوارێکی تەسـکیدا مابـێ‌و، وازی لـە هـەموو ئـاداب‌و ڕەوشتێکی پاکی جنسی هێنابێ، مومکین نیە باوەشـی مرۆڤایـەتی‌و پیـاوەتی لـەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا بکرێتەوە..

لەبەر ئەمەیە کە هـەموو خووڕەوشـت‌و تـەوجیهات‌و زامنکردنێکـی ئیسـلامی شیاوی مرۆڤەو، (ئیسلام خۆی شارستانێتی) دەبی‌و کۆمەڵگـەی ئیسـلامیش خـۆی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو شارستانی دەبێ .. ئەمـەش بـەو پێـوەرە دەپێـورێ کـە هەمیشە نەگۆڕە هەرگیز تێك ناچێ.

❊ ❊ ❊

لە کۆتاییدا، کاتێك (مرۆڤ) بەشێوەیەکی ڕاست جێنشینێتی (خوا) دەکات لەسەر زەمیندا. بەوەی کە : پەرستنەکان بۆ خـوا تـەرخان دەکـات‌و، خـۆی لـە پەرسـتنی غەیری خوا ڕزگاردەکـات‌و، تـەنها پرۆگرامەکـەی خـوا تطبیـق دەکـات‌و، داننانـێ بەراسـتی‌و دروسـتی پرۆگرامـی تـری غـەیری پرۆگرامەکـەی خـواو، تـەنها بـە شـەریعەتەکەی خـوا حـوکمی ژیـانی خـۆی دەکـات‌و، ئینکـاری هـەموو یاسـاو شـەریعەتێکی تـر دەکـات.. وەکاتێـك لـەو خوڕەوشـتەدا دەژی کـە خـوا بڕیـاری لەسەرداوەو هەموو خوڕەوشتێکی تر کە خوا پێی ڕازی نیـە، دەخاتـە لاوەو، پاشـان دەکەوێتە بەکارهێنانی ئەمانە بۆ بەرزبوونەوەی ژیان‌و، دەکەوێتە دەرهێنـانی کـانزاو ڕزق‌و ڕۆزییەکانی زەمین، کە خوا پێی بەخشـیووە..و کاتێك ئەو ڕێسا گەردونیانـەی خوا کردونی بە مۆرو دەسەڵاتی بەکارهێنانی داوەتە دەست مرۆڤ، بۆ ئەو ماوەیـەی خوا دیاری کردووە (کە مرۆڤ پێویستێتی لە چەسپاندنی جێنشینێتییەکەیدا).. واتە کاتێك مـرۆڤ بـەپێی مـەرج وپـەیمانی خـوایی جێنشـینێتییەکەی بـەڕێوە دەبـات‌و، دەکەوێتە هەڵ هێنجانی ڕۆزی لە سەرچاوە زەمینیەکانەوە، کە کەرەسـتە خاوەکـانی زەمین دەکات بەو شتانەی پێویستنی‌و، پیشەسازییە جۆربـەجۆرەکانی لـێ دروسـت دەکات‌و، بەکاریان دێنێ بەقەدەر مەودای ئەو شـارەزایی یـەی بـە درێـژایی مێـژوو

چــنگی کــەوتووە.. کــە ئەمانــە دروســت دەکــاتو، دەبێتــە (خواوویســت)ێکی ڕاستەقینەی وا جێنشینێتی خوا بکات لەسەر زەمینداو، بەو شێوەیە خوا دەپەرستێ .. ئەو کاتە مرۆڤـ دەبێتە خاوەن شارستانێتییەکی تەواوو، کۆمەڵگەکەشــی دەگاتــە لوتکەی شارستانێتی.. ئەگینا — تــەنها — داهێنــانی مــاددی لــە ئیســلامدا پێــی ناوترێ شارستانێتی ئەگەر بشبێ جاهیلییەتی تێکــەڵ دەبــێ.. خــوای گــەورەش زۆر نمونەی ئەو جۆرە شارستانێتییە خاوەن داهێنانی ماددییەی لە قورئاندا هێناوەتــەوە، کە هەموویان لەڕیزی جاهیلییەت دەژمێرڕێن وەك دەربارەی گەلی عاد دەفەرموێ:

**(أَتَبنون بِكُل ريع آية تَعبَثون؟ وتَتخِذونَ مَصانع لَعلَكُم تخلدون! وإذا بَطَشتُم بَطَشتُمْ جَبارين، فاتَّقوا الله وأَطيعوني، وَاتَّقوا الذى أمدكُم بِما تَعلَمون، أمدكُم بِأنعام وَبَنين، وَجنَّات وَعيون، إني أَخافُ عَلَيكُم عَذاب يَوم عَظيم)**(الشعراء: ١٢٧–١٣٥)

واتە: ئەوە ئێوە بۆیە کۆشكو تەلاردەکــەن تــا توانــاو زانســتی خۆتــان دەربــبڕنو شانازی بەسەریەکدا بکەن؟ ئێوە ئەمانە هەر بەهەوانتە دروست دەکەن، یــان قوللــەو قەڵا دروست دەکەن تا تێیاندا بمێننەوەو نەمرین؟ وا دەزانن نامرن؟ ئێوە وەك بەهێزو پتەون، زۆر دڵڕەقن. کە دەستان وەشاند، زۆر سەخت دەیوەشــێنن دە لــەخوا بترســنو بیپەرستنو گوێڕایەڵی فەرمانی من بکەن کە نێرراوی ئەوم. لەوکەسە بترسن کــە ئــەو هەمووەی پێبەخشیون کە خۆشتان دەیزانن. مەڕومالات، کوڕوکاڵ، بــاخو باخــاتو، کانیاوی زۆر، من لەوە دەترسێم (ئەگەر بەگوێی نێرراوەکەی خواتان نەکرد) ئازارێکی زۆر بەژانتان بۆ نازڵ بێ.

وە دەربارەی گەلی ثمود دەفەرموێ:

**(أَتَترُكون فيما ها هُنا آمنين؟ في جَنات وَعيون، وَزروع ونَخل طَلعها هَضيم، وتَنحتون مِن الجِبال بيوتا" فارهينْ؟ فاتَّقوا الله وأَطيعوني، وَلا تَطيعوا أَمرَ المُسرفين، الذينَ يَفسِدون في الأرضِ ولا يَصلحونْ)**(الشعراء: ١٤٦–١٥٢)

واتە: بۆ ئێــوە وا دەزانــن هــەروا لێــرە بــەهێمنی دەمێننــەوە؟ (کــە گوێڕایــەڵی فەرمانی خواش ناکەن) خوا ئەم هەموو نازو نیعمەتەی بەئێوە بەخشیوە، ئەوە بــاخو باخاتو کانیاوی زۆرو کشتوکاڵ، ئەوە خورما، کە چۆن دەنکە قەسپەکانی گەییوونو

هێشوویان بەسەریەکدا کردووە. ئێوە ئەوەتا لە چیا خانوو هەڵدەکۆڵن‌و زۆر بە زیرەکانە دەیاننەخشێنن، بێ‌ئەوەی پێویستیتان پێی بێ. دە لە خوا بترسن‌و بیپەرستن‌و گوێڕایەڵی فەرمانی من بکەن کە نێرراوی خوام. گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو سەرکردەو فەرماندانە مەکەن کە بەرەو هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانتان دەبەن ئەوانە شەڕخوازی‌و خراپەکاری دەکەن لەسەر زەمیندا، خۆ چاکەو خێرخوازی ناکەن.

**(فَلَما نَسوا ما ذكرِّوا بهِ فتَحنا عَلَيهم أبوابَ كُل شَيء حَتى إذا فَرحوا بِما أوتوا أخَذناهم بَغتة فإذا هُمْ مُبلِسون، فَقَطع دابر القَوم الذينَ ظَلَموا وَالحَمدلله رَبِ العالَمين)** (الأنعام: ٤٣–٤٥)

واتە: کاتێك ئەوەی کە بۆمان ناردبوون، لەبیرخۆیان بردەوەو پشتیان تێکرد، ئینجا بواری هەموو جۆرە شتێکمان بۆکردنەوە، لە هەرچی شتێك خۆیان حەزبکەن‌و بیانەوێ، کاتێك پێی دڵخۆش‌و بەختیاربوون، لەناکاودا بێ‌ئەوەی ئاگایان لێبێ هەموو شتێکمان لێ‌گرتنەوە، ئینجا لە هەموو خێرێك رەش بێن (مەئیوس) بوون‌و هیوای ئەوەیان نەما کە هیچیان دەست بکەوێ. ئاوا ئەو نەتەوەیەی ستەمیان دەکرد تەفرو توونابوون. سوپاس بۆ خوای هەموو جیهانیان.

**(حتی إذا أخَذت الأرض زَخرفها وازينتْ وَظَّن أَهلها أنَّهم قادرونَ عَلَيها أَتاها أَمرنا لَيلا" أو نَهارا" فَجَعلْناها حَصيدا" كأَن لَمْ تغني بالأمس)**(يونس– ٢٤)

واتە: تا ئەوکاتەی زەمین جوانی‌و ئاڵ‌و واڵایی خۆی پۆشی، خەڵکەکەی – ئەوانەی کشتوکاڵیان کردبوو لەسەر زەمیندا – وایانزانی دەتوانن بیدۆڕنەوەو بەرهەمەکەی بکەنەوە لە پڕ فەرمانمانی لە شەوێکدا یان لە رۆژێکدا بۆ چوو، هەموویان ووشك کرد ئەتووت هەر ئەوەی دوێنێش نیە.

بەڵام ئیسلام وەکو ووتمان ماددە بەبێ نرخ دانانێ، بەڵکو ئەم جۆرە پێشکەوتنە – لەژێر سایەی پرۆگرامەکەی خوادا – بەیەکێك لەو نیعمەتانە دەژمێرێ کە خوا بەبەندەکانی بەخشیوەو تا ئەوانیش زیاتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوابکەن، خوا زۆرتر مژدەی پاداشتی چاکەیان دەداتەوە.

(فقُلت استَغفروا رَبّكمْ إنّه كانَ غفّارا"، يَرسل السَّماءَ عَلَيكم مِدرارا"، وَيمددكمْ بِأموال وَبَنين وَيَجعل لَكُمْ جَنّات وَيَجعل لَكمْ أنهارا") (نوح: ١٠-١٢)

واتە: حەزرەتی نوح – سەلامی خوای لێ بێت – دەیفەرموو: پێم ووتن داوای لێخۆشبوون لە خوای خۆتان بکەن، چونکە خوا زۆر لە گوناهان خۆشدەبێ ئەوەتا لە ئاسمانەوە بارانێکی زۆرتان بۆ دەبارێنێ، تا زەویەکانتان بەپیت بکاتو پاش مردنیان زیندویان بکاتەوە. خوا سامانو کوڕی زۆرتان دەداتێو، باخو بێستانی زۆرتان پێدەبەخشێو ئاوی زۆرتان بۆ هەڵدەقوڵێنێو باخو باخاتو روبارتان بۆ دروست دەکات..

(وَلو أن أهلَ القُرى آمَنوا واتَّقوا لَفَتحنا عَلَيهم بَرَكات مِن السَّماء والأرضِ ولكن كَذّبوا فأخَذناهُم بِما كانوا يَكسِبونْ) (الأعراف- ٩٦)

واتە: ئەگەر خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان بهێنایەو لە خوا بترسانایە، فەڕو بەرەکەتێکی زۆرمان پێدەبەخشین چ لە ئاسمانەوە چ لە زەمینەوە. بەڵام چونکە نیشانەکانی خوایان بەڕاست نەزانی، تەفروتوانامان کردن.

گرنگ ئەو ڕێسایەیە کە ئەو پێشکەوتنە پیشەسازییەی لەسەر دادەمەزرێ، جۆری ئەو خووڕەوشتەیە کە لەناو خەڵکیدا بڵاودەبێتەوە کە بە هەموویان پێکەوە تایبەتمەندی شارستانێتی (مرۆڤایەتی) دێتەکایەوە.

❊ ❊ ❊

پاشان ئەو بنکەیەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لێوە دەردەچێ، سروشتی پێکهاتنی ئەندامێتی (التكوين العضوي)، سیمایەکی وا دەدەن بەو کۆمەڵگەیە کە کۆمەڵێکی شێوە تایبەت بێ، بەجۆرێك کە لەوانەیە هیچ تیۆرێکی بەسەردا نەچەسپێ لەو تیۆرانەی کە دامەزراندنی کۆمەڵگە جاهیلییەکانو سروشتی پێکهاتنی ئەندامێتی پێ لێك دەدەنەوە.. کۆمەڵگەی ئیسلامی سەرەنجامی بزوتنەوە دێتەکایەوە..

بزوتنەوەکەشی هەر تێدا بەردەوامە، هەر ئەویشە کە نرخو پلەی تاکەکانی خەڵکی پێ دیاری دەکرێ بەپێی ئەوە پلەوپایەو ئیشو کاریان بۆ دیاری دەکرێ .

ئەو بزوتنەوەیەی ئەم کۆمەڵگەیەی لێوە دێتەکایەوە، هەر لە سەرەتایەوە لە دەرەوەی سنوری زەمینو لە دەرەوەی سنوری مرۆڤەوە هاتووە..چونکە بریتیە لە عەقیدەیەك کە لە خواوە بۆ مرۆڤ هاتووە، کە دیدێکی تایبەتیان بەرامبەر بە بونەوەرو مێژوو، ژیان خووڕەوشتو ئاوات ئامانج بۆ دادەڕێژێو، پرۆگرامێکیشیان بۆ کارکردن بۆ دیاری دەکات، کە ئەم بیروباوەڕەی تێدا بدرەوشێتەوە...ئەو یەکەم پاڵەی لەسەرەتاوە بزوتنەوەکە دروست دەکات، وەنەبێ لە دڵو دەرونی خەڵکەکەوە، یان لە کەرەستەی ئەم گەردونەوە هەڵقولابێ ... بەڵکو وەکو ووتمان — لەدەرەوەی سنوری زەمینو مرۆڤەوە هاتووە...ئەوەش یەکەمین نیشانەی جوێکردنەوەی سروشت پێکهاتنی کۆمەڵگەی ئیسلامییە.

ئەو بیروباوەڕەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێ لە توخمێکەوە دێ کە لەدەرەوەی سنوری مرۆڤ و دەرەوەی سنوری گەردونە ماددییەکەوەیە.

یەکەمین هەنگاوی بزوتنەوەی دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامیو ئیشکردنی (مرۆڤ) بەو توخمە نادیارە دەست پێدەکات کە هیچ کەسێك نایەت بەخەیاڵیداو هیچ حسابێکی بۆ دانانێ، کە مرۆڤ - لەسەرەتای دەست پێکردنیەوە — دەستی تێدا نەبووە... ئینجا دەکەوێتە کارکردن.

مرۆڤێك باوەڕی بەم عەقیدەیە هێنابێ، کە ئەمیش لەو سەرچاوە نادیارەوە هاتووەو... بەڕادەیەکی دیاریکراوی خوایی دەروات.. وکاتێك ئەم مرۆڤە باوەڕ بەم عەقیدەیە دێنێ، هەر بە (حوکمی ئەوە) بوونی کۆمەڵگەی ئیسلامی دەست پێدەکات. چونکە هیچ کەس نیە کە ئەم عەقیدەیەی وەرگرت، ئیتر گۆشەگیر بکەوێتو خەریکی خەڵوەت کێشان بێت! نەخێر، بەڵکو بەو عەقیدەیەوە دێتە مەیدان .. چونکە سروشتی عەقیدەکە وایە.. سروشتێکی بزوێنەری زیندووە. ئەو هێزە مەزنەی ئەو عەقیدەیەی خستەناو ئەو دڵەوە، دەزانێ کە عەقیدەکەی تێدا مت

نابێ، بەڵكو حەتمەن لەویشدا تێدەپەڕێ! ئەو پالە زیندوەی ئەم عەقیدەیەی خستەناو ئەو دڵەوە بەردەوام دەبێو دەكەوێتەڕێ .

كاتێك ئەوانەی باوەڕیان بەم عەقیدەیە هێناوە دەبنە سێ‌كەس، عەقیدەكە پێیان دەڵێ : ئێستا ئێوە كۆمەڵگەیەكن، كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی سەربەخۆی لە كۆمەڵگەی جاهیلی دابڕاو چونكە هێشتا كۆمەڵگەی جاهیلی ئەم عەقیدەیەی ئەوانی وەرنەگرتووەو، خووڕەوشتی ئیسلامیان تێدا بڵاونەبۆتەوە — ئەو خووڕەوشتەی لەوەو پێش باسمان كرد ئەوكاتە دەوترێ بەڵێ كۆمەڵگەی ئیسلامی دروست بووە !

ئەو سێیە دەبنە دە، دەیەكەش دەبێتە سەد، سەدەكەش دەبێتە هەزار، هەزاریش دەبێتە دوازدەهەزار... ئەوكاتەش بوونی كۆمەڵگەی ئیسلامی دێتەكایەوەو بڕیاری لەسەردەدرێ!

لە ڕێگادا شەڕ لەنێوان كۆمەڵگەی نوێ لەدایك بووو، كۆمەڵگەی جاهیلیدا بەرپا دەبێ.. ئەو كۆمەڵگە نوێیەی كەلە عەقیدەو بیروباوەڕو، خووڕەوشت ئیعتباراتو، قەوارەو بوونی خۆیدا لە كۆمەڵگەی جاهیلی جوێ بۆتەوە .. ئەگەرچی ئەندامەكانی كۆمەڵگەی نوێ هەر لە كۆمەڵگە جاهیلییەكەوە هاتوون.. بزوتنەوەكەش هەر لەخاڵی دەرچوونەوە تا خاڵی سەلماندی بونی خۆ، هێماو سیمایەكی تایبەتی خۆی دەبێ، كە وەك نیشانەیەك وایە تاكی كۆمەڵگە نوێكەی پێ بناسرێتەوە كە تازە دروست بووە. هەر تاكێكیش كێش‌و پلەیەكی دیاریكراوی لە كۆمەڵگەكەدا — بەپێی ئیعتباراتو تەرازوی ئیسلامی — دەدرێتی. ئەم كێش‌و پلەیەش كە دەیدرێتێ لەلایەن كۆمەڵگەوەیە بێ‌ئەوەی خۆی خۆی بەچاك بزانێ، یا ئاگاداری بۆ بڵاوكردبێتەوە كە خۆی چاكە — وەكو لە هەڵبژاردنی (انتخابات)ی سیاسیدا دەكرێت، بەڵكو ئەو عەقیدەیەی خۆی هەیەتی‌و، ئەو خووڕەوشتەی لەوو لە كۆمەڵگەكەیدا بڵاوبۆتەوە، وای لێدەكەن خۆی دەرنەخات‌و خۆی نەخاتە بەرچاوی ئەوانەی سەرنجیان داوەتی‌و، چاویان تێبڕیووە لەو دەوربەرەی خۆیدا!

بەڵام چونکە سیفەتی عەقیدەی ئیسلامیو سیفەتی ئەو کۆمەڵگەیەی لێوەی دروست بووە بریتیە لە (بزوتنەوە)، ناهێڵێ کەس خۆی بشارێتەوە، مومکین نیە دەبێ هەر یەکێك لە ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بجولێو، بزوتنەوەی هەبێ : بزوتنەوە لە عەقیدەکەیدا، بزوتنەوە لەخوێنیدا، بزوتنەوە لە کۆمەڵگەکەیدا، بزوتنەوە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئەندامانە (مجتمع عضوي) لەو جاهیلییەتەی لە دەوروپشتێتی. لەو جاهیلییەتەی هێشتا خلتەی لە دەرونی ئەمو ئەوانی دەوروپیشتیدا ماوە ئەمەش شەڕێکی رۆژانەیە .. لە دڵو دەروندایە.. لە رەوشتدایە.. لە کۆمەڵگەکەشدایە.. ئەو شەڕەش بەردەوامە جیهادیش تا رۆژی دوایی هەر بەردەوامە.

کاتی بزوتنەوەو لەگەڵ ئاوازی بزوتنەوەکەدا، باروزروفی هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵگەیە دیاری دەکرێو، سنور بۆ ئیش وکاری دەکێشرێو، پێکهێنانی ئەندامێتی ئەو کۆمەڵگەیە بە گونجانی نێوان تاكو کۆمەڵە ئیشکەرەکانیەوە، بەتەواوی دروست دەبێ. ئیتر ئەندامان هەست دەکەن بزوتنەوەو کۆمەڵگەکەیان لازمو مەلزومن ..

ئەم دروست بوونو پێکهاتنە دوو سیفەتن لە سیفەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی کە بوونو دروست بوونو، سیماوشکلو، تەرازوی سیستەمو، کاروباری ڕاپەڕاندنی ئەم سیستمە ئیسلامییە دیاری دەکەنو لە سیفاتی کۆمەڵگەی جاهیلی جویی دەکەنەوە. ئەم دیاردەو ڕواڵەتانەش هەریەکەیان بۆخۆیان سەربەخۆن. وەنەبێ بەچەند مەفهوماتێکی کۆمەڵایەتی بێگانە چارەسەر بکرێن، یان وەنەبێ بەگوێرەی پرۆگرامێك دیراسە بکرێن کە لەگەڵ سروشتی خۆیدا ناگونجێ، یا بەچەند بەندو هەنگاوێك رابپەرێنرێ کە لە سیستمێکی ترەوە وەرگیرابێ .

* * *

کۆمەڵگەی ئیسلامی — وەکو لە پێناسە سەربەخۆکەی خۆماندا دەردەکەوێ کە بۆ شارستانێتی دەیکەین — بریتی نیە لە وێنەیەکی سافی مێژویی لەیادگارەکانی رابوردودا بۆیبگەڕێین!، بەڵکو بریتیە لە داواکاری ئێستاو هیواو ئاواتی دوارۆژ . هەروەها بریتیە لەو هیواو ئاواتەی هەموو مرۆڤایەتی دەتوانێ لە (ئەمڕۆ یان سبەینێ)دا چاوی تێ ببڕێ تا لە جاهیلەت قوتاریکا.. لەو جاهیلییەتەی تێیدا نقووم بووە جائیتر ئەم جاهیلییەتە نەتەوەی پێشکەوتووی پیشەسازیو ئابووری تێدابێ یا نەتەوەی هەژار .

ئەو بەهاو خووڕەوشتەی بەشێوەیەکی گشتی دەست نیشانمان کرد، بەهاو خووڕەوشتێکی (مرۆڤایەتی)ن، تەنها لەماوەی (شارستانێتی ئیسلامی)دا نەبێ مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیووە (لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە مەبەستمان لە زاراوەی (شارستانێتی ئیسلامی) ئەو شارستانێتییەیە، کە ئەو بەهاو خووڕەوشتەی تێدا هاتبێتە دی نەك تەنها بریتی بێ لە پێشکەوتنێکی پیشەسازی یان ئابوری، یان زانستی، لەکاتێکدا کە ئەو کێشو خووڕەوشتە دواکەوتووبێ).

ئەم بەهاوخووڕەوشتەش وەنەبێ شتێکی (ئایدیالیستی خەیاڵی) بێ، بەڵکو بەهاو خووڕەوشتێکی کردەوەیی واقیعی یە، ودەتوانرێ — لەژێر سایەی مەفهومە ڕاستە ئیسلامییەکاندا — بەتوانای مرۆڤ بهێنرێتەدی.

جائیتر لەهەر دەوروبەرێکدا بێ، بێئەوەی تەماشای جۆری ژیانی بکرێت، یان تەماشای مەوادی پێشکەوتنی پیشەسازیو ئابوریو زانستی بکرێ. چونکە ئەو بەهاو خووڕەوشتە وەنەبێ لەگەڵ پێشکەوتندا یەکانگیر نەبنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەر بەتەرازوی عەقیدەکە دەبێتە هاندەری ئەو پێشکەوتنە —و لەهەمان کاتیشدا وەنەبێ لەو وولاتانەی لەم بوارانەدا هێشتا پێشکەوتونین، دەسەوسان بووەستێ، چونکە شارستانێتی دەتوانرێ لە هەموو جێیەكو لە هەموو دەوروبەرێك دابمەزرێنرێ — مادام لەسەر بناغەی بەهاو خووڕەوشت دابمەزرێ — ئەمما شکڵە ماددییەکەی: ئەوە هەر دەوروبەرێك سەربەستە لەوەدا کە بە چ شێوەیەك

دایدەمەزرێنێ. چونکە هەر دەوروبەرێك ئەو توانایانە بەکاردێنێ کە لەناوچەکەیدا هەیە وە دەتوانێ گەشە بەناوچەکە بدات ..

کەوابوو کۆمەڵگەی ئیسلامی – لەلایەن شکڵ‌و قەوارەو جۆرو چۆنیەتی ژیانی – وێنەیەکی نەگۆڕی مێژوویی نیە، بەڵام بوون وشارستانێتی‌یەکەی پشت بەبەهاو خووڕەوشتێکی مێژوویی نەگۆڕ دەبەستێ .. کاتێك دەڵێین (مێژوویی) مەبەستمان لەوەنیە کە ڕۆژی لە ڕۆژان، ئەو بەهاو خووڕەوشتە لە مێژودا ناسرابێ .. چونکە خۆ ئەو بەهایە مێژوو دروستی نەکردووەو سروشتی ئەو کێشە پەیوەندی بەکاتەوە نیە.. ئەمە حەقیقەتێکەو دوای واقیعێکی مرۆڤی‌و دوای بوونێکی ماددی لە سەرچاوەیەکی خوایی یەوە بۆ مرۆڤ هاتووە.

هەروەها شارستانێتی ئیسلامی لە پێکهاتنی ماددی‌و پەیکەری کارگێرییەکەیدا لەوانەیە شکڵی جۆربەجۆر بگرێتەبەر. بەڵام ئەو ئەسڵی بەهاو خووڕەوشتەی لەسەریان دادەمەزرێ هەربە نەگۆڕی دەمێنێتەوە، چونکە ئەوانە بنەمای شارستانێتین (کە خواپەرستییە) کۆمەڵە پێکهێنان لەسەر بناغەی پەیوەستی عەقیدە – نرخ‌و مەزنی مرۆڤایەتی مرۆڤ لە سەرو نرخ‌و مەزنی ماددەوەیە فەرماندێتی ئەو بەهاو خووڕەوشتەو مرۆڤایەتییەی گەشە بە مرۆڤایەتی مرۆڤ دەدات نەك بە ئاژەڵییەتی یەکەی. ڕێزو کەرامەتی خێزان جێنشینێتی خوا لەسەر زەمین بەپێی مەرج‌و پەیمانی خوایی. هەروەها حوکم کردن تەنها بە پرۆگرام‌و شەریعەتەکەی خوا لە ئیش‌وکاری جێنشینێتیدا).

ئەو (شێوەو شکڵ)انەی شارستانێتی ئیسلامی کە لەسەر ئەم بناغە پتەوو نەگۆڕانە دادەمەزرێن. بێگومان کارتێکردنی بەگوێرەی پێشکەوتنی پیشەسازی‌و ئابوری‌و زانستی دەگۆڕێ. چونکە شارستانێتی ئیسلامی لەو دەوروبەرەی کە خۆی تێیدایەتی چی هەبێ، ئەوە بەکاردێنێ .. لەبەرئەوە مومکین نیە هەر دەبێ شێوەکانی جۆربەجۆربن تا نەرمی‌و کشانێکی وای هەبێ بتوانێ بچێتە هەموو دەوروبەرو ئاستێکەوە لە چوارچێوەیەکی ئیسلامیدا، وەتا بتوانێ لەگەڵ بنەماو بەهاو خووڕەوشتی ئیسلامیدا بسازێ.. ئەم نەرمی‌و کشانەش – لە شکڵەکانی

دەرەوەی شارستانێتیدا وەنەبێ لەسەر عەقیدەی ئیسلامی کە شارستانێتی لێوە دروست دەبێ — فەرزکرابێ، بەڵکو ئەمە هەر لە سروشتی خۆیدا هەیە.. بەڵام خۆ نەرمیوکشان، بریتی نیە لە چرِوخەستی. نەرمیو کشانو، چرِیوخەست بوونەوەش جیاوازییەکی زۆریان هەیە.

ئیسلام شارستانێتی خۆی لەنێو ڕووتەکانی ناوەڕاستی ئەفریقادا دادەمەزراند، چونکە تەنها بە بوونی ئیسلام لەوێ، ئەو لەشە ڕووتانە دادەپۆشرێنو، خەڵکی دەچنە ناو شارستانێتی پۆشاکەوە. چونکە تەوجیهاتی ڕاستەوخۆی ئیسلامی فێری ئەوەیان دەکات هەروەها خەڵکی لە سستیو تەمەڵییەوە دەکەونە چالاکی کارکردن بۆ وەدەستهێنانی گەنج وکانزاکانی جیهانی ماددی. لە قۆناغی هۆز — یان تیرەوگەل —ەوە دەگۆڕێن بۆ قۆناغی نەتەوە. هەروەها لە پەرستنی دارو بەردو گۆشەگیرییەوە دێنە ناو پەرستنی خوای پەروەردگاری جیهانەوە.. ئەدی ئەگەر ئەمە شارستانێتی نەبێ، چی شارستانێتییە؟ ئەمە شارستانێتی ئەم دەوروبەرە ڕووتەیە، چونکە ئیعتماد دەکرێتە سەر ئەو تواناو ئیمکاناتانەی کە لەو دەوروبەرەدا هەن.. ئەمما کاتێك ئیسلام دەچێتە ناو دەوروبەرێکی ترەوە — بەهۆی بەهاو خووڕەوشتە نەگۆڕەکەیەوە، شارستانێتی بە شکڵو شێوەیەکی تردا دادەمەزرێنێ، ئەو کاتەش تواناو ئیمکاناتی ئەو دەوروبەرە نوێیە بەکاردێنیو گەشەی پێ دەکات.

دروست بوونو دامەزراندنە شارستانێتی — ئابەو شێوەیە: بەپێی ڕێبازو پرۆگرامی ئیسلامی — هەرگیز لەپلەیەکی دیاریکراوی پێشکەوتنی پیشەسازیو ئابوریو زانستیدا ناوەستێ. ئەگەر ئەو کاتەی ئیسلام هاتەجێیەك، ئەو پێشکەوتنانە هەبوون، ئەوا ئەوەندەی تر بەرەو پێشەوەیان دەبات و ئامانجەکانی بەرزتر دەکاتەوە، وە ئەگەر ئەو پێشکەوتنانەش نەبوو، ئەوا ئیسلام خۆی دروستیان دەکاتو دایاندەمەزرێنێو زامنی پێگەیشتنو گەشەدارێتییان دەبێ .. بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا هەرلەوەدا بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە، کە دەبێ هەر لەسەر ئەسڵە نەگۆڕەکان دابمەزرێ، تاکۆمەڵگەی ئیسلامی سیما سەربەخۆکەی خۆیو پێکهاتنە ئەندامێتییەکەی خۆی بمێنێ کە هەر لە یەکەمین هەنگاوی بزوتنەوەوە دەردەکەونو

کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کۆمەڵگە جاهیلییەکان جوێ دەکەنەوە .. ئەمەش ڕێبازێکی خوایی یە. کێ هەیە ڕێبازی چاکتر لە ڕێبازی خوایی دیاری بکات؟

**(صَبغة الله، وَمن أحسَن مِن الله صَبغة)** (البقرة– ١٣٨)

❊ ❊ ❊

# ئایدیۆلۆژی و ڕۆشنبیری ئیسلامی

وەکو لە بەشی (لا الە الا الله پرۆگرامی ژیانە)دا باسمان کرد، بڕیاری (خواپەرستی) تەنها بۆ خوایە، نیوەی یەکەمی ڕوکنی یەکەمی ئیسلامە، ئەمەش ناوەڕۆکی بڕیاری (لا اله الا الله)کەیەو چۆنیەتی وەرگرتنی ئەم پەرستنەش (کە دەبێ لە ڕێگای پێغەمبەرەوە بێ ﷺ بەشی دووەمی ئەم ڕوکنەیە، ئەمەش ناوەڕۆکی بڕیاری (محمد رسول الله)کەیە.

پەرستنی خوا لەوەدا دەردەکەوێ کە تەنها ئەو بەخوا دابنرێ، چ لە عەقیدە دابێ، چ لەپەرستنو، چ لە یاساو شەریعەت دابێ .. هەروەکو لە بەشی ناوبراودا زانیمان: موسڵمان نابێ وا باوەڕ بکات کە (خوایەتی) بۆ یەکێکی تری غەیری خوای پەروەردگار دەشێ، وە نابێ (پەرستن) بۆ یەکێکی تری غەیری خوای پەروەردگار بکات، هەروەها نابێ وا بزانێ کە (حاکمێتی) بۆ یەکێکی تری غەیری خوای پەروەردگار دروستە.

لەولا ناوەڕۆکی پەرستنو بیروڕاو عەقیدەو دروشم وحاکمیەتمان ڕوون کردەوە، وا لێرەشدا ناوەڕۆکی (حاکمێتی)و پەیوەندی بە (ڕۆشنبیری)یەوە باس دەکەین.

ناوەڕۆکی (حاکمێتی) لە ئایدیۆلۆژی ئیسلامیدا تەنها ئەوەندە نیە کە دەبێ شەریعەتی یاسایی لەخواوە وەربگیرێتو، هەر حوکمی ئەو ڕابپەرێنرێتو، تەنها شەریعەتەکەی خوا بچەسپێنرێت. لە ئیسلامدا ناوەڕۆکی (شەریعەت) تەنها لە یاسای شەریعەتو شێوەو ڕژێمو باروزروفی حوکمدا ڕاناوەستێ. نەخێر، ناوەڕۆکی (شەریعەت)و ئایدیۆلۆژی ئیسلامی تەنها ئەم ناوەڕۆکە تەسکەیان نیە.

(شەریعەتی خوایی) هەموو بەندێك دەگرێتەوە کەخوا بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤایەتی دایناوە، ئەمەش لەبناغەی عەقیدە، وبناغەی حوکمڕانی، وبناغەی خووڕەوشت، وبناغەی زانیاریدا دەردەکەوێ .

هەروەها لەعەقیدەو بیروهۆش ودیددا دەردەكەوێ — بەهەموو بنەماكانی ئایدیۆلۆژییەوە باوەڕكردن بەحەقیقەتی، بە حەقیقەتی خوایەتی، بە حەقیقەتی گەردون: دیارو نادیاری، بە حەقیقەتی ژیان: دیارو نادیاری، هەروەها حەقیقەتی مرۆڤو ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان ئەم حەقیقەتانەو هەڵسوكەوتی مرۆڤدا هەیە.

هەروەها لە باروزروفی سیاسیو كۆمەڵایەتیو ئابوریو، ئەو بناغانەی لەسەریان دادەمەزرێن دەردەكەوێ، تاپەرستنی تەواوی بۆ خوای تاكو تەنها تێدا دەربكەوێتو لە یاسادانانددا دەردەكەوێت: كە باروزروفێك رێك دەخات، ئەوەی كە بەمانا تەسكەكەی پێی دەڵێن (شەریعەت)، ئەگەرچی لەڕاستی ناوەڕۆكەكەیو لە ئایدیۆلۆژی ئیسلامیدا وانیە.

لە ڕێساكانی خووڕەوشتدا دەردەكەوێت، هەروەها بنەماو نەریت ئاكارە ڕەوشتییەكاندا دەردەكەوێت كە لەكۆمەڵگەكەدا بڵاوبوونەتەوە. كە خەڵكو كەلوپەلو ڕووداوەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی دەینوێنن .

پاشان لەهەموو لایەنەكانی (زانیارییی)دا دەردەكەوێت. هەروەها لە بناغەی چالاكییە سەربازیو هونەریەكاندا دەردەكەوێت.

ئەم هەموو لایەنانەش مومكین نیە هەردەبێ لە خواوە وەربگیرێ، وەكو كە حوكمە شەرعییەكان — بەمانا تەسكەكەی — لە خواوە وەردەگیرێن.. چونكە هەردوولایان وەك یەكن.

پاش ئەوەی ئاوا بە پێشەكییەكی كورت ڕونمان كردەوە، ئێستا كەمێك زیاتر مانای (حاكمێتی) — بەو مانایەی كە دەربارەی حوكمو یاسایە — ئاشكرابوو .

ئەما مەسەلەی رێساكانی خووڕەوشتو ئەو بەهاو هەڵسەنگاندنانە (القیم والتقییم)ی لە كۆمەڵگەدا بڵاون، خەڵكی پێیانەوە پابەندن هەمووی لە عەقیدەوە سەرچاوەیان گرتووە لە ئایدیۆلۆژی یەكەوە هاتوون، كە لە كۆمەڵگەكەدا هەیە. هەروەها لەو سەرچاوەیە هەڵقولاون كە عەقیدەی كۆمەڵگەكەی لێوە وەرگیراوە .

بەڵام ئەوەی کەلێرەدا ئاشکرانەبێ — تەنانەت لای ئەو کەسانەش کە ئەم جۆرە باسە ئیسلامیانە دەنووسن — گێڕانەوەی چالاکی یە فیکری‌و هونەری یەکانە بۆ ئایدیۆلۆژی ئیسلامی‌و سەرچاوە خوایی یەکەیان .

دەربارەی چالاکی‌یە هونەریەکان کتێبێکی تەواو دەرچووە، باسی ئەم کێشەیە دەکات بەو حسابەی کە هەموو چالاکی یە هونەری یەکان بریتین لە دەربڕینی ئایدۆلۆژی‌و وەڵامدانەوەو ئینفیعالاتی مرۆڤن، هەروەها بریتین لە دەربڕینی هەست‌و سۆز بەرامبەر بوونەوەرو ژیان بەو جۆرەی کە لە دەرونی مرۆڤدا هەستیان پێ‌دەکرێ .. لەم روانگەیەوەیە کە ئایدیۆلۆژی ئیسلامی حوکمی هەموو ئەوانە دەکات کە لە دەرونی موسڵماندا هەن‌و بگرە خۆشی بۆیان دروست دەکات — چونکە ئیسلام هەموو لایەنێکی گەردون‌و دەرون‌و ژیان دەگرێتەوە، هەروەها پەیوەندی ئەمانە بە خوای گەردون‌و دەرون‌و ژیانەوە دەبەستێتەوە بە ئایدیۆلۆژیەکی تایبەتی کە حەقیقەتی ئەو مرۆڤەو، شوێن پێی لەم گەردونەو، مەبەست لە بوون‌و، ئیش‌وکارو، هەڵسەنگاندنی ژیانی دیاری دەکات .. ئەمانەش هەمووی لە ئایدیۆلۆژی ئیسلامیدا هەن کە ئەویش وەنەبێ تەنها بیروهۆشێکی فیکری بێ، بەڵکو بیروهۆشێکی عەقیدەی زیندوی کاریگەری داهێنەری دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو چالاکییەکی قەوارەی مرۆڤ[1].

ئەمما مەسەلەی چالاکی یە فیکری یەکان، پێویستە ئەو چالاکی یانە بگەرێنرێتەوە بۆ ئایدیۆلۆژی ئیسلامی‌و سەرچاوە خوایی یەکەی، بۆ ئەوەی پەرستنی تەواوی خوای تاک‌و تەنها بێتەدی، کە دەبێ ئێمە ئەم مەسەلەیە بەتەواوی ڕوون بکەینەوە چونکەی لای خوێنەران — تەنانەت لای موسڵمانەکانیش، لەوانەی کە دەڵێن دەبێ حاکمێتی‌و یاسادانان تەنها لە دەسەلاتی خوا دابێ‌و بەس — شتێکی سەیرو ناسایی‌یە.

* * *

موسڵمان ناچارە لە مەسەلەیەکدا کە پەیوەندی بە حەقیقەتی عەقیدەکەی‌و بیروباوەڕی گشتی بوونەوەر، یا بەپەرستنەوە، یا بەخووڕەوشت‌و نەریت‌و

هەڵس‌وکەوتییەوە، یا پەیوەندی بەبیروڕاو بناغەکانی سیستمی سیاسی یان کۆمەڵایەتی، یان ئابورییەوە هەبێ، یان پەیوەندی بەهۆی چالاکییە مرۆڤایەتییەکان‌و بزوتنەوەی مێژووی مرۆڤەوە هەبێ .. ناچارە هەر دەبێ لە سەرچاوەیەکی خوایی یەوە وەری بگرێ .. ناتوانێ هیچ یەکێك لەمانە لە کەسێکی ترەوە وەربگری، چ مەگەر لەو موسڵمانەوە کە متمانە بەدین وخواناسی‌و عەقیدەکەیان دەکات کە خۆی واقیعی ژیانیان دەبینی‌و دەزانێ رادەی دینداریان چەندە..

بەڵام موسڵمان بۆی هەیە زانیاری یە ڕووتەکانی وەك: کیمیا، سروشتناسی، زیندەوەرزانی، گەردونناسی، پزیشکی، پیشەسازی، کشتوکاڵ، رێگاکانی کارگێڕی — تەنها لەڕووی هونەرییەوە، رێگا هونەرییەکانی کارکردن، شێوەی شەڕو شۆڕ- لەلایەنی هونەری یەوەو بەس.. تا دەگاتە ئاخر چالاکی مرۆڤ، دەتوانی ئەمانە هەمووی لە موسڵمان‌و ناموسڵمانەوە وەربگرێ .. ئەگەرچی لە بنەڕەتدا دەبێ کۆمەڵگەی ئیسلامی کە دروست دەبێ هەوڵی ئەوە بدات هەموو ئەمانەی ببێ چونکە (فەرزی کیفایەن): دەبێ چەند ئەندامێکی کۆمەڵ هەستن بە جێبەجێ‌کردنیان، ئەگینا کۆمەڵگەکە گوناهباردەبن، چونکە هەموو ئەمانە، یا ئەوەیە خۆیان پەیدایان نەکردووە، یا ئەوەیە بواری گونجاوی وایان نەکردۆتەوە کە خۆیان تێیدا بژین‌و فێربن‌و کاربکەن‌و بەرهەمی بهێنن.. بەڵام تا ئەو کاتەی ئەمانەی تێدا دێتەدی، موسڵمان بۆی هەیە ئەم زانیاری یە ڕووتەو، شێوەی تطبیق کردنیان بە کردەوە، لە موسڵمان‌و ناموسڵمانەوە وەربگرێ یان سوود لە ڕەنج زانینی موسڵمان‌و ناموسڵمان وەربگرێ، یان بواری موسڵمان‌و ناموسڵمان بدات لەو بوارانەدا کاربکەن.. چونکە هەریەك لەمانەی سەرەوە دەکەونەبەر ئەو حەدیسەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**أنتم اعلم بأمور دنياكم** - خۆتان ژیانی دونیایی خۆتان باشتر دەزانن -).. چونکە ئەمانە پەیوەنیان بە پێکهاتنی بیروباوەڕی موسڵمانەوە نیە، پەیوەندیان بەسەر جۆری لێکدانەوەی ژیان‌و گەردون‌و مرۆڤەوە نیە، هەروەها پەیوەندیان بەبوون‌و، ڕاستی ئیش کاریەوە نیە لەژیاندا یان بەجۆری ئەو پەیوەندیانەی بە بوونەوەری دەوروپشتی‌و بەخوای هەموو گەردونەوە، هەیەتی یان ئەو پەیوەندیانەی بەو خووڕەوشت‌و ئاداب‌و نەریت‌و هەڵس‌وکەوتەوە نیە کە لەناو کۆمەڵدا هەن‌و بوونەتە سیمای کۆمەڵگەکە..

مادام ئەو زانستییانە پەیوەندی وایـان لەگـەڵ ئەمانـە نیـەو مـادام دژواری لەسـەر عەقیدەکە دروست ناکـەن.. یـان کـەس لـە ئیسـلامەوە بـۆ جاهیلییـەت پاشـگەز ناکەنەوە.. لەبەر ئەم هۆیانـە موسـڵمان دەتوانـێ ئـەو زانسـتییانە لـە موسـڵمانو ناموسڵمانەوە وەربگرێ!

ئەمما ئەوەی پەیوەندی بەلێکدانەوەی چالاکی یە مرۆڤی یەکانەوە هەبێ — چ تـاك بـێو چ کـۆ — ئـەوەی پەیوەنـدی بـە لێکدانـەوەی (دەرون)و (بزوتنـەوەی مێـژووی مرۆڤـ)وە هەبێ یان پەیوەندی بە لێکدانەوەی پێکهاتنی ئەم بوونەوەرو دامەزرانـدنی ژیانو، دروست بوونی مرۆڤـ — لەلایەن میتـافیزیکی پشـت سروشـتەوە (واتـە لـەو لایەنانەی پەیوەنـدیان بـە زانسـتییە ڕووتەکانـەوە وەك کیمیـاو پزیشـکییەوە نیـە) هەریەك لەمانە، وەك سیسـتمی یاسـاییو بیروبـاوەڕو ئـەو بناغانـە وان کـە ژیـانو چالاکییەکانی مرۆڤی لەسەر دادەمەزرێ. هـەردوکیان پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوخۆیان بەعەقیدەوە هەیە. بۆیە موسڵمان بۆی نیە لە یەکێکی تری غەیری ئەو موسـڵمانەوە وەربگرێ کە خۆی متمانە بە دینو خواناسییەکەیان دەکات، کە دەزانێ ئەو کەسـانە هەموو شتێکیان خواویستییە ئەمەش گرنگە چونکە دەبێ ببێتە هەسـتو سـۆزێكو بە عەقیدەی موسڵمانەوە بلکێو، بزانێ کە ئەمەیە پەرستنی تەواو بۆ خـوای تـاكو تەنهاو ئەمەشە ناوەڕۆکی (لا اله الا الله محمد رسول الله).

لەوانەیە موسڵمانێك تەماشـای هـەموو شـوێنەوارێکی چـالاکییە جاهیلییـەکان بکاتو شارەزای ببێت، بەڵام نەك بۆ ئەوەی خۆی پێدروست بکـات، یـان کاروبـاری خۆی پێهەڵبسوڕێنێ، بەڵکو بۆ ئەوەی بزانێ ئەم جاهیلییەتە تا چ ڕادەیەك لە حـەق لایداوەو، تا فێرببێ چۆن ئەم لەحـەق لادانـەی مرۆڤایـەتی ڕاسـت دەکاتـەوەو چـۆن دەتوانێ بیگێڕێتەوە بۆ سەرچاوە ڕاسـتەکانی بنـەمای ئایـدیۆلۆژی ئیسـلامیو، بـۆ حەقیقەتی عەقیدەی ئیسلام.

هەموو ئیتجـاهێکی (فەلسـەفە)و، هـەموو ئیتجـاهێکی (لێکدانـەوەی مێـژوی مرۆڤ)و هەموو ئیتجاهێکی (دەروونناسی) — جگـە لـەو تێبینیانـەی لـە لێکدانـەوە گشـتییەکانەوە وەرنـەگیراون — هـەموو لێکدانەوەیـەکی (خووڕەوشـت)، هـەموو ئیتجـاهێکی لێکۆڵینـەوەی (جیـاوازی نێـوان دیینـەکان)و، هـەموو ئیتجـاهێکی

﴿لێكدانــەوەو ڕێــڕەو (مــذهب)ە كۆمەڵایــەتی یــەكان﴾ — جگــە لەســەر ژمــاردنو زانســتییە ڕاســتەوخۆو، شــتە بینــراوو، ئەنجامــە گشــتییەكانی كــە لــە تەوجیهاتــە سەرەكییەكانەوە وەرگیراون — عەقیدەی جـاهیلی كـاری كردۆتـە سـەر هـەموو ئـەم ئیتجاهانەو لەكۆن ونوێدا هەموویان لە فیكرەی جاهیلی نائیسلامییەوە وەرگـیراونو لەسەر ئایدیۆلۆژییەكی جاهیلی دامەزراون — زۆربەشیان — ئەگەر هەمووشیان نـەبن — لە بناغەی پرۆگرامەكانیانـدا دوژمنداریێتییـەكی ئاشـكرا — یـان نهێنـی — یـان بەرامبەر بە دین بەگشتیو ئایدیۆلۆژی ئیسلامی بەتایبەتی، هەیە.

مەسەلەی ئەم جۆرە چالاكییە فیكریو زانیاری یانـەش! وەك مەسـەلەی كیمیـاو پزیشكیو گەردونناسیو زیندەوەرزانی نیە. چونكە ئەمانە لە سنوری تاقیكردنــەوەی واقیعیو تۆماركردنی ئەنجامی واقیعیدا دەمێننـەوەو سەرناكێشـن بـۆ لێكدانـەوەی فەلسەفی بەهەر شێوەیەكی بێـت. خـۆ ئەگـەر سـەریان كێشـا بـۆ ئـەوە وەكـو لـە داروینیزمــدا هەیــە لــە مەســەلەی ســەلماندنی گــۆڕانیـیە یــەك یــەك لەدواییــەكی زینــدەوەرانو دیراســەكردنیەوە سەردەكێشــێت بــۆ ئــەوەی بڵێــت: پێویســت ناكــات وادابنرێت كە هێزێك هەیە ژیانی دروست كـردووەو، پێشـی خسـتووە (گوایـە ئـەو هێزەش لە دەرەوەی جیهانی سروشتدایە) كە هیچ بەڵگەیەكیشی نیە لەسـەر ئـەوەی دەیلێێت، مەگەر هەواو هەوەسی خۆی.

موسـڵمان ئەوەنـدەی بەسـە كـە لـە خـوا ڕاسـتگۆكەی خۆیـەوە ئـەو هـەموو ڕوونكردنەوانەی دەربارەی ئەمانە بۆ هاتووە.. ئەوەندەشی بەسە كە ئاستی هەوڵدانـە لاوازەكەی مرۆڤـ لەم بوارانەدا دەبینێت.. چ جای ئەوەی كـە مەسـەلەكە پەیوەنـدی ڕاستەوخۆی بەعەقیدەو بەپەرستنی خوای تاكو تەنهاوە هەیە.

❊ ❊ ❊

ووتەی (ڕۆشنبیری كەلەپوری مرۆڤایەتییە) كە نـە نیشـتمان وە نـە ڕەگـەزو نـە ئاینێكی تایبەتی هەیە.. ووتەیەكی ڕاستو بەجێیە ئەگـەر بـۆ زانیارییـە ڕووتـەكان

بەکارهات، بەڵام ئەگەر لەوەوە تێپەڕبێ بۆ لێکدانەوەی ئەنجامی زانستییەکانو بکرێتە جۆرێکی فەلسەفی میتافیزیکیانە، یان ببێ بە لێکدانەوەیەکی فەلسەفی دەربارەی مرۆڤ و چالاکیو مێژووی مرۆڤ، یان ببێ بە هونەرو ئەدەبو هەموو دەربڕینەکانی تری هەستو سۆز، ئەمە دژوارییەکی گەورەیەو ڕەفز دەکرێت چونکە لەپشت ئەو ووتەیەوە، تەڵەیەکی جوولەکەی جیهانی دانراوە کە دەیەوێ هەموو بەربەستێك بڕوخێنێ — یەکێك لەو بەربەستانەش بگرە یەکەمینیان بەربەستی عەقیدەو بیروباوەڕی خوای یە — تا بتوانێ بچێتە ناو لەشە خاوو مەستەکەی جیهانەوە پاشان بکەوێتە بەکارهێنانی چالاکییە شەیتانیەکانی خۆی لەپێش هەمووشیانەوە چالاکییە سوودکارەکانیان — النشاط الربوي —و هەموو ڕەنجی مرۆڤایەتی بخەنەدەست خاوەن دەزگاو پڕۆژە سامانیە سوودخۆرەکانی جوولەکەوە.

بەڵام ئیسلام جگە لە زانیارییە ڕووتەکانو تطبیق کردنیان دووجۆر ڕۆشنبیری دەناسێ: رۆشنبیری ئیسلامی کە لەسەر بناغەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامی دروست دەبێ. وە رۆشنبیری جاهیلی کە لەسەر گەلێك پرۆگرام دروست دەبێ، بەڵام ڕێسای هەموویان یەکە.. ئەویش ڕێسای دانانی فیکری مرۆڤایەتی یە. رۆشنبیری ئیسلامی هەموو بوارێکی چالاکی فیکریو واقیعی مرۆڤ دەگەرێتەوە، کە ڕێساو پرۆگرامو سیفاتی وای تێدایە هەموو کاتێك زامنی چالاکیو زیندوێتییان دەکات.

ئەوەندەش بەسە بزانین کە ئیتجاهی تاقیکردنەوە، کە ئێستا ئەوروپا شارستانێتی خۆی لەسەر دامەزراندوە. لەسەرەتاوە لە ئەوروپاوە پەیدانەبوو، بەڵکو لە زانکۆ ئیسلامییەکانی ئەندەلوسو ڕۆژهەڵاتەوە پەیدابووە. کە بناغەکەی لەسەر ئایدیۆلۆژیو تەوجیهاتی ئیسلامی دامەزرابوو کە گەردونو سروشتە واقیعییەکەیو ڕزقو ڕۆزیو کانزاکانی پێ‌لێك دەدایەوە، پاشان ڕاپەڕینی زانستی ئەوروپا ئەم پرۆگرامەی بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە وەرگرتو، بەردەوام نەشونمای پێ‌کردو گەشەی پێدا. کەچی لەملاوەش جیهانی ئیسلامی وازی لەو ئیتجاهی تاقیکردنەوەیە هێنا، چونکە بەرەبەرە لە ئیسلام دوور دەکەوتەوە لەولاوەش پێکهاتنی

کۆمەڵگەکەی بەرەو جۆرێکی نائیسلامی دەڕۆیشتو پەلامارو هەڵمەتی جیهانی خاچ پەرستیو زایۆنیزمیشی هاتەسەر. ئینجا ئەوروپا ڕەگی ئەو پڕۆگرامەی لە ڕۆژهەلاّتی موسڵمانەوە وەریگرتبوو، قرتاندی چونکە بە عەقیدەی ئیسلامییەوە بەندبوو. تا بەیەکجاری لە خوا دووری خستەوە. بەتایبەتی لەوکاتەدا کە لەدەست کەنیسە قوتاری دەبوو. ئەو کەنیسەیەی بەناوی خواوە — بەدرۆو دەلەسە — باڵی بەسەر هەموو گەلانی ئەوروپاییدا کێشابوو[1].

بەو جۆرە هەموو بەرهەمی فیکری ئەوروپا — وەکو بەرهەمی فیکری جاهیلی هەموو شوێنوکاتێك — شتێکی تری لێهاتەکایەوە. بەرهەمێك کە هەر لە ڕەگەوە لەگەڵ بنەماکانی ئایدیۆلۆژی ئیسلامیدا جیاوازی هەبێو، لە هەمان کاتیشدا دوژمنداریێتییەکی زۆر سەختو کەللەڕەقانەی لەگەڵ ئایدیۆلۆژی ئیسلامیدا دروست کرد، کە هەموو موسڵمانانی ناچار کرد بگەڕێتەوە سەر بنەمای ئایدیۆلۆژییەکەی خۆیانو، ئەگەر توانیان تەنها لە سەرچاوە خوایی یەکەی خۆیانەوە، وەربگرن، یان لەو موسڵمانەوە وەربگرن کە متمانە بە ئایینو خواناسییەکەی دەکەن.

❊ ❊ ❊

ووتەی ﴿(زانستی) لەخاوەن (زانستی) جیایە﴾.. ئەگەر دەربارەی ئەو زانیاریانە بێ کە پەیوەندیان بە عەقیدەوە هەیەو، کاردەکەنە سەر لێکدانەوەی بوونو ژیانو چالاکییە مرۆڤییەکانو باروزروفی کۆمەڵگەو هەڵسوکەوتیو، خووڕەوشتو نەریتو هەرچییەکی تر کە پەیوەندی بەدەرونی مرۆڤو جموجوڵییەوە هەیە، ئەوە ئیسلام نە ووتەی وای بیستووەو، نە بە گوێشیدا دەچێ.

ئیسلام ڕێگای موسڵمان دەدا کە لە ناموسڵمانەوە، یا لە موسڵمانێکی کەم لە خوا ترسەوە، کیمیا یا سروشتناسی یا گەردونناسی یا پزیشکی یا پیشەسازی یا کشتوکاڵی یا ئیشی کارگێڕیو نووسین.. یا هەرچی زانستییەکی تر هەیە لەوبارەیەوە

---

١) **بڕوانە بەشی** (الفصام النكد) **لە کتێبی** (المستقبل لهذا الدين)ی **نووسەر** .

وەربگرێ، ئەویش لەو کاتانەدا کە موسڵمانێکی لە خوا ترسی چنگ ناکەوێ ئەو زانستییانەی لێوە وەربگرێ — وەکو ئەو واقیعەی ئێستای ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن موسڵمان کە بەهۆی دوورکەوتنەوەیانەوە لە دینو پڕۆگرامو ئایدیۆلۆژی ئیسلامییەوە دووچاری بوون. کە ئەم هەموو زانیاریو شارەزاییو پسپۆرییانەی پێویستە لەو جێنشینێتی پەیداهەبن.

ئیسلام ڕێگا نادا بە موسڵمانێك بناغەی عەقیدەو بنەمای ئایدیۆلۆژی — تەفسیری قورئانو لێکدانەوەی حەدیس ڕەوشتی پێغەمبەرەکەی ﷺ یان پڕۆگرامو مێژوو لێکدانەوەی چالاکییەکانی مرۆڤ، یان ڕێڕەوی کۆمەڵگەی، یان سیستمی حوکمی، یان پڕۆگرامی سیاسەتی، یان ئیلهامی هونەرو ئەدەبو دەربڕینەکانی.. هتد لە سەرچاوەیەکی غەیری سەرچاوەی ئیسلامییەوە وەربگرێ، بەڵکو ناهێڵێ موسڵمان ئەمانەش لە غەیری موسڵمانێکی لەخواترسەوە وەربگرێ، کە خۆی متمانە بەدینو خواناسینەکەی دەکات کە لە هەموو کاتێکدا ئەمانە سیمایانو دەدرەوشێنەوە..

ئەوەی ئێستا وائەم چەند دێرانە دەنووسێ مرۆڤێکەو ماوەی چل ساڵی ڕەبەق دەیخوێندەوە، ئیشی ئەوەڵو ئەخیری خوێندنەوەی زۆربەی بوارەکانی زانیاری مرۆڤایەتی بووە .. کە نە پسپۆڕی (تخصص)ی خۆی بوو، وە نە ئارەزووشی وابوو. پاش ئەو ماوە زۆرە کە گەڕایەوە سەر سەرچاوەی ئایدیۆلۆژیو عەقیدەکەی خۆی، دەبینێ وا هەرچی ئەو خوێندویەتییەوە شتێکی زۆر زۆر کەمە لەچاو ئەو سەرمایە زۆرەی لە ئایدیۆلۆژییەکەیدا هەیە — دەشبوو وابێ — لەوەش پەشیمان نیە کە ماوەی چل ساڵی تەمەنی وا سەرف کردووە. چونکە حەقیقەتی جاهیلییەتی ناسیو، چاوی بە کەموکورتیو لە حەق لادانو گرنگی جاهیلییەت کەوت.. هەروەها هەڕاڵیو پاڵاتەو خۆ فش کردنەوەی جاهیلییەتی بۆ ڕوون بووەوە!!! زانیو بە تەواوی دڵنیا بوو کە مومکین نیە موسڵمان بتوانێ ئەو دوو سەرچاوەیە لێکبداو لێیانەوە وەربگرێ!!! .

لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ ئەوەی لەو بەندەی سەرەوەدا ووتم ڕایەکی شەخسی خۆم بووبێ‌و بیخەمە ڕوو.. چونکە مەسەلەکە زۆر زۆر گەورەترە لەوەی ڕای لەسەر بدرێ زۆر زۆر لە تەرازووی خواییدا لەوە قورسترو دژوارترە کە موسڵمان ئیعتماد بکاتە سەر ڕای خۆی بەڵکو ئەوە فەرمایشتی خوای پەروەردگارو، پێغەمبەرە نازدارەکەیەتی ﷺ وا لەو مەسەلەیەدا حوکمی پێ دەکەین‌و دەگەڕێینەوە سەر فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکە ﷺ وەك کە دەبێ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، هەرکاتێك کە ناکۆکی‌و جیاوازیان لە شتێکدا هاتەڕێ بگەڕێنەوە بۆ حوکمی ئەو دوو سەرچاوەیە:

خوای گەورە کۆتا ئامانج‌و هیواو ئاواتی جولەکە مەسیحییەکان بە شێوەیەکی گشتی بەرامبەر بە موسڵمانەکان دەخاتەڕوو، دەفەرموێ:

**(وَدكَثير مِنْ أهلِ الكِتاب لَو يَردونَكم مِنْ بَعدِ إيمانكُمْ كُفارا" حَسدا" مِنْ عِند أنفُسِهم مِنْ بَعدِ ما تَبَينَ لَهُم الحَق فَاعفوا واصفَحوا حَتى يَأتي الله بِأمرهِ إن الله عَلى كُل شَيء قَدير)** (البقرة– ١٠٩).

واتە: زۆر کەس لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان پاش ئەوەی کە ڕاستیان بۆ ئاشکرابوو - هەر لەبەر حەسوودی‌و ڕق وکینەی خۆیان — دەیانوویست پاش باوەڕهێنانتان بتانگێڕنەوە سەر کوفرو بتانکەنەوە بەکافر. بەڵام قەیدی نیە لێیان خۆش بن ولێیان ببورن تا خوا فەرمانی خۆی دەنێرێ، خۆ خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

**(وَلَنْ تَرضى عَنكَ اليَهود وَلا النّصارى حَتى تَتَّبِعْ مِلَّتهمْ قُلْ إنَّ هُدى الله هوَ الهُدى وَلئن اتبَعتَ أهواءَهُم بَعدَ الذى جاءَك مِنْ العِلْم مالك مِنْ الله مِنْ وَلي وَلا نَصير)** (البقرة–١٢٠)

واتە: هەتا هەتایە نە جوولەکەو، نە مەسیحی لێت ڕازی نابن تا شوێن میللەتی ئەوان نەکەوی. بەڵام تۆ پێیان بڵێ: ڕێنمایی خوا ڕێنمایی یە. ئەگەر تۆ شوێن هەواو هەوەسی ئەوان بکەویت — دوای ئەوەی هەموو زانستییەکت بۆ هاتووە هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانێکت لەلای خوا نامێنێ.

**(یا أیّها الذّینَ آمَنوا إن تَطیعوا فَریقا" مِن الذّینَ أوتوا الکِتاب یَردّوکُم بَعد إیمانکُم کافرینْ)** (آل عمران- ١٠٠).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوێڕایەڵی دەستەیەك لەوانە بکەن کە زوو کتێبی ئاسمانیان بۆ هاتووە، پاش ئەوەی باوەڕتان هێناوە دەتانکەنەوە بە کافر ابو یعلی لە حمادەوە ئەویش لە جابرەوە – خوا لێیان ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لا تَسألوا أهل الکِتاب عَن شَيء . فَأنهم لَن یَهدوکم وَقَد ضَلّوا. وَانکُم امّا أَن تَصدقوا بِباطِل، وامّا أَن تَکذِبوا بِحَق، وإنّه واللە لَو کانَ موسی حَیّاً بَین أظهرکُم ماحَلّ لَه، الاّ أَن یَتبعني))**.

واتە: هیچ شتێك لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان مەپرسن. چونکە ئەوان خۆیان گومڕابوون هەتا هەتایە ناتوانن ڕێنمایی ئێوە بکەن. کە ئێوە پرسیاریان لێدەکەن: یا ئەوەیە ناحەقێك بەڕاست دەزانن، یان ئەوەیە ڕاستێك بە درۆ دادەنێن. سوێند بێ بە گەورەیی خوا، ئەگەر موسی زیندووو، لەنێو ئێوەدا بووایە، بۆی نەدەبوو ئیلا دەبوو شوێن من بکەوێ.

کاتێك خوای گەورە ئامانجو هیواو ئاواتی جوولەکەو مەسیحی دەربارەی موسڵمان بەو شێوە بنەبڕە (القاطع) پیشان دەدات، گەمژەێتییە ئەگەر ساتێك واگومان بکرێت کە ئەوانە وویستێکی پاکیان بووە -و هەیە – لەو باسانەدا کە دەیکەن دەربارەی هەرچی شتێك پەیوەندی بەعەقیدەی ئیسلامییەوە، یان بە مێژووی ئیسلامییەوە هەبێ، یان لەوەدا کە تەوجیهی سیستمی کۆمەڵگەی موسڵمان بکەن، یا لە سیاسەتو ئابوری موسڵماندا، ڕاستگۆن. یان گوایە مەبەستیان خێرخوازیو ڕێنماییو ڕێپیشاندانی موسڵمانان بێ.. ئەو کەسانەی واگومان دەکەن – دوای ئەوەی خوای گەورە بڕیاری خۆی لەسەر دەرکردن – ئەو کەسانە زۆر گێلو گەوجو گەلحۆو گەوێڵن!!

هەروەها کە خوا دەفەرموێ : **(قُلْ إنَّ هُدی اللە هوَ الهُدی** – بڵێ : تەنها ڕێنمایی خوا، ڕێنمایی یە -) ئەو سەرچاوە تەنهایە دیاری دەکات کە پێویستە موسڵمان بگەرێتەوە سەری لە هەموو کاروبارێکدا – دوای ڕێنمایی خواش غەیری

گومڕاییو سەرگەردانی نەبێ، هیچی تر نیە. ڕێنماییش لای خوا نەبێ، لای کەسی ترەوە نایەت. ئەو شێوازە کورتەی کە ئایەتەکەش هێناویێتییەوە (**قُلْ إنَّ هُدى الله هوَ الهُدى**) هەر ئەوە دەبەخشێو، بواری گومان لە ناوەڕۆکی ئەم دەقە قورئانیەدا نیەو لێکدانەوەی ماناکەشی جۆرێکی تری نیە.

هەروەها خوای گەورە بە شێوەیەکی بنەبڕ داوای ئەوە دەکات کە پشت لەو کەسانە بکرێ کە گوێیان بە یادو زیکری خوا نەداوەو هەموو بایەخێکیان بە ژیانی دونیایان داوە. چونکە ئەوانە هیچ نازانن‌و، لەسەر گومان دەژین. موسڵمانیش نابێ شوێن گومان بکەوێ مادام ئەو کەسە تەنها دەربارەی شتە ئاشکراکانی ژیانی دونیا دەزانێ، ئەوە زانستییەکی ڕاستی نیە.

**(فأعرَض عَنْ مَنْ تَولى عَن ذِكرنا وَلَمَ يَرد إلا الحَياة الدنيا، ذلكَ مَبلغهُم مِن العِلم إن رَبكَ هوَ أعلَم بِمَنْ ضَل عَنْ سَبيلهِ وهوَ أعلَم بِمَن اهتَدى)**(النجم: ٢٩–٣٠)

واتە: گوێ مەدە بەو کەسانەی پشتیان لەیادو زیکری خوا کردووە. کە ژیانی دونیا نەبێ هیچی تریان ناوێ . ئەوانە هەر ئەوەندەیان زانستی پێیە. خۆ خوای تۆ دەزانێ کێ لەڕێبازەکەی لایداوەو گومڕابووە کێ ڕێنمایی وەرگرتووە.

**( يَعلَمون ظاهرا" مِن الحياة الدّنيا وَهُم عَن الآخِرة هُمْ غافلونْ) (الروم– ٧)**

واتە: تەنها ڕواڵەتە ئاشکراکەی ژیانی دونیا دەزانن‌و، ئاگایان لە ڕۆژی دوایی نیە.

ئەو کەسەش کە لەیادو زیکری خوا بێ ئاگابێ جگە لە ژیانی دونیا هیچی تری نەوێ — وەکو (زانا)کانی ئەمڕۆ — کە ئەم ڕواڵەتە ئاشکرایانەی دونیا نەبێ هیچی تر نازانن ئەمەش ئەو (زانستی)یە نیە کە موسڵمان متمانە بە خاوەنەکەی بکاتو، هەموو شتێکی لێوە وەربگرێ، بەڵکو تەنها ئەوەندە دەتوانێت لە سنوری زانستی ماددە رووتەکەدا وەربگرێت. نەك تەفسیرو لێکدانەوەی ژیانی گشتیو، دەرون‌و ئایدیۆلۆژی. هەروەها ئەمە ئەو زانستییە نیە کە ئایەتەکانی قورئان باسی دەکەن‌و، ستایشیان بۆدەکەن وەك ئایەتی:

(قُلْ هَل يَستوي الذينَ يَعلمون والذينَ لا يَعلَمون) (الزمر-٩)

واتە: بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی دەزانن وەك ئەوانە وان کە دەزانن؟ ئەوە ئەو زانستییە نیە کە خوا بە ئایەت ستایشی بکات، وەك کە هەندێ کەس لەوانەی دەقە قورئانیەکان ڕادەکێشن بۆ غەیری جێگەی خۆیو بۆ بەڵگەی قسەکانیان دەیهێننەوە!

ئەم پرسیارەش لە باسێکی خواپەرستیدا هاتووە.. لە ئایەتێکدا هاتووە، کە ئەمە تەواوی دەقەکەیەتی:

(أمْ من هوَ قانت آناء الليل ساجِدا" وَقائما" يحذِر الآخِرة ويَرجو رَحمة ربّهِ قُل هَل يَستوي الذينَ يَعلَمون والذينَ لا يَعلَمون إنَّما يَتَذكر أولو الألباب)(الزمر-٩)

واتە: ئەو کەسەی گوێڕایەڵی فەرمانی خوادەکاتو شەوو ڕۆژ ئیسلامەکەی خوا ڕادەپەرێنێو، کڕنووشی بۆ خوا دەباتو، شەو نوێژ دەکاتو بەڕۆژ خەریکی

تطبیقکردنی ئیسلامەو، مەبەستی خوایە، لە سزاو ئازاری ئەو دنیای خوا دەترسیو دەیەوێ ڕەحمەتی خوای بەسەردا برژێو، لێخۆشبوونی ئەوی دەستبکەوێ. بۆ ئەوە چاکترە یان ئەوەی هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدات؟ مومکین نیە ئەو کەسانەی زانانو هەست بەو پرۆگرامە دەکەن کە خوا بۆ ژیانی داناوە، لەگەڵ ئەو کەسانەی هیچ نازاننو نەفامن، چوون یەك بن؟ ئەمەش ئەو کەسانە هەستی پێدەکەن کە بەفامو ژیرن.

بەڵێ ئەو کەسەی وا ملکەچی خوایەو، شەونخونی دەکێشێ، کڕنووش دەباتو بەپێوە دەبێ، مەبەستی ڕۆژی دوایی یە، بەو هیوایەی ڕەحمەتی خوای بەسەردا برژێ .. ئا ئەو کەسە، ئەوەیە کە زانستی هەیەو شت دەزانێ .. زانستییەکەی ئەو، ئەو زانستی یەیە، کە ئەو ئایەتە باسی دەکات.. ئەو زانستییەی ڕێنمایی بەرەو لای خوادەکات .. نەك ئەو زانستییەی سروشتو فیطرەی مرۆڤ پیسی دەکاتو، وایان لێدەکات باوەڕیان بەخوا نەمێنێ!

زانستی وەنەبێ تەنها زانستی عەقیدەو فەرزە ئایینیەکانو حوکمە شەرعییەکان بێ، بەڵکو زانستی دەربارەی هەموو شتێك.. ئەو زانستییەی دەربارەی ئەو یاسا گەردوونییانەو چۆنێتی بەکارهێنانیان بۆ هێنانەدی جێنشینێتی خوا لەسەر زەوی، ئەو

زانستییە هەموو ئەمانە دەگرێتەوە، وەك كە عەقیدەو فەرزەكانو حوكمە شەرعییەكانیش دەگرێتەوە.. بەڵام ئەوەی تریان ئەو زانستییە نیە كە خوا لە قورئاندا باسی كردوەو ستایشی خاوەنەكانی كردووە، مادام ڕەگی باوەڕهێنانی بە خوا ووشك كردووە.. چونكە پەیوەستییەكی مەحكەم هەیە لەنێوان ڕێساكانی باوەڕو زانستی گەردووناسیو زیندەوەرزانیو سروشتناسیو كیمیاو زەوی ناسی (جیۆلۆجی)و.. هەموو زانستییەكانیتر هەموویان هەر مرۆڤ دەگەیەنن بەخوا بەو مەرجەی بە هەواو هەوەس بەكارنەهێنرێن بۆ دوور لە خوایی. وەكو كە پڕۆگرامی ئەوروپایی یەكان كە – بەداخەوە – لە ڕاپەڕینی زانستیدا بەكاریان هێنا بەتایبەتی سەرەنجامی ئەو ناكۆكیو تێكچڕژانە خراپەی لە مێژوی ئەوروپادا لەنێوان زاناكانو كلێسەدا ڕوویدا كە كارتێكردنەكەی كەوتە سەر هەموو پڕۆگرامەكانی فیكری ئەوروپاییو شێوازو سروشتی بیركردنەوەیان. كە ئەو خڵتە ژەهراویەیان دروست كرد كە دوژمنداریتی نەك لەگەڵ ئەسڵی بیروباوەڕی كەنیسەو كەنیسە خۆی بكات، بەڵكو لەگەڵ هەموو بیروباوەڕێكی دینیدا بكەن، ئیتر لە هەر بوارێكدا بووایە: لە فەلسەفەی میتافیزیكیدا بووبێ، یان لە لێكۆڵینەوەی زانستییە ڕووتەكان بووبێ – كە لە ڕواڵەتیدا – پەیوەندی بە بابەتی دینەوە نەبوو[1].

كە بڕیار لەسەر ئەوەدرا كە هەموو پڕۆگرامی ئەوروپاو، بەرهەمی فیكری هەموو بوارەكانی زانینن لە سەرەتاوە لەسەر بناغەی ئەو خڵتە ژەهراویانە دامەزراون كە دوژمنداریتی هەموو بناغەیەكی بیروباوەڕی دینی دەكەن، بێگومان دوژمنداریتی ئەو پڕۆگرامو بەرهەمانە زۆر توندو تیژترە بەرامبەر بیروباوەڕی ئیسلامی. ئەویش بەئەنقەست وادەكرێ. گەلێ جار ئەوروپا هەرخۆی – بەپێی نەخشەیەكی داڕێژراو – دەگەڕێ بەدووی پلانێكدا كە عەقیدەو بیروهۆشە ئیسلامییەكانی پێ بشێوێنێو، ئینجا ئەو بناغانە هەڵتەكێنێ كە بنەمای كۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر داڕێژراوە.

لەبەر ئەوە ئەگەر بێئاگایانە، لە لێكۆڵینەوەی ئیسلامیدا ئیعتیماد بكرێتە سەر پرۆگرامی فیكری ڕۆژئاواییو بەرهەمی ئەوروپایی كارێكی زۆر ناپەسەندو

---

١) **بڕوانە بەشی (الفصام النكد) لە كتێبی** : المستقبل لهذا الدين .

گەلحۆیانەیە. لەبەر ئەوەشە کە دەبێ بە حەزەرەوە زانستییە ڕووتەکانیشی لێوە وەرگرین — ئەو زانستییانەی، چارمان نیە هەردەبێ لەو وەختەی ئێستاماندا لە سەرچاوە ڕۆژئاواییی‌یەکانەوە وەری بگرین — دەبێ حەزەر لەو سایە فەلسەفیانە بکەین کە هەنی، چونکە ئەو یاسایانە لە بناغەوە دژی هەموو ئایدیۆلۆژیەکی ئایینین بەگشتی، ئایدیۆلۆژی ئیسلامی بەتایبەتی. هەر تۆزێکیش لەو سایەیە بەسە بۆ ژەهراویکردنی هەموو سەرچاوە ڕوونە ئیسلامییەکانمان.

❊ ❊ ❊

# ڕەگەزنامەو عەقیدەی موسڵمان

ئەو رۆژەی کە ئیسلام هات، وەك چۆن بیروهۆشێکی نوێی هێنایەکایەوە دەربارەی حەقیقەتی نەریتو جۆری هەڵسەنگاندنو، دەربارەی ئەو کەسەی ئەم نەریتو جۆرە هەڵسەنگاندنەی لێوە وەردەگرێت، بیروهۆشێکی نوێشی دەربارەی حەقیقەتی پەیوەندیو پەیوەستەکانی کۆمەڵ هێنا..

ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە مرۆڤ بەرەو لای خوا بگێڕێتەوە، ئەم دەسەڵاتدارێتییەش بکات بەتەنها دەسەڵاتدارێتییەك کە وەك بوونو ژیانی خۆی لێوە وەردەگرێت، بە هاونەریتیش هەرلەوەوە وەربگرێت چونکە هەموو پەیوەندیو پەیوەستێکی مرۆڤ هەر بۆ ئەو دەسەڵاتدارێتییە دەگەڕێتەوە، هەروەکو کە لە ئیرادەی ئەویشەوە هاتوونو بۆ ئەویش دەگەڕێنەوە.

ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە تا یەك جۆرە پەیوەستی بچەسپێنێ .. یەك جۆر پەیوەستی .. ئەویش ئەوەیە کە خەڵکی لەبەر خاتری خوا یەکتریان بوێو بۆ خوا پەیوەندییان پێکەوە ببەسترێ، خۆ ئەگەر ئەو پەیوەستە نەما. ئەوا ئیتر نەهیچ جۆرە پەیوەندییەك دەمێنێو نەخۆشەویستی:

**( لا تَجِد قَوما" يؤمِنون بِالله واليَوم الآخر يوادّون مَن حادّ الله ورَسوله ولَو كانوا آباءَهم أو أبناءَهُم أو إخوانَهم أو عَشيرتَهم)** (المجادلة- ٢٢)

واتە: کۆمەڵێك نابینیت کە بەڕاستی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هێنابێت، بەڵام سۆزو خۆشەویستیش بۆ یەکێك دەربڕن کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، بائەو کەسە باوکیشیان بێت، یا کوڕیان بێت، یا برایان بێت، یا لە تیرەو هۆزیشیان بێت. خواش تەنها یەك حزبی هەیەو بەس، هەموو حزبو دەستەو کۆمەڵێکی تر هی شەیتانو طاغوتن:

(الّذينَ آمَنوا يُقاتِلون في سَبيلِ الله والـذينَ كَفَروا يقاتِلون في سَبيلِ الطاغوت فَقاتَلوا أولياءَ الشَيطان إنّ كَيد الشَيطان كانَ ضَعيفا")(النساء– ٧٦)

واته: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، لەپێناوی خوادا دەجەنگن، بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕن لەپێناوی (طاغوت)دا دەجەنگن. دەسا ئێوەش — ئەی باوەڕدارەکان— لەگەڵ شوێنکەوتوانی شەیتاندا بجەنگن.. بیانکوژن.. دڵنیاش بن فێڵی شەیتان لاوازە .

تەنها یەك ڕێگای خوا وویستیش هەیە. ئیتر هەموو ڕێگایەکی‌تر بەرەو غەیری خوا وویستی دەچن:

(وأنّ هـذا صِـراطي مُستَقيما" فاتَّبعوه ولا تَتبعوا السُبلَ فَتفرق بِكُم عَن سَبيلهِ)(الأنعام– ١٥٣)

واته: ئەمە ڕێگای ڕاستی منە شوێنی کەون. شوێن توولە ڕێگاکانی تر مەکەون کە لە ڕێبازی خوا وویستی لاتان دەدەن.

تەنها سیستمێکیش هەیە سیستمی ئیسلامی بێت غەیری ئەو سیستمە جاهیلییە:

(أَفَحُكم الجاهليّة يَبغون وَمَنْ أحسَن مِن الله حُكماً لِقَوم يوقِنونْ)(المائدة– ٥٠)

واته: ئایا حوکمی جاهیلییەتیان دەوێ؟ بۆچی حوکمی کەس هەیە لە حوکمی خوا چاکتر بێت بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە؟ تەنها شەریعەتێکیش هەیە، شەریعەتی خوایی بێ، غەیری ئەویش هەواو هەوەس پەرستییە !

(ثم جَعَلناكَ عَلى شَريعة مِن الأمر فاتبعها وَلا تَتبِع أهواءَ الذينَ لا يَعلَمون). (الجاثية– ١٨).

واته: پاشان تۆمان خستەسەر شەریعەتێکی ڕێك وجوان، تۆش شوێنی‌کەوە، شوێن هەواو هەوەسی ئەوکەسانە مەکەوە کە لەڕاستی بێ ئاگان‌و نەزانن..

تەنها یەك حەقیش هەیەو بەس، غەیری ئەویش گومڕایی‌و سەرگەردانیە.

(فماذا بَعد الحَق إلا الضَلال؟ فأنى تصرفونْ؟) (يونس– ٣٢)

له حـەق بگەڕێتـەوە چیتـر هەیـە غـەیری گـومڕایی؟ ئیـدی بۆچـی لـەڕێبازی حەقخوازی لادەدەن؟

تەنها وولاتیش (دار اسلام)ە .. ئەو وولاتـەی کـە سیسـتمی ئیسـلامی حـوکمی دەکاتو تەنها شەریعەتەکەی خوا تێیدا دەسـەلاتدارەو، سـزا ئیسـلامییەکانی تێـدا ڕادەپەڕێنرێو موسڵمانەکان هەنـدێکیان دەبنـە سـەر پەرشـتیاری هەنـدێکیتریان.. غـەیری ئەم وولاتەش (دار الحرب)ە، پەیوەنـدی موسـڵمان لەگـەڵ (دار حـرب)دا یـان شەڕکردنە لەگەڵی، یـان پـەیمان بەسـتنە. بـەڵام هەرچـۆنێك بێـت بـە (دار اسـلام) ناژمێرریو لەنێوان دانیشتوانی وولاتی (دار الحرب)و موسڵماندا (وەلاء) نامێنێ.

**(إن الذينَ آمَنوا وَهاجَروا وَجاهَدوا بِأموالِهم وأنفسِهم في سَبيلِ الله والذينَ آووا ونَصروا أولئكَ بَعضهُم أولياءَ بَعض والذينَ آمَنوا وَلَم يهاجروا مالكُم مِن ولايَتهم مِن شَيء حَتى يُهاجروا وإن استَنصَروكُم في الدّينِ فعَلَيكُم النَّصر إلا عَلى قَوم بَينكُم وبَينَهُم ميثاق والله بِما تَعمَلون بَصير، والذينَ كَفَروا بَعضَهُم أولياءَ بَعض إلا تَفعَلوه تَكن فِتنة في الأرضِ وفَساد كَبير. والذينَ آمَنوا وهاجَروا وجاهَدوا في سَبيل الله والذينَ آووا ونَصَروا أولئكَ هم المؤمِنون حَقا" لَهم مَغفِرة وَرِزق كَريم، والذينَ آمَنوا مِن بَعد وهاجروا وجاهَدوا مَعكُم فأولئكَ مِنكُم ...)**(الأنفال: ٧٢-٧٥)

واتە: ئەوانەی بەڕاستی باوەڕیان هێناو کۆچیان کردو جیهادیـان لـەپێناوی خـوادا کرد بەماڵو گیانیان، هەروەها ئەوانەش کە بوونە پشتیوانو لایەنگیرو یارمەتیـدەری کۆچکەرەکان، هەردوولایان پێکەوە کۆمەڵێك پێکدێننو لەنێو خۆیاندا دەبنـە یـەك. ئەوانەش کە باوەڕیان هێنـاوەو کۆچـیان نـەکردووە هـەقتان نـەبێ بەسـەریانەوە تـا ئەوانیش کۆچ دەکەنو دێنە ڕیزتانەوە. بەڵام ئەگـەر داوای یارمـەتییان لێکـردن بـۆ سەرخستنی دینەکە، پێویستە یارمەتییان بدەن — تـەنها لـەو کاتانـەدا نـەبێت کـە داواکەیان دژی تیرەیەك بێت کە ئێوە پەیمانتان لەگەڵیـدا بەسـتبێ، ئەوکاتـە مەچـن بەدەنگیانەوەو داواکەیان بەجێ‌مـەهێننو پەیمانەکـە مەشـکێنن — خـوای گـەورەش تەواو ئاگادارە بەسەر ئـەو کردەوانـەدا کـە دەیکـەن بـێ باوەڕەکـانیش هەنـدێکیان یارمەتیدەری هەندێکی تریانن. ئەگەر ئێوەش — لەنێو خۆتاندا — کۆمەکی یـەکتری

نەکەنو پێکەوە یەك نەبن، خراپەو تاوانێکی زۆر لـە زەویـدا پەیـدادەبێت. ئەوانـەی باوەڕی پتەویان هەبووو، کۆچیان کردو جیهادیـان لـەپێناوی خـوادا کـرد، بەڕاسـتی ئەوانەن موسڵمانی ڕاستەقینە خوا لێیان خۆش دەبێـتو ڕزقو ڕۆزییـەکی زۆریشـیان پێدەبەخشێت. هەروەها ئەوانەش کە دوای ئـەمان باوەڕیـان هێنـاو کۆچـیان کـردو جیهادیشیان کرد، ئەمانەش لـەڕیزی ئێـوەنو ئـەو مافـەی ئێـوە هەتانـە ئـەوانیش هەیانە..

ئیسلام ئا بەم ڕوونیو ئاشکرایی یە تەواوەوە، ئا بەم حوکمە بنەبڕەوە هات .. بۆ ئەوە هات تا مرۆڤـ بەرز بکاتەوەو لە پەیوەستی خاكو قوڕو گۆشتو خوێن (کە هەر لە پەیوەستی خاكو قوڕن) ڕزگاری بکات — موسـڵمان نیشـتمانی نیـە، جگـە لـەو وولاتەی شەریعەتەکەی خوا حوکمی دەکات.. ئەوجا پەیوەندی نێوان دانیشتوانی ئەو وولاتەو موسڵمان لەسەر بناغەی پەیوەستی خواویستی دروست دەبێـت.. هـەروەها موسڵمان ڕەگەزنامەی نیە. چونکە تەنها عەقیدەکەی ڕەگەزنامەیـەتی، کـە ئـەویش وای لـێدەکات ببێتە ئەندامێك لە (نەتەوەی ئیسلامی) کە لە (دار اسـلام)دا دەژی. هەروەها موسڵمان خزمایەتی نیە، تەنها ئەوە نەبێت کە لەسـەر بناغـەی عەقیـدەی خواویسـتی دادەمـەزرێ.. چـونکە پەیوەسـتی خزمایـەتی دەبـی لەسـەر بناغـەی خواویستی ڕیشە داکوتێ.

خزمایەتی موسڵمان بریتی نیـە لـە خزمایـەتی دایـكو بـاوكو ژنو عەشـیرەتو تایەفە مەگەر لەسەر پەیوەندی خواویستی دامەزرابێ:

**(يا أيّها الناس اتَّقوا رَبَكُم الذي خَلَقكُم مِن نَفس واحِدة وخَلق مِنها زَوجهـا وبَـث مِنهمـا رِجـالا" كَثـيرا" ونِسـاء واتَّقـوا الله الـذي تَسـاءلون بـهِ والأرحام)**(النساء– ١)

واتە: ئەی خەڵکینە لەو خوایە بترسن کـە هـەمووتانی لـە یـەك کـەس دروسـت کردووەو، لەویشەوە خێزانەکەی دروست کردووە، (ئادەمو حـەووا)، لەوانیشـەوە ژنو پیاوی زۆری تری دروست کردووەو بەسەر زەمیندا بلاوی کردنەوە. لەو خوایـە بترسـن کە یەکتری پێ سوێند دەدەنو، ئاگاتان لە خزمایەتیشتیان بێت ..

ئەم ڕێسایە ڕێگای ئەوە ناگرێت كە هەڵس‌وكەوتی ژیان لەگەڵ دایك‌و باوكدا هەر بە شێوەیەكی ڕاست‌و چاك بكرێت، ئەگەرچی جیاوازیشیان لە عەقیدەدا هەبێت بەڵام بەو مەرجەی ئەو دایك‌و باوكە نەچنە ڕیزی بەرەیەك كە دژ بە ئیسلام وەستابێت .. چونكە ئەوكاتە ئیتر نە پەیوەندی دەمێنێ‌و نە هەڵس‌وكەوت لەگەڵیاندا.. عبداللەی كوڕی عبداللەی كوڕی ئوبەی نموونەیەكی ئاشكراو جوانمان بۆ دێنێتەوە.

ئیبن جریر دەگێڕێتەوە لە ئیبن زیادەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ عبداللەی كوڕی عبداللەی كوڕی ئوبەی بانگ كردو پێی فەرموو: ئاگات لێیە باوكت چی دەڵێ؟

ووتی: دایك‌و باوكم بەقوربانت بن دەڵێ دەچی؟

فەرمووی: دەڵێ: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە دەبێ خاوەن عززەتەكان زەلیلەكان دەركەن.

ووتی: جا ڕاست دەكات. بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا تۆو خوا خاوەن عززەتن‌و ئەو زەلیلە، بە گەورەیی خوا سا ئەی پێغەمبەر گەرچی ئەوكاتەی جەنابت تەشریفتان هێنا بۆ مەدینە هەموو خەڵكی یەثرب دەیزانی كە هیچ كەسێكی یەثریبی نەبووە بەقەدەر من دایك‌و باوكی خۆشویستبێ، بەڵام ئێستا ئەگەر خواو پێغەمبەری خوا ڕازی بن سەری هەردووكیان دێنمە بەردەستت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (نا) كاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە عبداللەی كوڕی عبدالله ی كوڕی ئوبەی لەبەر دەرگای مەدینە وەستاو شمشێرەكەی دەرهێناو باوكی گرت‌و ووتی: تۆ ووتوتە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە دەبێ خاوەن عززەتەكان زەلیلەكان دەركەن؟! بەخوای گەورە سا ئێستا پێت دەڵێم كە عززەت بۆ پێغەمبەر ﷺ یا بۆ تۆیە بەگەورەیی خوا ئالێرەدا ڕات دەگرم‌و ناهێڵم بچیتە ژێر سێبەرێكی مەدینە تا خواو پێغەمبەر ﷺ مۆڵەت نەدەن.

باوكی هاواری كرد: ئەی هاوار هۆزی خەزرەج: كوڕەكەی خۆم ناهێڵێ بچمەوەماڵی خۆم: ئەی هاوار هۆزی خەزرەج كوڕەكەم ناهێڵێ بچمەوە ماڵی خۆم،

کوڕەکەشی هاواری کرد: بەگەورەیی خوا ناهێڵم بچیتە ژێر هیچ سێبەرێکی مەدینە تا خواو پێغەمبەری خوا ڕازی نەبن.

ئەوجا هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێیان ووت ئەویش فەرمووی: بچن بۆلای و پێی بڵێن: (ڕێی بدە با بچێتەوە ماڵی خۆی)، ئینجا هاتنەوە بۆ لای عبداللەو پێیان ووت. ئەویش ووتی: ئێستاکە مادام فەرمانی پێغەمبەر ﷺ هات، بڕۆ قەیناکە..

جا ئەگەر پەیوەستی عەقیدە بەسترا، ئەوا موسڵمانان برای یەکن، با لە ڕووی نەژادو خزمایەتیشەوە یەك نەگرنەوە ( **انما المؤمنون اخوة** ).. بۆ دڵنیابوونیش:

**(إِن الذينَ آمَنوا وهاجَروا وجاهَدوا بِأموالِهم وأنفسهم في سَبيلِ الله والذينَ آووا ونَصَروا أولئكَ بَعضهُم أولياء بَعض)** (الأنفال- ٧٢)

واتە: ئەوانەی بەڕاستی باوەڕیان هێناو کۆچیان کردو جیهادیان بە ماڵو گیانیان لە پێناوی خوادا کرد، هەروەها ئەوانەش کە بوونە پشتیوانو لایەنگیرو یارمەتیدەری کۆچکەرەکان، هەردولایان پێکەوە کۆمەڵ پێکدێنن و لەنێو خۆیاندا دەبنە یەك.

ئەم سەرپەرشتی کردنەش تایبەتی نیە بە نەوەیەکەوە، بەڵکو نەوەکانی تری دواییش دەگرێتەوەو، سەرەتای ئەم نەتەوەیە بە کۆتایی یەکەیەوە دەبەستێ، ئەویش بە پەیوەستێکی خۆشەویستیو سۆزو دڵسۆزیو (ولاء) دەربڕین:

**(والذينَ تَبوَءوا الدار والإيمان مِنْ قَبلهم يحِبون مَن هاجَر إلَيهم ولا يَجدون في صدورهم حاجة مِما أوتوا ويؤثِرون عَلى أنفسهم وَلَو كانَ بِهم خَصاصة ومن يوق شَح نَفسه فَأولئكَ هُم المُفلِحون، والذينَ جاءوا مِنْ بَعدهم يَقولون رَبَنا اغفر لَنا ولإخوانِنا الذينَ سَبَقونا بِالإيمان وَلا تَجعَل في قلوبنا غلا" للذينَ آمَنوا رَبَنا إنكَ رَؤوف رَحيمْ)** (الحشر: ٩-١٠)

واتە: مەدینەیی یەکان کە خاوەن ماڵو دارایی و باوەڕی پتەوبوون ئەو کەسانەیان زۆر خۆشدەویست کە کۆچیان دەکرد بۆلایان، لەمەش دڵگران نەدەبوون کە دەسکەوتو غەنیمەتی جەنگ دەدرا بە کۆچکەرەکان، هەمیشە بەرژەوەندی

ئەوانیشیان دەخستە پێش هی خۆیانەوە گەرچی خۆشیان ئاتاج بوونایە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمان ڕەزیلو ماڵ خۆشەویست نین. ڕزگاربووش ئەو کەسەیە کە خۆی لە بەخیلیو پیسکەیی دەپارێزێت.

❊ ❊ ❊

خوای گەورەش کاروانە پیرۆزەکەی پێغەمبەران دەکاتە نموونە بۆ موسڵمانانی دەهێنێتەوە ئەو پێغەمبەرانەی کە بە لقو پۆپی زەمانەدا هەڵچوون:

**(ونادى نوح رَبَه فَقالَ: رَب إن ابني مِنْ أَهلي وإن وَعدك الحَق وأنتَ أحكَم الحاكمين، قالَ: يا نوح إنّه لَيسَ مِن أهلِك إنه عَمل غَير صالح فَلا تَسألني ما لَيسَ لَكَ بِهِ عِلْم إني أعظُكَ أن تَكونَ مِن الجاهلين، قالَ رَبِ إني أعوذ بِكَ أن أسألكَ ما لَيسَ لي بِه عِلْم والا تَغفر لي وَتَرحمني أكُن مِن الخاسرين)**(هود: ٤٥–٤٧)

واتە : نوح — سەلامی خوای لێبێت — هاواری کردە خوای گەورەو فەرموی: ئەی خوای گەورەو پەروەردگارم ئەم کوڕەم خۆ لە خێزانی منەو پەیمانی تۆش ڕاستەو تۆش دادپەروەرترینیت، (کاتی خۆی خوای گەورە پەیمانیدا بە نوح کە ماڵو خێزانەکەی رزگار بکات لە خنکان) خوای گەورە فەرمووی: ئەی نوح ئەو کوڕە لە خێزانی تۆ نیە، ئەو خۆی کردەوەیەکی ناشرینە. تۆ داوای شتێك مەکە کە ئاگاداری تەواوت لە شەرعێتی بەجێی ئەو شتە نەبێت، ئامۆژگاریت دەکەم کە خۆت نەخەیتە ڕیزی نەفامانەوە، نوح فەرموی: ئەی پەروەردگارم من پەنا بەتۆ دەگرم لەوەی شتێك بکەم کە ئاگاداری نەبم.. پەشیمانمو داوای لێخۆش بوونت لێدەکەم .. ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبیتو بەزەییت پێمدانەیەتەوە، ئەوا دەکەومە ڕیزی ڕەنجەڕۆو زەرەرمەندانەوە.

**(وإذ ابتَلى إبراهيم رَبَّه بِكَلِمات فأتمهن قال إني جاعِلك للناسِ إماماً قالَ ومِنْ ذريتي قالَ لا يَنال عَهدي الظالمين)**(البقرة– ١٢٤)

واتە: خوای گەورە ئیبراهیم پێغەمبەری تاقیکردنەوەو بەچەند ووشەو فەرمانێکی شەرعی، ئەویش بەرێکی بەجێی هێنان پاشان خوای گەورە فەرموی دەتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم فەرموی: ئەدی نەوەکانم؟ خوای گەورە فەرموی: لەلایەن منەوە پیاوخراپو ستەمکاران نابن بە پێشەوا ..

**(وإذ قالَ إبراهيم رَب اجعَل هذا بَلَداً آمِناً وارزق أهلَه مِن الثمَرات مَنْ آمَن مِنهم بالله واليَوم الآخر قالَ ومَنْ كَفَر فَأمتعه قَليلاً ثم أضطَره إلى عَذاب النار وَبِئسَ المَصير)(البقرة- ١٢٦)**

ئیبراهیم فەرموی: ئەی پەروەردگارم، ئەم شارە (شاری مەککە) بکە بە شارێکی هێمنو پڕ ئاسایشو ڕزق ورۆزی دانیشتوانی بدە لە میوەهاتو بەروبوومی تر (هەڵبەت ئەوانەی باوەڕیان بە خواو بە رۆژی دوایی هێناوە) خوای گەورە فەرموی: بەڵام ئەوەی کافربوو وە باوەڕی نەبوو، ماوەیەکی کەم خۆشیو لەزەتی دنیای دەدەمێ، پاشانیش بەرەو سزای دۆزەخ ڕایدەکێشم پاشەرۆژێکی خراپیش دەکەمە نسیب..

کاتێکیش ئیبراهیم باوکو کەسو کاری دەبینێ وا هەر لەسەر گومڕایی بەردەوامن، جێیان دەهێڵێو بڕیاری گۆشەگیریان لێدەدات:

**(وأعتزلكُمْ وَما تَدعون مِنْ دون الله وَأدعو رَبي عَسى ألاّ أكونَ بِدعاءِ رَبي شَّقيا")(مريم- ٤٨)**

واتە: ئیبراهیم فەرموی: لێتان جیادەبمەوەو گۆشەگیر دەبم لەخۆشتانو لەو بتو بەرنامانەش کە ئێوە لەجیاتی خوا بانگەوازیان بۆدەکەن.. من شوێن ڕێگەی خوای خۆم دەکەومو بانگەوازی ئەو بڵاودەکەمەوە.. هیواشم وایە خوا نەمشکێنیو سەرمخات لەم بانگەوازەمدا ..

هەروەها خوا باسی ئیبراهیم دەکاتو بەو سیفەتەی نموونەی جوانی پێشەوایەتییە:

**(قَدْ كانَت لَكُمْ أسوة حَسَنة في إبراهيم والذينَ مَعَه إذ قالوا لِقَومِهم إنا برآء مِنكُم ومِما تَعبدون مِنْ دونِ الله كَفَرنا بِكم وبَدا بَينَنا وبَينكُم العَداوة والبَغضاء أبَدا" حَتى تؤمِنوا بالله وَحده)**(الممتحنة- ٤)

واتە: موسڵمانینە ئێوە بەڕاستی لە ئیبراهیم‌و شوێنكەوتوانیدا سەرمەشق‌و پێشەوایی‌و مامۆستایی چاكتان دەست دەكەوێت، كاتێك كە بە تیرەو هۆزەكەی خۆیان ووت: ئێمە بێبەرین لە خۆشتان‌و لەوەش كە دەیپەرستن، ئەوانە خوا پێیان ڕازی نیە. بۆیە ئێمەش ئێوەمان ناوێت‌و دژایەتی ئاشكرا دەكەین بەرامبەرتان، ڕق‌و قینیش هەر لەنێوانماندا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە، هەتا ئێوە باوەڕدێنن بە خوای تاك‌و تەنها..

هەروەها لاوەكانی (یاوەرانی ئەشكەوت: أصحاب الكهف)یش ئەوەتا واز لە كەس‌وكارو نەتەوەو نیشتمانیان دێنن‌و بەجێیان دەهێڵن، تا دینەكەی خۆیان بپارێزن‌و بەرەو خوا بە عەقیدەكەیانەوە كۆچ بكەن، دوای ئەوەی دڵنیابوون كە جێگایەك نەماوە كە نیشتمان‌و كەس‌وكارو گەل‌و عەشیرەتەكەیاندا پەنایان بدات:

**(إنّهُم فتية آمَنوا بِربِهم وزِدناهم هدى، وَربَطنا عَلى قلوبهم إذ قاموا فَقالوا رَبنا رَب السَّماوات والأرض لَنْ نَدعو مِنْ دونهِ إلهاً لَقدْ قلنا إذا شَطَطاً، هؤلاء قَومنا اتخَذوا مِنْ دونهِ آلهة لَولا يَأتون عَليهم بِسلطان بين فَمَنْ أظلَم ممّن افتَرى عَلى الله كَذِبا" وإذ اعتَزلتموهُم وَما يَعبدون إلاّ الله فأووا إلى الكَهف يَنشر لَكم رَبكُم مِنْ رَحمتهِ وَيهَيئ لَكُم مِنْ أمرِكُم مرفَقاً)**(الكهف: ١٣-١٦)

واتە: یاوەرانی ئەشكەوت كۆمەڵە لاوێك بوون، باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان هێنابوو، ئێمەش زیاتر ڕێنماییمان كردن دڵمان بەهێزتركردن بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕاپەڕین‌و هەستان‌و ووتیان: خوای پەروەردگاری ئێمە ئەوەیە كە خاوەنی ئاسمانەكان‌و زەوی یەو، جگە لەویش بانگەوازی هیچ كەسێكی تر ناكەین‌و شوێن یەكێكی تر ناكەوین، چونكە ئەگەر غەیری ئەمە شتێكی تر بڵێین، یا بڕیاری شتێكی تر بدەین، ئەوە بەهەڵەداچووین‌و ڕێمان لێ تێكچووەو گومڕایین. ئا ئەوە گەلەكەی خۆمانە واشوێن بەرنامەی تری غەیری بەرنامەكەی خوا كەوتوون! ئەگەر ڕاست دەكەن، بۆ

بەڵگە لەسەر ئەوە ناهێننەوە کە دەیپەرستن؟ کێ لەوە تاوانبارترە کە درۆ بەدەم خوای گەورەوە دروست دەکات؟.. مادام ئێوەش لەونەتەوە گومڕایە جیابوونەتەوەو وازتان لەپەرستراوەکانیان هێناوە بڕۆن بۆ ئەشکەوتەکە، خوای گەورەش خۆی ڕەحمو بەزەیی خۆیتان بەسەردا دەڕێژێتو جێو ڕێی گونجاوتان بۆ ئامادە دەکاتو سەریشتان دەخات ..

هەروەها ژنی نوحو ژنی لوط، کاتێك عەقیدەیان لەگەڵ عەقیدەی مێردەکانیاندا جیاوازبوو، لێك جویبوونەوە:

**(ضَربَ الله مَثلاً للذينَ كَفَروا امرأة نوح وامرأة لوط كانَتا تَحت عَبدين مِنْ عِبادنا صالحين فخانَتاهما فَلَم يَغنيا عَنهما مِن الله شَيئاً، وقيل ادخلا النار مَعَ الداخلين)**(التحريم- ١٠)

واتە: خوا نموونەی بۆ بێباوەڕان هێناوەتەوە بە خێزانی نوحو خێزانی لوط، کە هاوسەری دووبەندەی پیاو چاكو صاڵحی ئێمە بوون (کە نوحو لوط بوون) کە

هەردوکیان خیانەتیان لێکردنو باوەڕیان بە پێغەمبەرێتی مێردەکانیان نەهێناو، شوێن ڕێگەی خوایی نەکەوتن. بۆیە ئەوانیش فریایان نەکەوتنو لای خوا نەهاتن بەهانایانەوە تا شەفاعەتیان بۆبکەن.. سەرەنجام پێیان ووترا: هەردوکتان بچنە ناو ئاگرەوە لەگەڵ بێباوەڕاندا ..

**(وَضَرَب الله مثَلاً للذينَ آمَنوا امرأة فِرعَون إذ قالَت رَب ابنِ لي عِندَك بَيتا" في الجَنة ونَجنّي مِنْ فِرعَون وعَمله ونَجنّي مِن القَوم الظالمين)(التحريم- ١١)**

واتە: وەخوا نموونە بۆ خاوەن باوەڕەکان دێنێتەوە بە ژنەکەی فیرعەون، کە نزای کردوو ووتی: خوایە لای خۆت، لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ پێکەوە بنێو، لە فیرعەونو کردەوەکانی ڕزگارم بکەو خوایە لەدەست ئەم نەتەوە ستەمکارە ڕزگارم بکە..

ئا بەم جۆرە خوا نموونەی هەموو جۆرە پەیوەستو پەیوەندی دێنێتەوە .. پەیوەستی باوکێتیو کوڕێتیو وەك چیرۆکی نوح، پەیوەستی کوڕێتیو نیشتمان وەك چیرۆکی ئیبراهیم پەیوەستی خزمایەتیو کەسوکارو گەلو نیشتمان وەك چیرۆکی

یاوەرانی ئەشكەوت، پەیوەستی ژنو مێردایەتی وەك چیرۆكی ژنەكانی نوحو لوط و ژنەكەی فیرعەون.

ئەو كاروانە پیرۆزە هەروا بەردەوام دەبێو بیروهۆشی ڕاستەقینەی خۆی دەربارەی پەیوەندیو پەیوەستییەكان ڕوون دەكاتەوە.. تا نەتەوە مام ناوەندییەكەی لەبەر ڕۆشنایی ئەم تێشووە زۆرەی نموونەو پەندو ئامۆژگاریو تاقیكردنەوانە، پێك دێت.. لەسەر ئەو نەخشەو پرۆگرامە خوایی یە، نەتەوەی موسڵمان دێنێتەكایەوە، جا با لەرێیشیدا هۆزو تیرەش لێك دابڕێن، یان پەیوەندی نێوان ئەندامانی ماڵێك هەڵوەشێتەوە، چونكە جیاوازی عەقیدەیی هەیە لەنێوان ئەندامەكاندا. بۆیە خوا لە سیفەتی موسڵماناندا دەفەرموێ:

**(لا تَجِد قَوما" يؤمِنون بالله واليَوم الآخر يوادون مَنْ حاد الله ورَسوله ولَو كانوا آباءهم أو أبناءهم أو إخوانهم أو عَشيرتهم أولئكَ كتبَ في قلوبهم الإيمان وأيّدهم بِروحٍ مِنه ويَدخِلهم جَنات تَجري مِنْ تَحتِها الأنهار خالدينَ فيها رَضيَ الله عَنهُم ورَضوا عَنه أولِئكَ حِزب الله ألا إن حِزب الله هُم المفلِحون)**(المجادلة- ٢٢)

واتە: كۆمەڵێك نابینیت كە بەڕاستی باوەڕیان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هێنابیو كەچی سۆزو خۆشەویستیش بۆ یەكێك دەربڕن كە دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، با ئەو كەسە باوكیشیان بێت، یا كوڕیان بێت، یا برایان بێت، یا لە تیرەو هۆزیان بێت. ئەوانە خوا باوەڕی لەدڵدا جێگیركردوونو بە فریشتەش لایەنگری كردوون، پاشان دەشیانخاتە بە هەشتێكەوە كە ڕووبار بەژێریدا دەڕواتو ئەمان تێشیدا بە نەمری دەمێننەوە، خوا لەوان ڕازی بووەو ئەوانیش لەم ڕازی بوون، ئا ئەوانەن حزبی خوا.. بەڕاستی حزبی خواش سەركەوتوون ..

كاتێك پەیوەستی خزمایەتی پسا لەنێوان محمد ﷺ وابو لهبی مامیو عەمرۆی كوڕی هشام (ابو جهل)ی ئامۆزای.. كاتێك موسڵمانە كۆچكەرەكان كەسو كارو خزمەكانیان لە جەنگی بەدردا كوشت، ئەوكاتە پەیوەستی عەقیدە بە پتەوی لە نێوان كۆچ كەرەكانو پشتیوانەكاندا دروست بوو.. هەمان پەیوەستیش بووە پێكەوە بەستنی موسڵمانە عەرەبەكان بە براكانی تریان: صوهەیبی ڕۆمیو بیلالی حەبەشیو

سەلمانی فارسی.. ئەو ساتەش هۆزپەرستیو ڕەگەزپەرستیو خاك پەرستی نەما.. پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر ئەو ڕەگەزپەرستییە فەرمووی: ((**دعوها فأنها منتنة** = وازی لێبهێنن (لە ڕەگەزپەرستی) ئەوە بۆگەنیە).. وەپێی فەرموون : ((**ليس منا من دعا الى عصبية، وليس منا من قاتل على عصبية، وليس منا من مات على عصبية**)) واتە: لە ئێمە نیە هەرکەسێك بانگەوازی ڕەگەزپەرستی بکات ئەوە لە ئێمە نیە، هەرکەسێك لەسەر ڕەگەزپەرستی بجەنگێ ئەوە لە ئێمەنیە هەرکەسێك لەسەر ڕەگەزپەرستی بمرێ ئەویش لەئێمە نیە.. بەو شێوەیە مەسەلەی ئەو بۆگەنیە کۆتایی هات.. بۆگەنی تیرەوهۆزپەرستی.. بەو جۆرە دەنگی ڕەگەزپەرستی کپ کرا.. تا تەواو لەو میکرۆبە پیسە ڕزگاربوون.. میکرۆبی پیسی هۆزپەرستی.. ئەو ڕزگاربوونەش بوو مرۆڤایەتی گەیاندە دواپلەی بلندی ئاسۆ.. دور لە بۆگەنی گۆشتو خوێنو.. پیسی خاكو قورپەرستی.. لەو ڕۆژەوە، بڕیاردرا کە نیشتمانی موسڵمان بریتی نیە لە پارچەیەك زەمین، بەڵکو نیشتمانی موسڵمان (دار اسلام)ە.

ئەو وولاتەی کە دەبێتە پەناگەی ئەمو ئەمیش بەرگری لێدەکاتو لەپێناوی بەرفراوان کردنیدا شەهید دەبێ.. ئەم (دار اسلام)ەش وڵاتی هەموو کەسێکە کە خاوەن عەقیدەی ئیسلامی بێت وە بە شەریعەتەکەی خوا ڕازی بێت .. هەروەها وڵاتی هەموو کەسێکی تریشە کە ڕازی بێت بەوەی ئیسلام ڕژێمی بێت — با موسڵمانیش نەبێت — وەك خاوەن ئایینەکانی تر کە لە (دار اسلام)دا دەژین .. ئەو وڵاتەش کە ئیسلام سەرپەرشتی ناکاتو شەریعەتەکەی خوا حوکمی ناکات، کە لە لایەن موسڵمانەوە بە (دار حرب) دەناسرێ هەروەها لەلایەن (ذمی)یشەوە هەروا دەناسرێ. ئەگەر لەدایکبوونیو خزموماڵو سامانی موسڵمان لەوێدابوو دەبێ دژی بوەستیو شەڕی بەرامبەر بەرپا بکات.

محمدیش ﷺ بەو شێوەیە شەڕی دژی مەککە بەرپاکرد، ئەو مەککەیەی تێیدا لەدایك بووبوو و، هۆزو تیرەو کەسوکارو، ماڵو ماڵی یاوەرەکانیو، سامانیان لەوێدابوو، کە بەجێیان هێشتبوون، ئەو مەککە بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتووەکانی هەرنەبوو بە (دار اسلام) تا ئەو ساتەی هەموو مەککە ملکەچی بۆ ئیسلام دەربڕیو شەریعەتەکەی خوای تێدا ڕاپەڕێنرا.

❊ ❊ ❊

ئەمە ئیسلامە.. تەنها ئەمەیە.. ئیسلامەتی قسەیەك نیەو بەسەر زماندابێت، یان وەنەبێ لەدایك بوونێك بێت لە ولاتێکدا کە لافیتەیەکی (ئیسلام)ی لەسەر چەقێنرا بێت، یان نازناوی ئیسلامی بێت، هەروەها وەنەبێت لەدایك بوونێك بێت لە خێزانێکی ئیسلامیدا کە دایكو باوکەکە موسڵمان بووبن:

**( فَلا وَرَبك لا يؤمِنونَ حَتى يَحكموكَ فيما شَجر بَينهم ثم لا يَجِدوا في أَنفسهم حَرجا" مِما قضَيت ويَسلموا تَسليما") (النساء- ٦٥)**

واتە: نا .. وانیە وەك بێباوەڕەکان دەڵێن، سوێندبێ بەخواکەی تۆ باوەڕناهێننو بەخاوەن باوەڕحساب ناکرێن، تا تۆ — و بەرنامەکەی تۆ — نەکەن بەحەکەم لەو شتانەی لەنێوانیاندا ڕوودەدەن .. پاشان هیچ گرێیەك لەدڵ ودەرونیاندا نامێنێ دەربارەی حوکمەکەی تۆ، ئەوجا ملکەچی تەواو دەربڕن.

بەڵێ تەنها ئەوەیە ئیسلام.. تەنها ئەو وولاتەش (دار اسلام)ە.. نەك خاكو ڕەگەزو خزمایەتیو هۆزو تیرەو نەژاد..

ئیسلام خەڵکی لەوە ڕزگارکرد کە بەقوڕەوە بنوسێن، واشی لێکردن کە چاوببڕنە ئاسمان، هەروەها لە کۆتی خوێنو کۆتی ئاژەڵی ڕزگاری کردنو وای لێکردن بەرەو ئاسۆی بڵندی خوا ویستی بەرزببنەوە.

ئەو وولاتەی کە دەبێ موسڵمان سۆزی خۆشەویستی بۆی هەبێو پارێزگاری لێبکات پارچە زەوی یەك نیە، هەروەها ڕەگەزنامەی موسڵمان کە پێی دەناسرێتەوە ڕەگەزنامەی حوکم نیە، هەروەها تیرەو هۆزی موسڵمان کە پەنای دەباتەبەرو بەرگری لێدەکات خزمایەتی خوێن نیە، ئەو ئاڵایەش کە موسڵمان شانازی پێوە دەکاتو لەپێناوی بەرزکردنەوەیدا شەهید دەبێ، ئاڵای نەتەوەیی نیە.. هەروەك لەو سەرکەوتنەی کە موسڵمان چاوی تێدەبڕیو بەهیوای وەدەست هێنانێتیو سوپاسی خوای لەسەر دەکات، زاڵبوونی سوپایی نیە، بەڵکو سەرکەوتن

ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ:

**(إذا جاءَ نَصرُ اللهِ والفَتح، ورأيتَ الناسَ يَدخلونَ في دينِ اللهِ أفواجاً، فَسَّبِح بِحَمدِ رَبكَ واستَغفرَه إنّه كانَ توابا")** (النصر)

واتە: کاتێ سەرکەوتنی خوایی هات وولات هاتە ژێر دەستتانو بینیت خەڵکی وا پۆل پۆل هاتنە ناو ئایینەکەوە، تەسبیحاتی خوای گەورە بکەو داوای لێخۆشبوونی لێبکە. بەڕاستی خوا لێخۆشبووەو تەوبەو گەڕانەوەی بەندە وەردەگرێت.

ئەو سەرکەوتنەش تەنها لەژێر ئالای عەقیدەدا وەدەست دێ، نەك لەژێر ئالای تردا. جیهادیش لەپێناوی خوادا دەبیوبەس. لەپێناوی سەرخستنی دینو شەریعەتەکەی خوادا، نەك لەپێناوی ئامانجی تردا. هەروەها بەرگریکردنیش تەنها لە (دار الاسلام)ە کە ئەو مەرجانەی تێدابێت، نەك بەرگریکردن لە ولاتێکی تر. پاش هەموو ئەمانەش دەبێ تێکۆشان تەنها لەپێناوی خوادا بیو بەس، نە بۆ غەنیمەت، نە بۆ پلەوپایەی دنیایی، وە نە خاكو نەتەوەپەرستن، تەنانەت نە بەرگری کردنیشە لە کەسو کارو منداڵیش، مەگەر بەو ڕادەیەی کە لە ئاژاوەو دیندا خورانیان بپارێزرێن!

لە ئەبوموساوە دەگێڕنەوە —خوا لێی ڕازی بێت— کە وتویەتی: (لە پێغەمبەریان پرسی کابرایەك لەپێناوی ئازایەتیدا دەجەنگێ، یەکێکی تر لەپێناوی نەژاددا دەجەنگێ یەکێکی تر بۆ ڕیا، لەوانە کامیان لەپێناوی خوا دایە؟ فەرمووی: هەر کەسێك بۆ ئەوە بجەنگێت کە ووشەی خوا سەرکەوێت، ئەوە لەپێناوی خوا دایە)..

شەهیدبوونیش تەنها لەو پێناوەدایە، نەك لە جەنگی تردا، یان بۆ مەبەستی تری غەیری بەرزکردنەوەی ووشەی خوا.

لە هەرچی وولاتێکدا، دژی عەقیدەی موسڵمان وەستانو بەرپەچی دینەکەیان دایەوەو شەریعەتەکەی خوایان پیادەنەکردو پەکیان خست، ئەوە (دار الحرب)ە با ئیتر کەسوکارو هۆزو نەتەوەو سامانو بازرگانی موسڵمانیشی تێدابێت.. بە پێچەوانەشەوە هەرچی ولاتێك عەقیدەی موسڵمانی تێدا پارێزراو بیو شەریعەتەکەی

خوا تێدا پیادە بكرێت، ئەوە (دار اسلام)ە با ئیتر كەسو كارو هۆزو نەتەوەو سامانو بازرگانی موسڵمانیشی تێدا نەبێت.

نیشتمان: وڵاتێكە عەقیدەو پڕۆگرامی ژیانو شەریعەتێك حوكمی دەكات كە لەلایەن خواوە داڕێژرابن.. ئەمەشە مانای ئەو نیشتمانەی شیاوی (مرۆڤـ)ە ..

ڕەگەزنامەش: عەقیدەو پڕۆگرامی ژیانە. تەنها ئەمەشە ئەو پەیوەستەی شیاوی (مرۆڤـ)ە.

دەمارگیری تیرەوهۆزو نەتەوەو ڕەگەزو ڕەنگ وخاك، دەمارگیرییەكی كەمو كورتو دواكەوتوانەن.. ڕەگەزپەرستی ئەو جاهیلییەتەن، كە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دەیبینێ بەدرێژایی ئەو ماوانەی لایەنی ڕۆحیان تێدا وشك دەبوو. ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەیفەرموو: (بۆگەنیە) ئەم وەسفەی كە هەرخۆی بێزلێكردنەوەو ڕشانەوەی لێ دێت.

بۆیە كاتێك جوولەكە ئیدعای ئەوەیان كرد كە گوایە جولەكە گەلێكن كە خوا هەڵیبژاردون خوا بەرپەرچیدانەوەو مەسەلەی هەڵسەنگاندنی گێڕایەوە بۆ ڕادەی باوەڕهێنان لە هەموو گەلو نیشتمانو نەتەوەو نەوەكانی مرۆڤایەتیدا:

**(وَقالوا كُونوا هوداً أو نَصارى تَهتَدوا قُلْ بَل مِلة إبراهيم حَنيفاً وَما كانَ مِن المُشركين، قالوا آمَنا بالله وَما أنزلَ إلَينا وما أنزَلَ إلى إبراهيم وإسماعيل وإسحاق ويَعقوب والأسباط وَما أوتيَ موسى وَعيسى وَما أوتِي النَبيّون مِنْ رَبهم لا نفرِقْ بَين أَحَد مِنهُمْ ونَحن لَه مُسلِمون، فَإن آمَنوا بمِثل ما آمَنتُمْ بهِ فَقَدْ اهتَدوا وإنْ تولوا فَإنما هُمْ في شِقاق فَسَيكفيكَهُمْ الله وَهوَ السَميع العَليم، صَبغة الله وَمنْ أحسَن من الله صَبغة ونَحن لَه عابِدون)** (البقرة: ١٣٥–١٣٧)

واتە: ووتیان: ببنە جولەكە یان گاور دەكەونە سەر ڕێبازی ڕاستی، بڵێ: نەخێر ئاینەكەی ئیبراهیم ڕاستەو دوور لەلارو وێرییەو هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەداوە. بڵێن: باوەڕمان هێناوە بە خواو بەوەی نێرراوە بۆمان، هەروەها بەوەی بۆ ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوبو نەوەكانی هاتووە. وە بەوەی درا بە موساو عیساو

ئەوەی لەلایەن خواوە بۆ هەموو پێغەمبەران هاتووە. جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کامێك لەوانەوە وە ئێمە بۆ خوای گەورە ملکەچین. ئەگەر بەو شێوەیەی ئێوە باوەڕتان هێناوە ئەوانیش باوەڕیان هێنا ئەوا ڕێبازی ڕاستیان گرتووە، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکردو گوێیان نەدایە، ئەوا ئەوان لە پەرتەوازەییو سەرلێ‌تێك چوونداں. خوای گەورە تۆ لەوان دەپارێزێت. خوا خۆی بیسەرەو بە هەموو شتێك زانایە ئەمە ڕێبازی راستو ڕێكو پێکی خوایە ڕێگەی کێی تر لە ڕێبازی خوایی جوانترە؟ ئێمەش هەموو پەرستیاری ئەوین.

بەڵێ لەڕاستیدا گەلی هەڵبژێرراوی خوایی، نەتەوەی موسڵمانە کە لەژێر سایەی خوا ویستیدا کۆبوونەتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ڕەگەزو نەتەوەو ڕەنگو نیشتمانەشیاندا:

**(كُنتُم خَيرَ أمَة أخرِجَت لِلناسِ تَأمرونَ بِالمَعروف وَتَنهَونَ عَنِ المنكَرِ و تؤمِنونَ بِالله)..**

بەڕاستی ئێوە چاکترین نەتەوەیەك بوون لەنێو خەڵکیدا پێك هاتن، کە فەرمان بەچاکە دەکەنو بەرهەڵستی خراپە دەکەنو باوەڕیشتان بەخوا هێناوە..

ئەوە نەتەوەیەکە لەنەوەی یەکەمی ئیسلامدا پێك هات، کە ئەبوبەکری عەرەبو بیلالی حەبەشیو صوهەیبی ڕۆمیو سەلمانی فارسیو برا بەڕێزەکانی تریانی تێدا کۆببووەو.. ئەو نەتەوەیەی کە نەوەکانی تریش هەر لەسەر ئەو شێوەیەی ئەوان پێك هاتن .. کە ڕەگەزنامەکەیان بریتیە لە عەقیدە.. نیشتمانیشیان (دار اسلام)ەو حاکمیش خوای گەورەیەو دەستوری وڵاتیش تەنها قورئانی پیرۆزە ..

ئەم بیروباوەڕە بەرزە — بەرامبەر وڵاتو ڕەگەزنامەو خزمایەتی — دەبێ لە دڵو دەرونی خاوەنەکانی بانگەوازی خواییدا بچەسپێو، بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرای وا دابین ببێ کە بیروهۆشو هەستو سۆزی جاهیلییەتی تێکەڵ نەبێتو، هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن نەخزێتە ناوی وەك: هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن لە مەسەلەی خاك، لە مەسەلەی ڕەگەز لە مەسەلەی نەتەوایەتی، لە مەسەلەی نەژاد، هاوەڵ بۆخوا پەیداکردن لە مەسەلەی بەرژەوەندییە بچوكو کەمەکان، کە خوا هەموویان لە

تایەكدا كۆدەكاتەوەو لـە تاكـەی بەرامبەریشـدا بـاوەڕ دادەنـێ .. ئـەوجا خـەڵكی سەرپشك دەكات كە چی هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان باهەڵیبژێرن:

**(قُـل إِنْ كـانَ آبـاؤكم وأَبنـاؤكم وإِخـوانكم وأَزواجكُـم وعَشـيرَتكُم وَأمـوال اقتَرفتموها وتِجارة تَخشَونَ كَسادها ومَساكِن تَرضَونها أحَب إليكُم مِن الله ورَسولِهِ وجِهاد في سَبيلِهِ فَتَرَبَصوا حَتى يَأتي الله بأَمرِهِ وَالله لا يَهدي القَوم الفاسِقين)** (التوبة-٢٤)

واتە: بڵێ: ئەگەر باوكتانو ماڵو منداڵتانو براتانو خێزانتانو تیرەكانتـانو، ئـەو سامانو دارایی یەی پەیداتان كردووەو، ئەو بازرگانیەی دەترسێن لەدەستان بچـێتو، ئەو خانوو كۆشكەی پێی ڕازین، زیاتر لە خـواو پێغەمبەرەكـەیو جیهـاد لـەپێناوی خـوادا خۆشـتان دەوێـت دەخۆتـان ئامادەكـەن تـا خـوای گـەورە تۆڵـەی خۆیتـان لـێدەكاتەوە.. خوا هیدایەتی كۆمەڵی خراپەكارو فاسقان نادات.

هـەر بـەو شـێوەیە — ئـەم مەسـەلەیە — دەبـێ لـە دڵو دەرونـی شـوێنكەوتوو هەڵگرانی ئەم بانگەوازە خوایی یەدا بچەسپێ. نابێ بـەهیچ شـێوەیەك ئـەو گومانـە سادەو ساویلكانەی هەن دەربارەی حەقیقەتی جاهیلییـەتو حەقیقـەتی ئیسـلام لـە مێشكی خاوەن بانگەوازەكاندا دروست ببێ.. هـەروەها ئـەو گومانانـەش كـە هـەن دەربارەی سیفاتی (دار الحرب)و (دار الاسلام)، چونكە هەریەكـەیان بـیروڕاو سـیفاتی تایبەتی خۆیان هەیە.. وڵاتێك ئیسلام حـوكمی نـەكات، ئیسلامەتیشـی تێدانیـەو، شەریعەتەكەشی پیادەناكرێت.. تەنها ئەو وڵاتەش (دارالاسلام)ە كە ئیسلامی تێدایـە بە سیستەمو بەرنامەو یاسایەوە.. ئەگینا لەباوەڕ بگەڕێتەوە كوفرە، هەموو شتێكی تری غـەیری ئیسلامـەتیش جاهیلییەتە.. لە حەقیش بتـرازێ گومڕایی یە..

# گۆڕانێکی سەرەکی

ڕاستییەکی سەرەکی هەیە، پێویستە لە دەروونماندا ئاشکرابێت، مادام دەمانەوێت ئیسلام بگەێنینەوە بەخەڵکی، چ بەو کەسانەی باوەڕیان بە ئیسلام هەیە، چ بەو کەسانەی باوەڕیان پێی نیە.. ئەو ڕاستییەش هەر لە سروشتی ئیسلامو مێژووی ئیسلام خۆیەوە هەڵقوڵاوە.

ئیسلام ئایدیۆلۆژی یەکی سەربەخۆیە وا دیدی تایبەتی خۆی هەیە دەربارەی بوونو ژیان. ئایدیۆلۆژییەکی تەواوی خاوەن چەندین سیفاتی تایبەتییە. لەم ئایدیۆلۆژیەشەوە بەرنامەیەکی سەربەخۆی داهاتووی ژیان وەردەگرێت. بەرنامەیەکی تەواوی هەموو ژیان بە هەموو جۆرە پەیوەندیو بنەمایەکییەوە هەروەها سیستمێکی سەربەخۆی تایبەتیش هەیە کە هەر لەم ئایدیۆلۆژییەوە پەیدا دەبێت.

ئەم ئایدیۆلۆژییە لەگەڵ هەموو جۆرە ئایدیۆلۆژییەکی جاهیلی کۆنو نوێدا جیاوازی هەیە. لەوانەیە لە هەندێك ڕاو بڕیاری لابەلایدا لەگەڵ هەندێك لە ئایدیۆلۆژییە جاهیلییەکاندا یەکانگیر ببێتەوە، بەڵام بناغەی سەرەکی هەردولا لێك جیاوازن، لەو بناغانەدا جیاوازن کە ئەم ڕاو بڕیارە بچوکانەیان لێوە وەردەگیرێت. ئەم جیاوازییەش بەدرێژایی مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەردەکەوێت.

کاری سەرەکی ئیسلام ئەوەیە کە ژیانێکی مرۆڤیانەی وابنیات بنێت کە لەگەڵ ئەم ئایدیۆلۆژییەدا بگونجێتو، لە جیهانێکی واقیعیدا پیشانی بداتو، سیستمێکی وا لەسەر زەمین دابمەزرێنێت کە لەگەڵ پرۆگرامە خوایی یەکەدا بسازێت. ئەو خوایەی ئەم میللەتە ئیسلامی یەی هەڵبژارد تا بەم کارانە هەستێت.

ئەوەی کە خوا دەربارەی فەرموی:

**(كُنتُم خَيرَ أمَةَ أخرِجَتْ لِلناسِ تَأمرونَ بالمَعروفِ وَتَنهَونَ عَنِ المنكَر وَتؤمِنونَ بالله)** (آل عمران– ١١٠).

(بەڕاستی ئێوە باشترین نەتەوە بوون لەنێو خەڵکیدا هاتنەکایەوە. بەوەی فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرهەڵستی دەکەن لەخراپەو، باوەڕتان هەیە).

وە دەربارەی سیفەتی ئەو کۆمەڵەش دەفەرموێ:

**(الذينَ إن مَكنّاهُم في الأرضِ أَقاموا الصَّلاة وآتوا الزَّكاة وَأمروا بالمَعروف ونَهوا عَن المنكَر)** (الحج- ٤١)

(ئەوانەی کاتێك لەسەرزەمیندا، دابینمان کردن (لەحوکم کردنـدا) نوێـژیان کـردو زەکاتیان دەداو فەرمانیان بەچاکە دەکردو بەرهەڵستی خراپەیان دەکرد).

❊ ❊ ❊

کەوابوو رێککەوتن لەگەڵ ئایدیۆلۆژییـە جاهیلییـەکانی سـەرزەمینو، باروزروفـە جاهیلییەکان — لە هەر جێیەك بوون — کاری ئەم ئیسلامەنین.. ئیسلام لەو ڕۆژەوەی هاتووە وای نەکردووەو ئەمڕۆش وا ناکاتو، لە داهاتووشدا ئەم جۆرە کارانە ناکـات، چـونکە جاهیلییـەت هـەر جاهیلییەتـە.. جاهیلییـەت بریتیـە لـە لادان لـە یەکخواپەرستیو لادان لەو پڕۆگرامەی خوا بۆ ژیانی مرۆڤایـەتی داینـاوە. هـەروەها بریتیە لە وەرگرتنـی رێسـاو یاسـاو دەستورو خوونەریتو شێوازی هـەڵسو کـەوت لە سەرچاوەیەکی تری غەیری سـەرچاوەی خوایی یەوە. ئیسلامیش هەر ئیسـلامە، کارە سەرەکی یەکەش ئەوەیە خەڵکی لە جاهیلییەتەوە بهێنێتەوە بۆ ئیسلام!

جاهیلییەت بریتیە لە مرۆڤپەرستی، بەوەی کە هەندێك کەس یاسا بۆ هەنـدێکی تر دانێن، غەیری ئەو یاسایانەی خوا پێیان ڕازییە. ئیتر هەرچی شێوەیەکی یاسادانان بێتو، یاسای ئیسلام بریتیە لە پەرستنی خوا — بە تەنها — لەلایەن خـەڵکی یـەوە، بەوەی کە هەموو بەشێکی ئایدیۆلۆژیو بیروباوەڕو عەقیدەو دەستورو یاساو نـەریتو شێواز لە خواوە وەربگرێت، بەوەی هەموو خەڵکی لە مرۆڤپەرستی ڕزگاربن!

ئەمە راستییەکە — کە لە سروشتی ئیسلامو سروشتی ڕۆڵی ئیسلامەوە لەسەر زەمین هەڵقوڵاوە — پێویستە ئیسلام بەم ڕاستییەوە بگەینرێتەوە بە هەموو خەڵکی، بێ جیاوازی: ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام هێناوەو، ئەوانەش کە باوەڕیان پێی نەهێناوە!

ئیسلام بە نیوە چارەسەرکردن ڕازی نابێت. نیوە چارەسەرکردن لە ئایدیۆلۆژی، یان لەو هەڵسوکەوتو جموجۆڵو باروزروفەوە کە هەر لە ئایدیۆلۆژییەوە دێنەکایەوە. دەبێت یان ئیسلام هەبێت یان جاهیلی .. ئەو کاتو شوێنەی نیوەی ئیسلامو نیوەی جاهیلییە، ئیسلام نایەوێتو پێی ڕازی نابێت. چونکە ڕاو تێڕوانینی ئیسلامی دەربارەی هەق وایە کە حەق یەکەو نابێت بە دوو. هەموو شتێکی تری غەیری هەق و هەقخوازیش گومڕاییو ناهەقی ئەم دوو جۆرە تێڕوانینەش بەهیچ شێوەیەك تێکەڵ نابنو پێکەوە نالکێنو مومکینیش نیە پێکەوە بژین . یان ئەوەیە دەبێت حوکمی خوا هەبێت، یان حوکمی جاهیلی .. یان شەریعەتەکەی خوا، یان هەواوهەوەس .. ئایەتی قورئانیش زۆر هەن لەمبارەیەوە:

**(وَأن احكُم بَينَهم بِما أنزَلَ الله ولا تَتَبع أهواءَهم وآحذَرهم أَنْ يَفتِنوكَ عَنْ بَعضِ ما أنزَلَ الله إليكَ)** (المائدة– ٤٩)

واتە: حوکمی نێوانیان بەوە بکە کە خوا بۆی ناردویتە خوارەوەو، شوێن هەواو هەوەسی ئەوان نەکەویت، ئاگاداریش بە لەوەی لە هەندێك لەوانەی خوا بۆی ناردویتە خوارەوە پەشیمانت نەکەنەوەو هەڵوێست نەرمت نەکەن.

**( فَلذلكَ فادع وآستَقم كَما أمرتَ ولا تَتبع أهواءَهم)**(الشورى– ١٥)

واتە: بانگەوازی ئەوە بکەو چۆن فەرمانت پێدراوە وا خۆگر بەو، شوێن هەواو هەوەسی ئەوان نەکەویت.

**(فإنْ لَم يَستَجيبوا لَكَ فَاعلَم أنّما يَتبعون أهواءَهم ومَنْ أَضل مِمَنْ اتّبَع هَواه بغَيرِ هُدى مِن الله إنّ الله لا يَهدي القَوم الظالمين)** (القصص –٥٠)

واتە: ئەگەر وەدەم بانگەوازەکەتەوە نەهاتن، دڵنیابە لەوەی کە ئەوان شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، کێش لەو کەسە گومڕاترو سەرگەردانترە کە دوورە لە

ڕێنمایی خوایی‌و شوێن هەواو هەوەسە خۆی کەوتووە، خوا بەهیچ شێوەیەك ڕێنمایی ستەمکاران ناکات.

**(ثمَ جَعلناكَ عَلى شَريعة مِن الأمرِ فاتبعَها وَلا تتبِع أَهواءَ الذينَ لا يَعلَمون، إنهَم لَنْ يَغنوا عَنكَ مِن الله شَيئا" وإِنّ الظالمين بَعضَهم أَولياء بَعض والله وَلي المتّقين)** (الجاثية– ١٨)

واتە: پاشان تۆمان خستەسەر ڕێبازی شەریعەتێك، دەتۆش شوێنی بکەوە، شوێن هەواو هەوەسی ئەوانە نەکەویت کە نازانن (ڕێبازی خوایی چیەو چۆنە) چونکە ئەوانە هیچ دەسەڵاتی ئەوەیان نیە لە خوا ڕزگارت بکەن. ستەمکاران هەندێکیان سەرپەرشتیاری هەندێکی تریانن‌و، خواش سەرپەرشتیاری پارێزکارانە.

**(أفَحُكم الجاهِلية يَبغون وَمنْ أَحسن مِن الله حُكماً لِقَوم يوقِنون)**(المائدة– ٥٠)

واتە: حوکمی جاهیلییەتیان دەوێ‌و ئەو بەلایانەوە پەسەندترە؟! ئەگەر کەسێك باوەڕی تەواوی هەبێت دڵنیایەکە کەس نیە لەخوا ڕاستترو جوانتر حوکم بکات؟

ئەمەش دوو مەسەلەیە، کە دەبێت تەنها یەکێکیان بگیرێتەبەر، یان شوێنکەوتنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، یان شوێنکەوتنی هەواو هەوەس، یان حوکمی خوایی، یان حوکمی جاهیلی، یان ئەو حوکمەی خوا ناردوێتی‌یە خوارەوە، یان دوورکەوتنەوە لەو پڕۆگرامە خوایی یە ئەمەش بڕیاری خوایەو بە هیچ جۆرێك بواری مناقەشەکردنی تێدانیە.

کەوابوو کاری سەرەکی ئیسلام ئەوەیە: جاهیلییەت لە سەرکردایەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دووربخاتەوەو، خۆی بە پڕۆگرامە تایبەتییەکەی خۆی ئەو سەرکردایەتییە بگرێتە دەست. بەو پڕۆگرامە سەربەخۆو ڕەسەنەی خۆی کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەگەیێنێتە خێرخوازی‌و بەختەوەری.. بەختەوەری کە لە کەناری خوا ویستیدا دەست دەکەوێت، خێرخوازیش کە لەوەدا دەست دەکەوێت کە بزوتنەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەگەڵ ئاراستەی ئەو سەرکردایەتییەدا دەگونجێت. چونکە سەرکردایەتی ئیسلامی کۆمەڵگە دەگەیێنێتە ئەو ئاستە بەرزەی خوای مەزن بۆ مرۆڤایەتی وویستووە. بەمەش کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە حوکمی هەواو هەوەس ڕزگاری دەبێت.

هەروەکو کە (روبعی کوڕی عامر) لە وەڵامی ڕۆستەمی فەرماندەی فارسەکاندا — کاتێك کە ڕۆستەم لە هۆی هاتنەدەرەوەی عەرەبەکانی پرسی لە نیوەدۆرگەی عەرەبەوە — لە وەڵامدا ووتی: (خوا ئێمەی هەڵبژاردووە تا هەر کەسێك کە خوا حەزدەکات لە بەندەکانی، لە مرۆڤپەرستی ڕزگاربکەین‌و، بیخەینە ڕیزی یەکخواپەرستانەوەو، لە تەسك‌و تاری دنیاوە ڕزگاری بکەین‌و، بیخەینە نێو بەرفراوانی دنیاو ڕۆژی دوایی، هەروەها تا لە ستەم وزوڵمی دینەکانی ترەوە ڕزگاری بکەین‌و، بیخەینە نێو دادپەروەری ئیسلامەوە).

کەوابوو ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتووە تا بواری هەواو هەوەس پەرستی خەڵکی هەر بە کراوەیی‌و والایی بهێڵێتەوە.. هەواو هەوەس پەرستی لە ئایدیۆلۆژی‌و سیستەم‌و باروزروف‌و خووڕەوشت‌و نەریتیاندا.. چ هی جاهیلییەتی ئەو خەڵکە بێت کە هاوچەرخی هاتنی ئیسلام بووە، چ هی ئەو جاهیلییەتە بێت کە لە ئێستای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا هەیە.. بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە ئەم هەموو جاهیلییەتانە بەتەواوی بسڕێتەوەو شوێنەواریان نەهێڵێت . تا لە ڕەگ‌و ڕیشەوە هەڵیان بکەنێت‌و، لەسەر پەیکەری ووردکراوی ئەوان بنیاتی ژیانێکی نوێ بکات‌و ژیانی نوێ بهێنێتە کایەوە. ژیانێك کە هەر لە ئیسلامەوە پەیدا بووبێت‌و، بە دەوری تەوەری ئیسلامدا بگەڕێت . ئەگەرچی لە هەندێك لایەنی لابەلادا لەگەڵ ئەم جاهیلییەتانەی دەوروبەریدا — کە خەڵکی تێیدا دەژیان — یەکاندگیر دەبووەوە. بەڵام ئەو لایەنە لابەلایانەش هی جاهیلییەتەکە نین، ئیسلام لێی وەرگرتبن، بەڵکو ئەمە تەنها ڕێکەوتێکەو ڕوویداوە. ئەگینا ڕەگی درەختەکان زۆر زۆر لێك جیاوازن. چونکە ڕەگی درەختی ئیسلام بە حیکمەت خواییدا ڕۆچووەو، ڕەگی جاهیلییەت بە هەواو هەوەسی مرۆڤدا ڕۆچووە!

(والبَلَد الطّيب يخرج نَباته بإذنِ رَبهِ والذى خَبثَ لا يَخرج إلاّ نَكداً) (الأعراف-٥٨).

خاکی بەپیت‌و بەرەکەت — بەئیزنی خوا — ڕووەکی بە بەرەکەتی خۆی دەدات، ئەو خاکەش کە خراپ‌و بێ‌پیتە غەیری خراپ هیچی لێ‌ناڕوێت.

جاهیلییەتیش لە كۆنو نوێدا. هەر پیسو بۆگەن بووە، ڕادەی پیسو بۆگەنیەتەكەی لە ڕواڵەتو شێوەدا دەگۆڕێت، دەنا ڕەگو ڕیشاڵی هەریەكە، ئەویش ئەوەیە كە بریتیە لە هەواو هەوەس پەرستی خەڵكی، ئەوانەی ناتوانن خۆیان لە نەفامیو نەزانی خۆیان ڕزگار بكەنو، هەمیشە بەرژەوەندی خۆیانو چینو گەلو ڕەگەزو نەژادی خۆیان دەخەن پێش دادپەروەریو خێرو حەقخوازییەوە. هەرواش دەمێننەوە تا شەریعەتەكەی خوا دێتو هەروەها ئەمانە ڕیشەكێش دەكاتو، یاساو ڕێسای خواویستی بۆ خەڵكی دادەڕێژێت كە دوورە لە نەزانیو هەواو هەوەس پەرستی مرۆڤەوەو، جیاوازیش ناخاتە نێو بەرژەوەندیانەوە.

لەبەرئەوەی سروشتی پڕۆگرامی خوایی ئەوەندە جیاوازی هەیە لەگەڵ سروشتی پڕۆگرامە مرۆڤینەكان، پێك گەیشتنیان لە سیستەمێكدا شتێكی ئەستەمە هەروەكو كە ئەستەمیشە پێكەوە بگونجێن، یان پڕۆگرامێكی نیوەكار داڕێژن كە نیوەی لە پڕۆگرامی خوایی بێتو نیوەكەی تری لە پڕۆگرامە مرۆڤینەكان بێت. وەك چۆن خوا لەوە خۆش نابێت كە هاوبەشی بۆ پەیدابكرێت، هەر بەو شێوەیەش خۆش نابێت لەوەی پڕۆگرامێكی تر لەگەڵ پڕۆگرامەكەیدا بچەسپێنرێت.. ئەم دوو مەسەلەیەش وەك یەكن. چونكە ئەم هاوبەشیكردنەی پڕۆگرامی مرۆڤین لەگەڵ پڕۆگرامی خواییدا هەر هاوبەشی بۆ خوا پەیداكردنەكەیە بێجیاوازی واتە هەردوكیان هەر (شیرك)ن.

ئەم ڕاستییە پێویستە بە شێوەیەكی ئەوەندە ڕوونو پتەو لە دەروونمدا دابین ببێت — لەو كاتەی ئیسلام دەخەینەوە پێش چاو — دەمان تێكەڵو پێكەڵ نەبێتو منجە منجی تێدا نەكەینو، نەشهێڵین خەڵكی هەروا لەگومانو دوودڵیاندا بمێننەوە، ووازیان لێنەهێنین تا بەتەواوی ئیسلامیان دەدەینیو ئەوانیش لەژێر سایەی ئالآكەیدا دەحەسێنەوە بەوەی كە ئیسلام سەرتاپا ژیانیان بگۆڕێت.. بیروباوەڕیان دەربارەی ژیان بگۆڕێت، وەكو كە باروزروفیان دەگۆڕێت.. بەجۆرێكی وا بۆیان دەگۆڕێت ژیانیان پڕی بێت لە خێروخۆشی .. بیروباوەڕو باروزروفیان دەگۆڕێت تا بیانگەێنێتە ئەو ئاستە بەرزەی شایانی ژیانی مرۆڤە . تا هیچ مۆركێكی جاهیلییان پێوە نەمێنێت لەوانەی خوویان پێوەگرتبوو، مەگەر ئەو بەشە بچوكو لابەلایانەی كە

لەگەڵ لایەنی ئیسلامی هاوشێوەن‌و یەکاندگیر دەبنەوە. تەنانەت ئەم بەشە بچوکە لابەلایەش ئەوەی کۆنی خۆیان نیە. چونکە ئەوەی خۆیان لە ڕەگ‌و ڕیشاڵێکی جاهیلی واوە وەرگیراوە کە زۆر زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو بەشە بچوك‌و لابەلایەی لە ڕەگ‌و ڕیشاڵی ئیسلامی وەرگیراوە سەرچاوەی جاهیلی پیس‌و بۆگەنە. هەرچییەکیشی لێوە وەربگیرێت هەر جاهیلییە.. لەهەمان کاتیشدا کە ئیسلام ئەو لایەنانەیان دەگۆڕێت، لایەنی (زانستییە ڕووت)ەکەیان زیاتر هان دەدات تا بەرەو پێش بچێت.

هەروەها پێویستە زوو ئیسلام بگەێنینەوە بەخەڵکی، تا وابیرنەکەنەوە کە ئیسلام ڕێڕەوێکە وەك ئەو ڕێڕەوە کۆمەڵایەتییە مرۆڤینەییانە، یان سیستەمێکە وەکو ئەو سیستمە مرۆڤینەییانەی بۆ حوکم کردن داڕێژراون ئیتر هەرچی ناوێك‌و سیفات‌و شێوازێك‌و ئاڵایەکیان هەبێت. بەڵکو تا زوو تێ‌بگەنەوە کە ئیسلام ئیسلامەو بەس! ئیسلامی سەربەخۆ، شەخسیەتی ئیسلامی سەربەخۆ، ئایدیۆلۆژی ئیسلامی سەربەخۆ، باروزروفی ئیسلامی سەربەخۆ.. ئیسلام بگەێنینەوە بە خەڵکی ئەو ئیسلامەی خێرو خۆشییەکی وا بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دێنێتە کایەوە کە ئێستا وا لە گێژاوی ئەم باروزروفە بۆگەنانەدا خەونی پێوە دەبینێت .. ئیسلام.. ئیسلامی پاك‌و جوان‌و ڕێك‌و پێك‌و گونجاو.. ئەو ئیسلامەی کە خوا ناردویەتی ..

❊ ❊ ❊

کاتێك ئیسلام دەدەینەوە بە خەڵکی‌و لەگەڵیاندا دەدوێین‌و، بەم شێوەیە هەست بە ئیسلام دەکەین، ئەم هەست پێکردنە وامان لێدەکات بەوپەری بەهێزی‌و متمانە بەخۆکردنەوە بجولێین‌و، بەوپەری سۆزو بەزەیی یەوە لەگەڵیاندا بدوێین دەبێ متمانەی تەواومان هەبێت.. متمانەی ئەو کەسەی کە دڵنیابە لەوەی کە ئەو ڕێبازەی گرتویێتی ڕاستەو ڕێبازەکانی خەڵکی هەڵەن.. سۆزی ئەو کەسەش کە ناڕەحەتی‌و سەرگەردانی

مرۆڤایەتی دەبینێت‌و، دەزانێت کە چۆن بەختیاریان دەکات.. بەزەیی ئەو کەسەش کە دەبینێت وا خەڵکی لە گومڕاییدان‌و، تەنها ئەم دەزانێت کە ڕێنمایی لەکوێ وەدەست دێت!

ئێمە نامانەوێت خەڵکی هەڵ خەڵەتێنین‌و ئیسلامیان بۆ بخەینە بەرگی ئاڵ‌و والاوە، یا لەگەڵ هەواو هەوەس پەرستی ئەواندا نەرم‌و نیان بین.. نا، بەڵکو زۆر ڕاستگۆ دەبین لەگەڵیانداو بە ئاشکرا پێیان دەڵێین: ئەم جاهیلییەتەی ئێوە تێیدان پیسەو خوا دەیەوێت پاکتان بکاتەوە.. ئەم باروزروفەی ئێوە تێی کەوتوون بۆگەنەو، خوا دەیەوێت بۆگەنیەکەتان لابدات، ئەم ژیانەی ئێوە دەیبەنە سەر ژیانێکی ئاست نزمەو خوا دەیەوێت بەرەو ئاستێکی بڵند بەرزتان بکاتەوە.. ئەوەی ئێوە تێیدان نەگبەتی‌و نارەحەتی‌و پشێوییە، خوا دەیەوێت باری سەرشانتان سووك بکات‌و لەو نەگبەتی‌و نارەحەتی‌و پشێوییە دەرتان بهێنێت.. ئیسلام ئایدیۆلۆژی‌و بیرو باروزروفتان دەگۆڕێت‌و، دەتانخاتە نێو ژیانێکی نوێی وا کە دڵنیادەبن لەوەی ئەم ژیانەی ئێستاتان زۆر هیچ‌و پووچە. دەتانخاتە نێو باروزروفێکی وا کە باروزروفی ئێستای ڕۆژهەلات‌و ڕۆژئاواتان لا بێ‌نرخ دەبێت. ئیسلام خووڕەوشتی واتان فێردەکات کە دوایی ڕقتان لەو خووڕەوشتەی ئێستاتان دەبێتەوە.. چونکە ئێوە — ئەنجامی نەگبەتی‌و بزێوی خۆتان — ژیانی واقیعی ئیسلامیتان نەدیوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دوژمنەکانتان — دوژمنانی ئەم دینە — گەلە کۆمەکێ دەکەن تا پێکەوە هەموو، بەرهەڵستی بنیاتنانی ئەو ژیانە ئیسلامییە بکەن‌و، ناهێڵن ئەم ئیسلامە لە واقیعدا زووتر بێتەدی ئەگەر ئێوە نەتاندیووە، ئێمە سوپاس بۆخوا — دیوومانەو چێژتوومانە، چونکە ئێمە قورئانەکەمان، شەریعەتەکەمان، مێژوەکەمان ئایدیۆلۆژییە بێ‌وێنەکەمان، لە دڵو دەروناندا چەسپیووەو دڵنیاشین‌و گومانمان لەوەدا نیە کە ئەو داهاتووەی دێت، بۆ ئیسلامەکەی ئێمەیە!

پێویستە ئێمە ئاوا لەگەڵ خەڵکی بدوێین — لەوکاتەی دەمانەوێت ئیسلامیان بخەینەوە بەردەست — چونکە ئەمە ئەو ڕاستی‌یەیە کە ئیسلام لە سەرەتایدا کردبووە یە ڕوانگەی خۆی‌و — بۆ یەکەمین جار — لێوەی لەگەڵ خەڵکی دەدوا.. چ لە نیوە

دورگەی عەرەب چ فارس چ ڕۆم.. ولە هەرچی جێگایەکیشدا ویستبێتی لەگەڵ خەڵکی بدوێت، هەربەم شێوەیە بووە.

لە بەرزییەوە لەگەڵیاندا دەدوا، چونکە ئەمە ڕاستییەکی ئاشکرایەو بە زمانێکی نەرمو نیانو شیرینو، بەسۆزو بەزەیی یەوە دەیدواندن، چونکە ئەمەش سروشتی ئیسلامەکە خۆیەتی. پاشان گۆشەگیریو جودایی لەگەڵ کردن بەشێوەیەکی وا بواری دوودڵیو ڕاڕایی بڕی ئا ئەمەشە ڕێبازی ئیسلامی.. هەرگیزاو هەرگیز پێی نەووتن: کە ژیانو باروزروفو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیان کەمێك دەگۆڕێت! یان پێی نەووتن ئیسلامیش وەکو سیستەمو باروزروفەکەی ئەوان وایە، کە لەگەڵی ڕاهاتوون .. وەك چۆن ئێستا هەندێکمان – کاتێ ئیسلام بۆ خەڵکی باس دەکەین – وادەڵێین.. جارێك بە ناوی (دیموکراسی ئیسلامی) جارێکی تر بەناوی (سۆشیالیستی ئیسلامی)و، جارێکی تر بەناوی ئەوەوە کە گوایە ئەم باروزروفە ئابوریو سیاسیو یاساییانەی کە ئێستا لە ولاتدا هەن هیچی واگۆڕینی ناوێت، مەگەر چەند لایەنێکی کەمی!!! هەروەها چەندین قسەو ڕای نەرمو دۆڕاوی تر یان دڵنەرمی بەرامبەر هەواو هەوەسپەرستی خەڵکەکە.

نا.. نەخێر .. مەسەلەکە زۆر زۆر لەمە جیاوازترە، چونکە دەرچوون لەو جاهیلییەتەی لەسەر زەمیندا بلاوبۆتەوەو هاتنە نێوئیسلامەوە، گۆڕینێکی زۆر قوڵو گەورەیە .. چونکە ڕیزی ئیسلامی زۆر زۆر لە جاهیلییەتی کۆنو نوێ جیاوازە. ئەم دەردەسەریو پشێوییەی ئێستا وا کۆمەڵگەی ئیسلامی دەڕەتێنێت مومکین نیە سوکە گۆڕینێکی سیستەمو یاساو باروزروفەکان چارەسەری بکات مومکینیش نیە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕزگاری ببێت مەگەر بەو گۆڕانە سەرەکیو قوڵو بەرفراوانە گۆڕان بەگۆڕینی پرۆگرامی مرۆڤ بە پرۆگرامی خوای کردگاری مرۆڤ. گۆڕان بە گۆڕینی سیستمی مرۆڤ بە سیستمی خوا ویستی خوای مرۆڤ. گۆڕان بە گۆڕینی حوکمی مرۆڤ بۆ حوکمی مرۆڤ ..

ئەمە ڕاستییەکە، ڕاستییەکی تری وەکو ئەویش هەیە کە بریتیە لەوەی کە دەبێت ئێمە ئەم ڕاستییە ئاشکرا بکەین‌و نەهێڵین چیدی خەڵکی لە گومان‌و دوودڵی‌و ڕاڕاییدا بمێننەوە.

خەڵکی لەوانەیە لە سەرەتاوە ئەمە ببوغزێنن، وە ڕەنگە تورە ببن‌و بخرۆشین. بەڵام خۆ خەڵکی لە سەرەتای ئیسلامیشەوە بەرامبەر بانگەوازی ئیسلامی هەربەو شێوەیە بوون .. ڕاچڵەکین، توورە بوون، محمدیان دەبوغزاند ﷺ مادام ئایدیۆلۆژی‌و بیروباوەڕیانی سووك دەکردو، دژی خواکانیان دەوەستاو نکۆڵی لە باروزروفیان دەکردو، وازیان لە خووڕەوشت‌و نەریتیان دەهێناو.. باروزروف‌و خووڕەوشت‌و نەریتی تایبەتی بۆ خۆی‌و ئەو کۆمەڵە موسڵمانە کەمەی لەگەڵی بوون دەهێنایە کایەوە، غەیری ئەو باروزروف‌و خووڕەوشت‌و نەریتانەی جاهیلی ..

پاشان چی ڕوویدا؟ هەر ئەو خەڵکە خۆیان گەڕانەوە بۆ ئەو ڕاستییەی لەسەرەتاوە دەیانبوغزاندو تۆقیبوون لێی‌و دژی خرۆشابوون.

**(كأَنَّهم حمر مستَنفَرة فَرت مِنْ قسوَرة)** (المدثر: ٥٠-٥١)

واتە: هەردەڵێی کەری سرکی کێوین‌و، لەدەست شێرهەڵاتوون گەڕانەوە سەر ئەو ڕاستییەی لە سەرەتاوە بەرهەڵستیان دەکردو بەهەموو هێزو تواناپانەوە بەرەنگاریان دەکردو شوێنکەوتوەکانیان لە مەککە تووشی ئەو هەموو سزاو ئازارە دەکرد، پاشانیش لە مەدینە بەوپەری هێزیانەوە دژی جەنگان‌و کەللەڕەق‌و رقنانە هێرشی ریشەکێش کردنیان دەکردەسەریان!

بانگەوازی ئیسلامی لەسەرەتای هاتنیدا بە هیچ شێوەیەك لە ئێستا بەهێزترو چاکتر نەبوو .. ئەوسا بانگەوازێکی نەناسراوی نادیاری وابوو کە جاهیلییەت بە هەموو توانایەوە نکۆڵی لێدەکرد. بانگەوازێکی گۆشەگیربوو کە لە گەڕەك‌و کۆڵانەکانی مەککەدا گەمارۆ درابوو، لەلایەن خاوەن دەسەڵات‌و سامانەکانەوە دوژمنداری دەکرا، لەوکاتەدا لە هەموو جیهاندا غەریب بوو چواردەوری بە ئیمپراتۆریەتی گەورەو خاوەن دەسەڵات گیرابوو، کە دژی بیروباوەڕو هیواو

مەبەستەکانی دەوەستان.. بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بەربەستانەشدا، ئیسلام لەو ڕۆژەشدا وەکو ئەمڕۆ هەر بەهێزبوو. هەروەکو کە لە داهاتووی سبەینێشدا هەروا بە بەهێزی دەمێنێتەوە .. چونکە بنەماکانی هێزوپتەوی هەر لە سروشتی ئەم عەقیدەیەدان بۆیە دەشتوانێت لەکام باروزروفەی زۆر دژوارو نارەحەتە بجولێت چونکە لەسەر بناغەی هەقخوازییەکی ساناو سادە دامەزراوەو توانای هەیە سەرکردایەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بگرێتەدەستو بەرەو پێشکەوتن بیانبات، لە هەر قۆناغێکدا بێت، دواکەوتوو بێت لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتیو زانستیو ژیری یان پێشکەوتوو.. هەروەها لەبەرئەوەی راستگۆو سەرڕاستە لە ڕووبەڕووبوونەوەی جاهیلییەتدا، هەرچەند جاهیلییەت خاوەن دەسەڵاتو پتەوو بەهێز بێت، ڕاستەو ڕاست دژی دەوەستێتەوە، بێئەوەی دڵنەرمیو نیانی بەرامبەر دەربڕێت لەسەر حسابی ڕەسەنێتی خۆیو، بێئەوەی چاو لە هەواو هەوەس پەرستی جاهیلییەت بپۆشێت، بێئەوەی بیەوێت خەڵکی هەڵ خەڵەتێنێت، بەڵکو ڕووەوڕوو بێ منجە منج حەق ڕوون دەکاتەوە بۆ خەڵکیو بۆشیان دەسەلمێنێت کە تەنها ئیسلامە پڕبێت لە خێرو بەرەکەتو ڕێزو بەختەوەری.

ئەو خوایەی کە مرۆڤی دروست کردووە، شارەزاشە بە سروشتی پێکهاتنو ختوورەی دڵو دەروونی مرۆڤ، دەشزانێت ڕادەی وەدەم هاتنی مرۆڤ بەدەم هەقو هەقخوازییەوە چەندە، بۆیە لە دەربڕینی ئەم ڕاستییەشدا زۆر پتەوو بەهێزەو دوورە لە دڵەکوتیو حەزەرو بیم ..

لە دەرونی مرۆڤدا ئامادەیی یەکی تەواو هەیە بۆ گۆڕانکاری لە جۆرە ژیانێکەوە بۆ جۆرە ژیانێکی تر ئەم گۆڕانکارییەش زۆرجار لە دەروندا ئاسانترە لە گۆڕینی چەند لایەنێك کە ڕاهاتووە لەگەڵی.. بێگومان گۆڕانکاریش بەتەواوی لە سیستمێکی ژیانەوە بۆ سیستمێکی بڵندتری ژیان کە راستترو پاکترو تەواوترە. چونکە ئەم جۆرە گۆڕانە بەڵگەی وای هەیە کە قەناعەت بەدڵو دەرون بکات.. بەڵام بەڵگەی ئەو جۆرە گۆڕانە لە سیستەمی جاهیلییەوە بۆ سیستەمی ئیسلام چیە ئەگەر بریتی بێت تەنها لە گۆڕینی چەند لایەنێکی بچوکی کەمی لێرەو لەوێ لە حاڵەتی وادامانەوە

لەسەر سیستمی پێشوو کە خەڵکی لەگەڵیدا ڕاهاتوون، زۆر پەسەندترو نزیکترە لە ژیرێتییەوە وەك لە گۆڕین بۆیە ئەو جۆرە گۆڕینە هەر پێویست ناکات پێشچاو بخرێت، پێویست ناکات ئەو جۆرە گۆڕینە داوا بکرێت چونکە ئەوە گۆڕینە لە سیستەمێکی دامەزراوەوە بۆ سیستمێکی تر کە نەچەسپێنراوەو دابین نەبووە کە لە هەمان کاتیشدا هەردووکیان چوون یەکن!

* * *

هەروەها دەبینین هەندێك کەس لەوانەی ئیسلامخوازن کاتێك باسی ئیسلام بۆ خەڵکی دەکەن، وا لە مێشکیاندا چەسپیووە کە گوایە ئیسلام تاوانبارەو ئەمان دەیانەوێت بێتاوانیەکەی ڕوون بکەنەوە وەك ئەوەی نموونە بەوە دێننەوە کە سیستەمەکانی ئێستاش فلان شت دەکەنو فلان ڕایان هەیە بەرامبەر فیسار مەسەلە.

ئەدی بۆچی لەهەمان کاتدا ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیسلام هەر ئەوەی کردووە کە (شارستانێتی) ئێستا دوای هەزارو چوارسەد ساڵ دەیکات!

بەڵام ئەمە بەرگریکردنێکی زۆر لاوازەو زۆر نابەجێیە!

ئیسلام بۆ سەلماندنی ڕاستی هەڵوێستی خۆی بەڵگەلەسیستمو هەڵسوکەوتو ڕا بۆگەنی جاهیلییەت ناهێنێتەوە. ئەم (شارستانێتی)یەی زۆرکەسی سەرسام کردووەو لە ناوەڕۆکدا بەزاندونی هەر جاهیلییەتە. ئەگەر سیستەمەکەی لەگەڵ ئیسلامدا بەراورد بکرێت دەبینرێت سیستەمێکی شڕۆڵی چڵکنی بێنرخو پڕخەوشە. چونکە خۆ مەسەلەکە ئەوەنیە بووترێت خەڵکی ئەو شارستانێتییەی خۆشتر ڕادەبوێرن وەك لە خەڵکی ئەم ناوچەی پێی دەوترێت نیشتمانی ئیسلامی، یان (جیهانی ئیسلامی).. گومانیش لەوەدانیە کە هۆی دواکەوتوویی و ناڕەحەتی و دەردەسەری ئەمان لەوەدایە کە ئیسلامیان واز لێهێناوە نەك لەبەر ئەوەبێت کە موسڵمانن .. بەڵگەی ڕوونی ئیسلامیش ئەوەیە: کە ئیسلام بریتیە لە خێرخوازییەکی وا کە بەو ناپێورێتو بەڵکو

بەراوردکردنیشی لەگەڵیدا ستەمە هەروەها ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە تا جاهیلییەت بگۆڕێت نەك بڕیاری لەسەر بدات هات تا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە پشێوی دەربهێنێتو بەرەو لوتکەی کامەرانی بەرزی بکاتەوە هات بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات لەو زەلکاوو زۆنگاوەی لە پێستی (شارستانێتی) دایە.

بادەرون بەزین وامان لێ‌نەکات بگەڕێین بەڵگەو نمونە بە سیستەمو بیروباوەڕە بۆگەنەکانی ئەمرۆ بهێنینەوە.. چونکە ئێمە ئەم سیستەمو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیانەی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا وەك یەك ڕەفزدەکەین.. هەمووی ڕەفز دەکەین چونکە زۆر زۆر کەمترو نزمترە لەوەی کە ئیسلام دەیەوێت کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بڵند بکاتەوە بۆ ئاستیو پێی بگەێنێ..

کاتێك لەڕوانگەی ئەم ڕاستییەوە لەگەڵ خەڵکی دەدوێینو، کاتێك بە پاکی ڕێسا عەقیدەیی یەکەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامیان دەدەینەوە، لە ناخیاندا ئەوەیان بۆ دروست دەبێت کە گۆڕان لە ئایدیۆلۆژییەکەوە بۆ ئایدیۆلۆژییەکی تر، نامەعقول نیە، هەروەها گۆڕانی باروزروفێك بە باروزروفێکی تر ئەستەم نیە. دواندن لەم جۆرە ڕوانگەیەوە بەڵگەی بەهێزی لەگەڵە، بەڵام ئەو شێوازە زۆرە بێ‌بەڵگەو لاوازە ئەگەر پێیان بڵێیت: واز لەو سیستەمە بهێنن کە دامەزراوەو وەرن بۆ ژێر سایەی سیستەمێکی تر کە هیچی وای لەوەی خۆتان جوێ نیە بەڵام هێشتا دانەمەزراوەو! ئەوەی ئێستا دەیکەن لەسایەی ئەم سیستەمەدا ئەوساش دەتوانن بیکەن، کەمێك گۆڕین نەبێت هیچی ترتان لێ داوا ناکرێت .. تەنها کەمێك خووڕەوشتو نەریتو باروزروفو هەواو هەوەسپەرستیتان بگۆڕنو بەس. خەمیشتان نەبێت هەرچی شتێك ئێوە سوورن لەسەری حەزی لێدەکەن هەروەك خۆی دەیهێڵینەوەو هیچی وای لێ ناگۆڕین !!

ئا ئەم شێوازە کە لە ڕواڵەتیدا ساناو ئاسانەو، لە ناوەڕۆکیدا وا دەردەکەوێت کە زۆر باشترە. نەك هەر ئەوەندەی چاك نیە، بەڵکو هەر دوورە لە ڕاستییەوە! چونکە ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئیسلام هەستو هۆشو ئایدیۆلۆژی دەگۆڕێت، وەك ئەوەی کە باروزروفو سیستەمەکان دەگۆڕێت، هەروەکو ئەوەش کە یاساو ڕێساکان سەرتاپا

دەگۆڕێت بە شێوەیەکی وا کە بە هیچ جۆرێك مۆرکی جاهیلی پێوە نەمێنێت، ئەو جاهیلییەتەی ئێستا وا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تێکەوتووە.. دەبێ بەراشکاوی بە خەڵکی بڵێین: ئیسلام دەیەوێت کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بگۆڕێت، لە مرۆڤپەرستییەوە بۆ یەکخواپەرستی ..

( فَمَنْ شاءَ فَليؤمِنْ وَمَن شاءَ فليَكْفر) .

واتە: جاکێ حەزدەکات با باوەڕ بهێنێت‌و، کێش حەزدەکات با کافربێت.

(وَمَن كَفَر فَان الله غَني عَن العالَمين) .

واتە: هەر کەسێکیش کافر دەبێت، خۆ خواپێویستی بە خەڵکی نیە.

چونکە لە ڕاستیدا مەسەلەکە، مەسەلەی کوفرو باوەڕە، مەسەلەی هاوبەشی بۆ خوا پەیداکردن‌و یەکخواپەرستییە، مەسەلەی جاهیلییەت‌و ئیسلامە.. ئەمەش پێویستە ئاشکرا بێت کە خەڵکی مادام ژیانێکی جاهیلی دەبەنەسەر موسڵمان نین، با هەر لافی ئیسلامەتیش لێبدەن! ئەگەر کەسانی وا هەن خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، یا هەڵدەخەڵەتێنرێن‌و وادەزانن کە ئیسلام مومکینە لەگەڵ ئەم جاهیلییەتەدا بژی، ئەوە ڕای خۆیانە.. ئەو خۆ هەڵخەڵەتاندن‌و هەڵخەڵەتاندنەیان هیچ لەڕاستی واقیعەکە ناگۆڕێت‌و ئەوەش ئیسلامەتی نیەو، ئەوانەش موسڵمان نین. بانگەوازی ئیسلامەتیش ئەمڕۆ دەبێت ئەوە بکاتە پیشەی خۆی کە خەڵکی لە جاهیلییەتەوە بهێنێتەوە بۆ ئیسلام‌و، سەر لەنوێ خەڵکەکە موسڵمان بکاتەوە.

ئێمە وەنەبێت کە خەڵك بانگ دەکەینەوە بۆ ئیسلام مەبەستمان ئەوە بێت کرێیان لێوەرگرین. مەبەستیشمان پایەبەرزی‌و خراپەکاری سەرزەمین نیە، بەهیچ شێوەیەك داوای شتێکی تایبەتیان لێناکەین بۆ خۆمان‌و، حساب‌و کرێی خۆشمان لە خەڵکی وەرناگرین .. ئێمە بۆیە خەڵکی بانگ دەکەین بۆ ئیسلام چونکە خۆشمان دەوێن‌و دەمانەوێت خێرو چاکەخوازیان پێبگەێنین، ئێمە دڵسۆزی ئەوانین هەرچەندە ئەوان نارەحەتی‌و ئەشکەنجەو ئازاریشمان بۆ پێش بهێنن.. چونکە ئەوەیە سروشتی داعی ئیسلام.. ئا ئەمەشە ئەو هۆیانەی وا لە موسڵمان دەکەن کە ئیسلام زووتر بە خەڵکێکی زۆرتر بگەێنێت پاشان پێویستە خەڵکی لە ئێمەوە حەقیقەتی ئیسلام

وەربگرن، دەبێت ئەوەش بزانن کە موسڵمان بوونیان چییان لێ داوا دەکات بەرامبەر ئەو خێرو بەختەوەرییەی بۆیان وەدەست دەهێنێت. هەروەها دەبێت زۆرباش ڕای ئێمە بزانن دەربارەی ئەو جاهیلییەتەی ئەوان.. دەبێت ئەوە بزانن کە ئەوەی ئەوان جاهیلییەتەو فرِی بەسەر ئیسلامەوە نیە، ئەوەی ئەوان مادام (شەریعەتی خوای تێدا نیە (هەواو هەوەس پەرستی)یەو، مادام (هەقو هەقخوازی) نیە (گومڕایی)یەو.. لە هەقو هەقخوازیش بترازێت هەموو شتێك گومڕایی‌یە !!

❊ ❊ ❊

ئێمە شتێك لە ئیسلامەکەماندا نیە شەرم بمانگرێت بەرامبەری‌و نەوێرین بۆ خەڵکی باس بکەین، یان ناچاربین بەرگری لێبکەین شتێکی وای تێدانیە ناچاربین بە فێڵ پێیان بگەێنین، یان تووشی منجە منجو دەم تێکەڵو پێکەڵ هاتن ببین تێیداو بترسین ڕاستییەکەی دەربکەوێت.. هۆی سەرەکی بەزینی ڕۆحی هەندێ کەس، لە (موسڵمانەکان) بەرامبەر ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواو باروزروفە جاهیلییەکانی ئەملاولا، ئەوەیە کە دەیەوێت بەنێو سیستەمە مرۆڤینەکانو هەڵسو کەوتو ڕای (شارستانێتی) جاهیلیدا بگەڕێت، بەو هیوایەی بەڵکو خاڵێکی هاوبەشی دەست کەوێتو بیکات بە بەڵگەی ڕاستی هەڵوێستی یاساو ڕێسا ئیسلامییەکانی!!

ئەو کەسەی ئاوا دەگەڕێت بە دووی بەڵگە هێنانەوەداو پێویستی بەوە هەیە کە عوزر بۆ ئیسلام بهێنێتەوە، ئەوە ئەو کەسە نیە کە ئیسلام دەخاتەوە پێش چاوی خەڵکی چونکە داعی هیچ پێویستییەکی بەوەنیە. ئەوە ئەو کەسانەن کە لەنێو جاهیلییەتە شڕۆڵە چڵکنەکەدا دەژین کە پڕە لە خەوشو کەم کورتی‌و دژایەتی. بۆیە دەیانەوێت بەڵگە بۆ جاهیلییەت بهێننەوە. ئەو جۆرە کەسانە هەر ئەوانەی کە هێرش دێننە سەر ئیسلام لەلای خۆشەویستەکانیان بەکەموکورتی دایدەنێن، کە گوایە بەخەیاڵی خۆیان بەرگری لە ئیسلام دەکەن. هەروەك ئیسلام تاوانبارێك بێتو خرابێتە قەفەسی تاوانکارییەوەو ئاتاجی بەرگریکردنی ئەوان بێت.

زۆر كەس لەوانە لەگەڵمان دابوون - لەو ساڵانەی لە ئـەمریكا بردمانــە سـەر — هەندێكمان (كـە چـەند موسـڵمانێكی كـەمیش بـووین) هەڵوێسـتی بـەرگریكردنو بەڵگەهێنانەوەیان دەگرتەبەر. بەڵام من پێچـەوانەی ئەوانــەوە هەمیشـە هەڵوێسـتم هەڵوێستی هێرش كردنەسەر جاهیلییەتی ڕۆژئـاوابوو.. چ لـەبارەی بیروبـاوەڕە لێڵـە دینەكانیەوە بووبێت چ لەبارەی كۆمەڵایەتیو ئابوریو خووڕەوشتە بەژانەكەیەوە بـوو بێـت، یـان بەرامبـەر بیروبـاوەڕە چـەوتەكانی دەربـارەی گوناهەكـەی سـیدنا آدمو گیانفیدایی سیدنا عیسـیو ئیعـتیراف كردنـی خـەڵكی لای قەشـەوە .. هتـد، كـە هیچیان لە بیرو ژیریو ویژدانـدا ڕاسـت نابنـەوە.. سـەرمایەداریەكەی بـەو هـەموو مۆنۆپۆڵو سووو پارەپەرستیو پیسكەیی یەی تێیدایەتی .. تاكپەرستی یەكـەی كـە هەموو جۆرە یەكسانیو بەرابەریەكی تێدا دەفەوتێت مەگەر لـەژێر ترسـی كوتـەكی یاسادا .. یان ئەو سەربەستی یە ئاژەڵیانەی پێی دەڵێن (سەربەستی تێكەڵ بوون) .. یان بازاری كۆیلە سـپییەكانی كـە پێـی دەڵـێن (سەربەسـتی ئـافرەت).. یـان ئـەو ناڕەحەتیو دابین نەبوونەی لـە مەسـەلەی ژن هێنـانو تەڵاقدانـدا هەیـە جگـە لـەو ڕەگەزپەرستییە پیسەی هەیە لەنێوان ڕەش پێستو سپی پێستدا — وە هەروەها.. لە ئیسلامەكەی ئێمەدا هەر لایەنێكی بیگریـت مرۆڤایـەتیو پیـاوەتیو چـاكەخوازیو خێرەومەندیو چاوبڕینە ئاسۆی پێشكەوتنو بەختەوەرییە. ئەم ئیسلامە بـەرزەی كـە لە هەموو مەسەلەیەكی واقیعدا كە ڕووەو ڕووی دەبێتەوە یاساو ڕێسای پڕاوپـڕی بـۆ دادەنێتو پڕ بەپێستی خـۆی چارەسـەری دەكـاتو بـە هـیچ جۆرێـك لـە سروشـتی مرۆڤایەتی ناچێتە دەرەوە.

ئـا ئـەم شـتە ڕاسـتییەمان لـەناو جەرگـەی واقیعـی ژیـانی ڕۆژئـأاوادا بەرچـاو دەكەوت.. كە ڕۆژئاوایی یەكان تەریق دەبوونەوەو خەجاڵەت دەبوون كاتێـك دەخرانـە بەر روناكی ئیسلام .. بەڵام هەندێك كەس لەوانەی لافی ئیسلامەتی لـێدەدەن خـۆ ڕاناگرن بەرامبەر ئەو بۆگەنەی جاهیلییەت بۆیە دەبەزن. ئەوجا هەوڵیش دەدەن لـەو واقیعە بۆگەنـە نمونـە بهێننـەوە بـۆ بـەرگریكردن لـە ئیسـلامو بەڵگـە لـەو هـەواو

هەوەسپەرستی‌یە ماددییەی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا دێننەوە تا (تاوان) لەسەر ئیسلام لادەن!!

دوای ئاشکراکردنی ئەم ڕاستیانە پێویستمان بەهیچ نیە بیڵێین، مەگەر ئەوە نەبێت کە بڵێین: دەبێت ئێمە خۆمان ئیسلام بخەینەوە پێش چاوی خەڵکی‌و بەهیچ جۆرێك نابێت قەرەی جاهیلییەت بکەوین چ لە ئایدیۆلۆژی‌و بیروباوەڕیداو، چ لە باروزروفیداو، چ لە بەشێکی خووڕەوشت‌و نەریتیدا، هەرچەندە جاهیلییەت پاڵەپەستۆو تەوژمی بەتینی ببێت لەسەرمان.

کاری سەرەکی ئێمە ئەوەیە ئایدیۆلۆژی‌و خووڕەوشت‌و نەریتی ئیسلامی بخەینە جێی جاهیلییەت. ئەمەش بەوە نایەتەدی — وەکو هەندێکمان وا حاڵی بووین — هەر لە یەکەم هەنگاوەوە پێ بەپێ‌و شان بەشان لەگەڵ جاهیلییەتدا بکەوینە ڕێ. چونکە ئەمە نیشانەی بەزینە لە یەکەم هەنگاوەوە..

تەوژمی ئایدیۆلۆژییە بەربلاوە کۆمەڵایەتییەکان‌و خوو نەریتە بەربلاوەکانی کۆمەڵایەتی تەوژمێکی بەتین‌و توندو تیژن، بەتایبەتی لە جیهانی ئافرەتدا، بەڕاستی ئافرەتی موسڵمانیش لەنێو زۆنگاوی ئەم جاهیلییەتەدا تەوژمی زۆر توندوتیژو بەهێزی لێ‌دەدرێت.. بەڵام چارنیە .. چارنیە هەردەبێت سەرەتا خۆمان بگرین، پاشان سەربەرزی‌و نەبەزین مێشك‌و دڵ‌و دەرون‌و هەست‌و هۆشمان داگرێت. دوای ئەم دوو هەنگاوە ئەوجا بکەوینە ڕوون کردنەوەی جاهیلییەت‌و ئاشکراکردنی ئەو ئاستەنزم‌و بێ‌نرخەی خەڵکی جاهیلییەتی تێدایە کە چەند هیچ‌و پووچە لەچاو ئەو ئاسۆ بەرزو بڵندەی ژیانی ئیسلامی دەیهێنێتە کایەوە.

ئەمەش بەوە نایەتەکایەوە، کە لەگەڵ جاهیلیەتدا بکەوینەڕێ، هەروەها بەوەش نابێت لێی دوورکەوینەوەو گۆشەگیر ببین.. نەخێر وانابێت.. بەڵکو دەبێت هەم تێکەڵیان بین، هەم لێیان جوێ بینەوە. هەروەها پێدان‌و لێ‌وەرگرتن لێی، بەڵام بە هەستێکی بەرزەوە. هەروەها بەپێش چاوخستنی هەق‌و هەقخوازی بەشێوەیەکی دڵنەرمانە، بە سەربەرزی باوەڕو نەبەزینەوە، بەوپەری خۆ بەکەم زانینەوە. ئەمانە هەمووی لەگەڵ قەناعەتی تەواوماندا بەو ڕاستییە گەورەیەی کە: ئێمە لەنێو

جاهیلیەتدا دەژین‌و، ئێمە خاوەن ڕێبازی ڕاستترین وەك لە جاهیلییەت، ئەمەش گۆرانێکی سەرەکییە، چونکە گۆڕانە لە جاهیلییەوە بۆ ئیسلام، جیاوازی نێوانیشمان زۆرەو مومکین نیە لەنیوەی ڕێدا یەکاندگیر ببینەوە. مەگەر لەو جێگایانەدا کە خەڵکی جاهیلی دێنە ڕیزی ئیسلامەوە جا ئیتر ئەو خەڵکە لە دانیشتوانی نیشتمان ئیسلامی بن — کەوا دەزانن موسڵمانن — یان لە دانیشتوانی غەیری نیشتمانی (ئیسلامی) ئەو کاتە ئیتر خەڵکی لە تاریکییەوە دەخرێنە نێو ڕوناکی‌و، لەو پشێوی‌و ناڕەحەتی‌یە ڕزگاردەبن کە تێیدان، ئەوسا ئەوانیش دەکەونە نێو ئەو خێرو فەڕەوە کە ئێمە لە ئیسلامەکەمانەوە وەرمانگرتووەو هەوڵمانداوە تێیدا بمێنینەوە .. ئەگینا با ئەو ئایەتە بڵێین کە خوا بە پێغەمبەرەکەی فەرموو کە بە کافرەکان بڵێت:

**(لَكُمْ دينكُمْ وَلِيَ دينْ)** (الکافرون- ٦)

واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان‌و ئایینی خۆشم بۆ خۆم.

# سـەربەرزی بـاوەڕ

(وَلا تَهِنوا ولا تَحزَنوا وأَنتم الأعلون إِنْ كُنتمْ مؤمِنين )(آل عمران– ١٣٩)

کزمەبن وخەفەت مەخۆن‌و، هەر ئێوەن سەرکەوتوو، بەمەرجێ موسڵمان بن .

یەکەم شت کە لەم تەوجیهە قورئانیەوە دێتە خەیاڵی مرۆڤ: کاتی جیهادی چەك‌و، شەرکردنە لەپێناوی خوادا .. بەڵام ڕاستی ئەم تەوجیهەو مەودای ماناکەی زۆر زۆر لەوە زیاترە کەتەنها ئەو کاتە تاکەی هەبێ، ئەگەر چی ئەو کاتە تاکەش زۆری لێ جوێ دەبێتەوە.

ئەو تەوجیهە بەرزە بریتیە لەکاتێکی هەمیشەیی، کە دەبێ هەست‌و سۆزو بیروباوەڕی موسڵمان بینوێنێ‌و، لەبەر ڕۆشنایی ئەودا کێش‌و بەها بۆ هەموو ڕووداوو خووڕەوشت‌و مرۆڤ‌و شتێك دابنێ.

بریتیە لەو سەربەرزییەی کە دەبێ لە دەرونی موسڵماندا داین ببێ. لە هەموو کات‌و، بەرامبەر هەموو هەڵوێست‌و باروزروف‌و هەموو کەسێك‌و، لەدانانی نرخی هەموو شتێکدا. سەربەرزی بەکێش‌و نرخی باوەڕ، بەرامبەر هەموو کێش‌و نرخێکی تر کە لەسەر بناغەیەکی غەیری بناغەی باوەڕ دادەمەزرێ.

سەربەرزی بەرامبەر هەموو هێزەکانی سەرزەمین کە لە پرۆگرامی باوەڕ لایانداوە، سەربەرزی بەرامبەر هەموو کێش‌و نرخی سەرزەمین کە لە سەرچاوەی باوەڕەوە هەڵ نەهێنجراون. سەربەرزی بەرامبەر هەموو نەریتێکی سەرزەمین کە باوەڕ نەیهێناونەتە کایەوە. سەربەرزی بەرامبەر هەموو یاسایەکی سەرزەمین کە باوەڕ داینەڕشتوون. سەربەرزی بەرامبەر هەموو باروزروفێك کە باوەڕ داینەمەزراندون .

سەربەرزی.. لەگەڵ بێهێزی لەگەڵ ژمارەکەمی.. لەگەڵ هەژاری سامان.. وەکو لەگەڵ بەهێزی‌و ژمارە زۆری‌و دەوڵەمەندیدا دەبێ هەبێت.

سـەربەرزی یـەك كـە لەبـەردەم هێـزە سـتەمكارەكانو، نەریتـە كۆمەڵایەتییـە پووچـەڵەكانو، یاسـا ناهـەموارەكانو، باروزروفـە بۆگەنەكانـدا چـۆك دانـەدا، ئـەو باروزروفانەی خەڵكی لایان خۆشـە بـەڵام پاڵپشـتێكی بـاوەڕی نیـە لای موسـڵمانی سەربەرز بێبایەخ بن ..

خـۆڕاگرتنو ورەبـەرزی گەرمـەی مەیـدانی جیهـادی چـەك، تـەنها كاتێكـە لـە كاتەكانی ئەو سەربەرزییەی ئەم تەوجیهە خواییـیە دەیگرێتەوە.

❊ ❊ ❊

سەربەرزی بە باوەڕهێنان بەخوا، وەنەبێ تەنها وورەیـەكی تـاكو، حەماسـەتێكی پاڵ پێوەنەرو، گەرمـە تەریقەیـەك بـێ، بـەڵكو بریتیـە لـەو سـەربەرزییەی لەسـەر ڕاستییەكی نەبزۆك دادەمەزرێ، كە ئەویش بەناخی سروشتی بوونەوەردا ڕۆچووە. ئەو ڕاستییەی بە نـەمری لەپشـت هێـزو، بیروبـاوەڕی دەوروبـەرو، زاراوەی كۆمەڵگـەو، پێكناسینی نێوان خەڵكی، ماوەتەوە ئەو ڕاستییە نەمرە هـەر دەمێنـی چـونكە بـە خوایەكی زیندووەوە بەندە كە نامرێ ..

هەموو كۆمەڵگەیەك نەریتێكی گشتیو، پالەپەستۆیەكی توندو، كێشێكی قورس دروست دەكـات لەسەرشـانی ئـەو كەسـەی سـیمای ئـەو كۆمەڵگەیـە لەبـەر خـۆی دادەماڵی .. یان ئەو كەسەی دەیـەوێ بـەرەنگاری كۆمەڵگەكـە بێتـەوە، بێئـەوەی پاڵپشتێكی ئەستوری ببێ .. ئەو فیكرو هـۆشو بیروباوەڕانـەی لـە كۆمەڵگەیكـدا بڵاوبوونەتەوە زەحمەتە یەكێك بتوانێ خۆیان لەدەست قوتار بكات، مەگەر ئەو كەسە خـۆی لەسـەر حەقیقـەتێك جێگیركردبـێ كـە هـەموو فیكروهـۆشو بیروبـاوەڕێكی لەبەرچاو بچوك بێو، تـەوجیهاتی لـە سەرچـاوەیەكی بڵنـدەوە بـۆ بـێ كـە زۆر زۆر گەورەترو بەهێزتر بێ لەو سەرچاوەیەی كۆمەڵگەكەی لێوەی وەردەگرێ.

ئەو کەسەی بەرەنگاری کۆمەڵگەیەك دەکاتو، ڕووبەڕووی خوو نەریت، نرخو کێشو، فیکروهۆشو، بیروباوەڕو، لادانو هەڵپەکردنەکەی ڕادەوەستێ، ئەگەر پشتی بەپاڵپشتێکی پتەوەوە نەدابێ کە لە خەڵکی بەهێزترو، لە زەمین دابین بووترو، لە ژیان ئازیزتر بێ، هەست بەکزیو غەریبی دەکات.

بۆیە خوای گەورە موسڵمان بەتەنها بەجێناهێڵێو، ناهێڵێت بەهەستی هەتیوانەوە پاڵەپەستۆو قورسایی کێش وکزیو خەفەتی غەریبی تووش ببێ .. بەڵکو لەکاتو شوێنی پێویستی خۆیدا، ئەو تەوجیهەی دەداتێ:

**(وَلا تَهِنوا وَلا تَحزَنوا وأَنتم الأعلون إن كُنتمْ مؤمِنين)** .

تا بەرەنگاری کزیو خەفەتەکەی پێبکات، چونکە کزیو خەفەت دوو هەستی ڕاستەوخۆنو لەو کاتانەدا، لە دەروندا دروست دەبن .. ئەو کاتە موسڵمان نەك هەر بە ئارامگرتنو وورەبەرنەدان، بەڵکو بە سەربەرزییەوە ڕووبەڕووی کزیو خەفەتەکە دەبێتەوە سەربەرزییەك، کە لە لوتکەیەکی بڵندەوە تەماشای هێزی ستەمکارو بیروباوەڕی زۆرو، باروزروفی تێکچڕژاوو، خوو نەریتی بەربڵاوو، جەماوەرێکی زۆر دەکات کە لەسەر گومڕایی کۆبوونەتەوە.

موسڵمان سەربەرزترین پاڵپشتو سەرچاوەی هەیە چونکە ئەو هەموو شتێك لە خواوە وەردەگرێو، لە هەموو شتێکدا دەگەڕێتەوە وەلای ئەوو، لەسەر پرۆگرامی ئەو دەڕوات، ئیتر زەمینو، خەڵکی چین؟ نرخی ئەو نەریتو خوانە چین کە لەسەر زەمیندا بڵاوبوونەتەوە؟ ئەو نرخو کێشە چین کە خەڵکی بۆ مرۆڤی دادەنێ؟..

موسڵمان بەرزترین بیروباوەڕو ناسکترین هەستو فراوانترین دیدی هەیە بەرامبەر حەقیقەتی بونەوەر.. باوەڕهێنان بەخوای تاكو تەنها لەو شێوەیەیدا کە ئیسلام هێناویەتی، تەواوترین شێوەی زانینی حەقیقەتی گەورەیە، کاتێك ئەم شێوە مەزنە بەو بیروباوەڕو عەقیدەو ڕێڕەوانە دەپێوێ کە لە ماوەی مێژوودا لەسەر یەکتری کەڵەکە بوون .. جا ئایا لە فەلسەفەی کۆنو نوێوە هاتبن، یاکۆتا قۆناغی عەقیدەی بت پەرستەکان وعەقیدەی خاوەن کتێبە ئاسمانیە دەست لێدراوەکان، هێنابنی، وەیان

ڕێڕەوە ماددی یە پووچەکان خزاندبێتیانە ناو چەند مێشکێکەوە .. کاتێك ئەو ورێنەگەشەدارو جوان وگونجاو ڕوون وڕێك وپێکەی ئیسلام بەو دروست کراوانە دەپێورێ، گەورەیی و مەزنی عەقیدەی ئیسلامی بۆ دەردەکەوێ .گومان لەوەدانیە کە ئەو کەسانەی ئەم زانیاریەیان هەیە سەربەرزترو سەرکەوتووترن[1] .

هەروەها موسڵمان بەرزترین بیروباڕای هەیە، بەرامبەر ئەو پێوەرەی ژیانو ڕووداوو، مرۆڤو شتی تری پێ دەپێورێ .. ئەو عەقیدەی لە خواناسین (بەو سیفەتانەی ئیسلام هێناویەتی)و لە ناسینی حەقیقەتی گەورەی گەردونەوە (نەك لە بواری ناسینی ئەم زەمینە بچکۆلەیەوە) دروست دەبێ.. ئەمەیە ئەو عەقیدەیەی کە دەتوانێ بیروڕایەکی وا دەربارەی نرخو کێشو هەڵسەنگاندن بە موسڵمان ببەخشێ، کەزۆر زۆر بەرزترو بەدیقەت تر بێ لەو پێوەرە لاسەنگانەی لەبەردەستی مرۆڤدان، ئەو مرۆڤەی تەنها بەرپێی خۆی دەبینێ کە لە پێوانیەك نەوەدا، لەسەریەك پێوەر نامێنێتەوە، بەڵکو هەر لەیەك نەتەوەدا، بگرە لە حوکمی یەك دەروندا.. خێرا خێرا پێوەر دەگۆڕێ.

هەروەها موسڵمان هەستو ویژدانو خووڕەوشتی زۆر زۆر بەندن، چونکە عەقیدەکەی لە خوای خاوەن ناوی جوانو سیفەتی نموونەیی یەوە، بۆ هاتووە لەبەر ئەوە ئەو عەقیدەیە ئیلهامی بڵندیو پاکژیو خاوێنیو داوێن پاکیو لە خواترسانو چاکەخوازیو جێنشینێتییەکی پارسەنگی پێدەبەخشێ، جگە لەوەی ئەو عەقیدەیە هەمیشە پاداشتی ڕۆژی دوایی دەخاتە پێش چاوی ئەو موسڵمانە.. پاداشتی ڕۆژی دوایی.. کە هەموو ناڕەحەتییەکی دونیاییو ئیشو ئازارێك لە بەرامبەریدا ئاسان دەبێ، وویژدان وزەمیری موسڵمانی پێ دەحەوێتەوە تەنانەت ئەگەر لە هەموو سامان وخێری دونیایی بێبەشانە سەربنێتەوەو ژیانی دونیا بەجێ بهێڵێ هەر دڵ هێمنەو سرەوتووە، چونکە چاوی لەپاداشتی لای خوا بڕیبوو .

هەروەها موسڵمان بەرزترین سیستمو شەریعەتی هەیە .. کاتێك موسڵمان بەچاوی لێکۆڵینەوەوە دەڕوانێتە هەموو ئەو یاساو ڕێسایانەی مرۆڤایەتی لە کۆنو

---

١) **بڕوانە بەشی (تیەورکام) لە کتێبی** ( خصائص التصور الاسلامي ومقوماته ).

نوێدا دیونی، کە دەیانپێوێ بە سیستمو شەریعەتەکەی خۆی. دەبینی ئەو سیستمانە لەچاو شەریعەتە پێگەیشتووو، ڕژێمە تەواوەکەی خۆیدا، وەك گەڕەلاوژیو گەمەی منداڵانو، پەڵهاوێشتنی کوێروایە.. ئەوجا لەو لوتکە بڵندەوە، بەچاوێکی پڕبەزەییو سۆزەوە دەڕوانێتە ئەم مرۆڤایەتییەی گومڕاو نەگبەتو وێڵە وا لە دەردەسەریو کەساسیدا مۆنج دەدات.. کە تەماشای پلەی خۆشی دەکات.. وا لەو سەربەرزیو لوتکە بڵندەدایە کە زۆر بەرزترە لەوەی گومڕاییو دەردەسەری بگاتێ.

❊ ❊ ❊

موسڵمانانی یەکەمیش ئاوا ڕادەوەستان لەبەردەم ئەو ڕواڵەتە بۆشو هێزە فشەڵو ئیعتبارە جاهیلییانەدا کە خەڵکی دەیانپەرستن.

جاهیلییەت وەنەبێ ماوەیەکی مێژووبێ، بەڵکو بریتیە لەو کاتانەی کە کۆمەڵگە لەئیسلام لادەدات .. ئەمەش زۆر دووپات دەبێتەوە. چ لە ڕابووردوودا بووبێ، چ ئێستا ڕوبدات، چ لە داهاتوودا.

موغیرەی کوڕی شوعبەش ئاوا لە ئۆردوگای ڕۆستەمی فەرماندەی بەناوبانگی فارسدا وەستا. بەرامبەر شێوەو باروزروفو کێشو نرخو بیروباوەڕی جاهیلی دوا..

(ئەبو عثمان النهدي دەگێڕێتەوە کە: کاتێك موغیرە چووە سەرپردەکەو پەڕییەوە. چووە ناو فارسەکان، ئەوانیش دایان نیشاند، ئینجا پرسیان بە ڕۆستەم کرد کە ئەگەر ڕێی دەدات دێتەلای. هیچ شتێکیان نەگۆریبوو، هەموو وەك خۆی مابوو، چونکە بەدەسەڵاتو هێزی خۆیان هەراڵ ببوون. هەر بە بەرگی خۆیانەوە بوون کە موغیرەی کوڕی شوعبە چووە لایان، هەموو تاجو پۆشاکە زێڕچنەکانیان لەبەردابوو. مافور (فەرش)ێکیان لەبەردەم بارەگاکەیاندا ڕاخستبوو، درێژی بەقەدەر ماوەی تیر هاویشتنێك (غلوة) درێژبوو واتە نزیکەی سێ صەد یان چوارصەد هەنگاو کە دەبوو لەو پەرەوە قسە لەگەڵ ڕۆستەمدا بکرێت. موغیرە هاتە پێشەوە، خۆیو چوار

پرچەكەی قژی، ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە سەردۆشەك‌و سەرینەكەی ڕۆستەم‌و لەسەری دانیشت! ئالقە لەگوێكان خێرا پەلاماریانداو بەپاڵ‌و تەكان هێنایانە خوارەوە. موغیرە ووتی: ئێمە مەگەر بەخەو بە ئێوە بگەیشتینایە، كەچی ئێستا دەبینم ئێوە لە هەموو كەسێك كە من بینیبێتم گەوج‌و بێ‌مێشك ترن.

ئێمەی عەرەب هەموو لەناو خۆماندا یەكسانین، كەس كەس ناچار ناكات بیپەرستێ. وامزانی ئێوەش وەك ئێمە بە تەنگ هۆزو نەتەوەی خۆتانەوە دێن. لەجیاتی ئاوا هەواڵتان بدامایە، باشتربوو بتانووتایە كە هەندێكتان خوای هەندێكی ترتانن. دەزانم ئەمە ئاوا بۆتان سەرناگرێ. ئێمە ئەوە ناكەین. ئێستاش ئێوە منتان بانگ كردووە نەك من لەخۆمەوە هاتبم. ئەمرۆش دڵنیابووم كە ئەم تەخت‌و تاراجەتان لە نەماندایەو ئێوە دیدۆڕێنن‌و ئێمە بەسەرتاندا زاڵ دەبین، چونكە دەسەڵاتداری لەسەر ئەم خووڕەوشت‌و لەسەر ئەم ژیری‌و مێشكانە دانامەزرێ.

ڕوبعی كوڕی عامریش هەر بەو شێوەیە بوو كە لەگەڵ هەمان ڕۆستەم‌و دەس‌و دایەرەیدا ڕەفتاری كرد، (پێش دەست پێكردنی شەڕ سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص، ڕوبعی كوڕی عامری نارد بۆلای ڕۆستەم، فەرماندەو سەرۆكی سوپای فارسەكان. ڕوبعی چوو.

وا بارەگایان بە سەرین‌و دۆشەكی ئاوریشمین ڕازاندۆتەوە.. یاقوت‌و مرواری بەنرخ لەبەر ڕۆستەمدا دەدرەوشێتەوەو، تاجێكی لەسەرناوە.. ئیتر هەرچییەكی تری بەنرخ‌و جوان هەیە پۆشیوێتی . وا لەسەر دۆشەكێكی زێرینیش دانیشتووە ڕوبعیش هەروا بەو جلەشڕوووڕانەی خۆیەوە، بە سواری ئەسپەكەیەوە خۆی كرد بەژووردا، هەتا نالی ئەسپەكەی لایەكی مافورەكەی شێلا. ئینجا دابەزی‌و ئەسپەكەی بەسەرینێكەوە بەستەوەو هاتەپێشەوە — چەكەكەشی هەر بەدەستەوە بووو، كڵاوە جەنگییەكەشی لەسەردابوو.

پێیان ووت: چەكەكەت دانێ.

ووتی: من خۆم لەخۆمەوە نەهاتووم، بەڵكو ئێوە بەدووتاندا ناردووم. ئەگەر ڕازی دەبن هەروا بەم شێوەم دەمێنمەوە، ئەگینا دەگەڕێمەوە.

ڕۆستەم ووتی: لێی گەڕێن با هەر بەو شێوەیەی بێ، ئەوجا ڕوبعی خۆیدابوو بەسەر ڕمەکەیدا کە نووکەکەی لە دۆشەکەکە چەقی بوو ..

پاشان ڕۆستەم ووتی: چی وای لە ئێوەکرد ئاوا بەو شێوەیە بەرەو وولاتی ئێمە بێن؟

ڕوبعی ووتی: خوا ئێمەی هەڵبژاردووە تا ئەو کەسانەی — خوا حەز دەکات — لە مرۆڤپەرستییەوە ڕزگاریان بکەین‌و بیان خەینە سەر ڕێی پەرستنی خوای تاك‌و تەنها، لە تەسك وتاری دونیاوە دەریان بهێنین‌و بیان خەینە بەرفراوانی دنیاو ڕۆژی دوایی یەوە هەروەها تا لە ستەم‌و زۆرداری دیینەکانەوە، بیانخەینە نێو دادپەروەری ئیسلامەوە).

❊ ❊ ❊

باروزروف دی‌و دەگۆڕێ، هەڵوێستی موسڵمان دەبێتە هەڵوێستی یەکێکی بەزیوی بێچەك‌و هێزی ماددی. بەڵام مادام موسڵمانە هەست‌و سۆزی بەردەوام تێی دەگەێنێ کە هەر ئەو سەربەرزو سەربڵندە. بۆیە بەچاوی زاڵ‌و نەبەزەوە، لە لوتکەی بەرزی‌و مەزنییەوە تەماشای بەرامبەری دەکات، چونکە دڵنیایە لەوەی ئەم بەزینەش ماوەیەکەو بەسەردەچێ‌و باوەڕیش کە نۆرەی خۆی هەیە، مومکین نیە هەردەبێ بێت.. موسڵمان هەرگیز سەرشۆڕ ناکات، چونکە خەڵکی هەموو دەمرن، بەڵام ئەم شەهید دەبێ. ئەم کە ئەم سەرزەمینە جێ دێڵێ، بەرەو بەهەشت دەڕوا. بەڵام ئەوان — زۆربەیان — بەرەو دۆزەخ مل دەنێن.. جیاوازی نێوان ئەم دوو هەڵوێستەش زۆر زۆرە.. موسڵمان گوێ لە بانگەوازەکەی خوای پەروەردگار دەگرێ کە دەفەرموێ :

**( لا يَغرّنّك تَقَلّب الذينَ كَفَروا في البِلاد، مَتاع قَليل ثمّ مأواهمْ جَهَنّم وبِئسَ المِهاد، لكِن الذينَ آتَّقوا رَبَهم لَهمْ جَنَّات تَجري مِن تَحتِها الأنهار خالِدينَ فيها نزلا" مِنْ عِند الله وَما عِند الله خَير لِلأبرار)**( آل عمران: ١٩٦–١٩٨)

هەوڵدانی سەربەخۆی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خوا نیە، کە بۆ بازرگانیو پارە پەیداکردن دەیدەن، هەرالّت نەکات. ئەوە شتێکی کەمو کاتییە. پەناگەی ئەو کەسانە، سەرەنجام دۆزەخەو خراپترین جێیان دەبێ. بەلاّم ئەوانەی لە خوای خۆیان دەترسێن خوا بەهەشتێکی بۆ ئامادەکردوون کە ڕوباری بەژێردا دەڕواتو، بە نەمری تێیدا دەمێننەوە ئەمەش سەرەتای بەخێرهاتن کردنیانە، کە لەلایەن خواوە بۆیان ئامادە دەکرێ خێرو چاکەی پیاوچاکانیش لەوەدایە کە لەلای خوایە.

عەقیدەو بیروباوەڕو خووڕەوشتو باروزروفی نالەباری وا باڵ دەکشێنێ بەسەر کۆمەڵگەدا، کە هەمووی جیاوازیان هەیە لەگەڵ عەقیدەو بیروباوەڕو خووڕەوشتو هەڵسوکەوتی موسڵمان. بەلاّم لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو هەستەی لێ جیانابێتەوە کە هەر ئەم سەربەرزو سەرکەوتووەو، هەموو ئەوانە لە پلەیەکی نزمدان .. بۆیە لە لوتکەی ڕێزو شانازییەوە تەماشای ئەوانە دەکات. هەروەها لە لوتکەی ڕەحمەتو بەزەیی یەوە دەیانڕوانێنێو حەز بە ڕێنمایی یان دەکات بەرەو ئەو خێرخوازی یەی ئەمی تێدایەو، ئەم گەیشتۆتێو، حەزدەکات بەرزیان بکاتەوە بۆ ئەو ئاسۆ ڕوناکەی ئەمی تێدادەژی.

بەدکاریو ناهەقی کە لە کۆمەڵگەدا تەشەنە دەکەن، دەشراخێننو دەنگ بەرزدەکەنەوەو پەڕی کلکو باڵیان گیڤ دەکەنەوەو، مەزنیو پیرۆزی خەرمانە بەدەوریاندا دەکات کە دوکەڵی دووڕوویی ڕۆشنایی چاوو بینایی دەگرێو، ناهێڵێ ڕووی ڕەشو، کردەوەی بەدو خراپەکارییەکانیان ببینرێن لەوکاتانەدا موسڵمان لە لوتکەی بڵندیو مەزنی باوەڕو پلەی خۆیەوە، دەڕوانێتە ئەو بەدکارییە فشەڵە، سەیری ئەو جەماوەرە هەڵخەڵەتاوەی دەوروپشتی دەکات .. بەلاّم کز نابێو، خەفەت ناخواو، سووربوونی لەسەر ئەو ڕاستپەروەرییەی لەسەری پەروەردەبووە، کەم نابێتەوەو، باوەڕو ئیلتزامی بە پرۆگرامەکەی کە شوێنی کەوتووە، لەق نابێو ناجمێ. حەزو ئارەزووشی کزنابێ لەوەی کە هەر بەهیوایە ئەو گومڕاو فریودراوانە ڕێنمایی بکاتو بەرەو مێرگوزاری باوەڕ بیانهێنێت.

کۆمەڵگە لە هەواو هەوەسی داخزێنەری خۆیدا نقوم دەبێ بە لیتەو قوڕاوی زۆنکاوەکەیدا ڕۆدەچێت کەچی وادەزانێ خۆی لە کۆتو زنجیر قوتارکردووەو ئازادەو

ڕادەبوێرێ! پەیداکردنی پارەو نانی حەڵاڵ دەکەوێتە کۆڵی شێرو، ڕابواردنی بێتاوان دەبێ لەچاوی ماردا دەربهێنرێ.. زۆلکاو زۆنگاوی کۆمەڵگە بەجۆرێك شێلو دەبێ، لە قەوزەو قوڕولیتاو زیاتر، ڕوونی تێدابەدی ناکرێت .. بەڵام موسڵمان لە لوتکەی بەرزو بڵندی خۆیەوە، دەڕوانێتە ئەوانەی وا لە لیتاوی بنی زەلکاودا نقووم دەبنو تەماشای خۆی دەکات، وا بەتەنها ماوەتەوە! بەڵام کزنابیو خەفەت ناخواو، نایەت بەخەیاڵیدا جلە پاکژو خاوێنەکانی خۆی داکەنێ، وەك وان خۆ لە قوڕاو لیتاو باوێ.. بەتایبەتی کە دڵنیاشە لەوەی: هەر ئەم سەربەرزو بڵندە، چونکە لە قولایی ناخیدا لەزەتو تامی باوەڕدەچێژیو لەدڵدا هێمنەو ڕادەبوێرێ ..

بەڵێ ئاوا موسڵمان کە باوەشی بەدیینەکەیدا کردووە، وەك ئەوە وایە باوەشی بە کورە پشکۆی ئاگردا کردبێ .. لە کۆمەڵگەیەکدا کە دوورە لە دین، لە چاکە، لە خووڕەوشتی پاكو بەرز، لە بایەخدانی بەڕێز، لە هەرچی شتێك کە جوانو پاکژو خاوێنە .. لەکاتێکدا کە زۆربەی کۆمەڵگەکەش گاڵتە بەهەڵوێستی ئەم دەکەن، توانج دەگرنە بیروباوەڕی بە هەڵسوکەوتو خووڕەوشتە پاکەکەی پێدەکەنن! بەڵام موسڵمان کزنابێ کە ئەو لەو لوتکە بەرزو بڵندەوە دەڕوانێتە ئەوانەی وا گاڵتە بەم دەکەنو تیرو توانجی تێدەگرنو، پێی پێدەکەنن. هەڵوێستی ئەمیش وەکو یەکێك لە کاروانچیانی کاروانی باوەڕ وایە، کە لە پێش ئەمدا بە ڕێگای دووری ڕوناکی ژیاندا ڕۆیشتوون .. هەڵوێستی حەزرەتی نوح — سلاوی خوای لێ بێ-:

**(إِنْ تَسخَروا مِنّا فإنّا نَسخَر مِنكم كَما تَسخَرون)** (هود- ٣٨)

ئەگەر ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن، لەڕاستیدا ئێمە گاڵتە بە ئێوە دەکەین، ئێستاش وەکو ئێوە گاڵتەمان پێدەکەن، گاڵتەتان پێدەکەینەوە.

چونکە موسڵمان مەنزڵی کۆتایی کاروانی باوەڕو، مەنزڵی کۆتایی کاروانی بەدبەختی کافرانی چاولێیە، هەریەکیان لەو ئایەتەدا دەبینێ کەخوا دەفەرموێ:

**(إِن الذينَ أجرَموا كانوا مِن الذينَ آمَنوا يَضحَكون، وَإِذا مَرّوا بِهِم يَتَغامَزون، وَإِذا آنقلَبوا إلى أهلهم آنقَلَبوا فكهين، وإِذا رَأوهم قالوا إِنّ هؤلاء لَضالّون، وَما**

**أرسلوا عَلَيهم حافظين، فاليَوم الذينَ آمَنوا مِن الكفار يَضحَكون، عَلى الأرائِك يَنظرون، هَلْ ثُوب الكفار ماكانوا يَفعلون)** (المطففين: ٢٩-٣٦)

تاوانباران بەوانە پێدەکەنین کە باوەڕیان هێناوە. کاتێ پێیان دەگەیشتن، چاویان لە یەکتری دادەگرت — وەکو نهێنیەکی ناوخۆیان بێو، تا موسڵمانەکان تەریق ببنەوەو شەرمیان بەخۆبێ — کە دەشگەڕانەوە ناو کۆمەڵەی خۆیان زۆر بەوە کەیف دڵخۆش دەبوون کە گاڵتەیان بە موسڵمانان کردووە. ئەگەر موسڵمانەکانیان ببینیایە، دەیانووت: ئا ئەمانەن گومڕاو سەرلێشێواو — وەنەبێ ئەمانەش بە چاودێر دانرابن بەسەر موسڵمانەوە — ئینجا خوا دەفەرموێ: ئەمڕۆ — لە ڕۆژی دواییدا — موسڵمانەکانیش، ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێنابوو بە کافرەکان پێدەکەنن، خۆشیان وان لەسەر جێی حەسانەوەی خۆیانەوە دەڕواننە ڕووی خوا. ئینجا خوادەپرسێ: ئایا کافرەکان پاداشتی ئەوەیان وەرگرت کە دەیانکرد ؟!

هەر لەکۆنەوە خوا لە قورئانی پیرۆزدا، قسەی کافرەکانی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە کە بە موسڵمانەکانیان دەووت:

**(وإذا تُتلى عَلَيهم آياتُنا بَيّنات قالَ الذينَ كَفَروا للذينَ آمَنوا أيّ الفَريقين خَير مَقاماً وأَحسنَ نَديّاً)** (مريم- ٧٣)

ئەگەر ئایەتەکانی ئێمەیان لا بخوێنرایەتەوە، کافرەکان بەو کەسانەیان دەووت کە باوەڕیان هێنابوو: کۆمەڵی چ لایەکمان پلەوپایەی بەرزترە؟ کۆڕو یانەی کامان چاکترە؟

چ لایەك؟ کۆڕی کام لایان چاکترە؟ بە هەواو فیزو لەخۆباییبووەکان کە باوەڕیان بە موحەممەد نەهێناوە؟ یان هەژارەکانی دەوروپشتی؟ کۆڕی کامیان؟ نەضری کوڕی حارثو عەمرۆی کوڕی هیشامو وەلیدی کوڕی موغیرەو ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب؟ یان بیلالو عەممارو صوهەیبو خەبباب؟!

(بۆچی ئەگەر ئەو بانگەوازەی موحەممەد بڵاوی دەکردەوە ئەگەر باش بووایە، شوێنکەوتووەکانی ئەوانە دەبوون؟ ئەوانەی کە نە دەسەڵاتیان لەنێو قوڕەیشدا هەیەو، دژواریش دروست دەکەن بۆی؟ کە لە خانوویەکی نزمی لا داخوراوی وەکو

خانووەکـەی (ئەرقـەم)دا کۆدەبوونـەوە .. بەرهەڵستیکەرانیشـی ئەوانـەی کۆشـکی ڕازاوەی (دار الندوة) بوون، کە خاوەنی پلەو پایەو دەسەڵاتو سامان بوون؟!).

ئەمە هەڵسەنگاندنی سەرزەمینە .. هەڵسـەنگاندنی ئـەو کەسانەیە کـە ئاسـۆ بڵندەکان نابینن، ئەوانەش لە هەمووکاتو شوێنێکدا هەن .. ئەمەش حیکمـەتێکی خوایـە کـە عەقیدەکـەی دوورە لـە هـەموو ڕواڵـەتێکی ڕازاوەی سـواغ دراوی درۆو دەلەسەی هەراڵکەر .. حیکمەتی خوای گەورەیە کە ئەو عەقیدەیـە هـیچ پلەوپایـەو سـامانو نـاوێکی پێوەنیـە خـەڵکی بۆخـۆی پێڕاکێشـێ نـە خزمایـەتی حـاکمو کاربەدەستانی نە هیوای دەسەڵاتداری، نە ختوکـەدانو بزوانـدنی هـەواو هـەوەس .. بەڵکو لەجێی ئەوانە هەوڵو تێکۆشانو نارەحەتیو جیهـادو شـەهیدبوونە!! تـا ئـەو کەسەی کە دەیەوێ بێ، لە سەرەتاوە دڵنیایی لەخۆی کە لەبەر ڕەزامەندی خـوا دێو مەبەستی هیواو پاداشتی خەڵکی نیەو، چاوەڕوانی ئەوە نیـە دەسـتی لـە (شـتێك) گیربێ! با ئەو کەسەی مەبەستی تـەماعو سـوودو بەرژەوەندییـە، خـۆی هـەر دوورە پەرێز بگرێ لێی، با هەر کەسێ هیوای خۆ ڕازاندنەوەو ڕواڵەتی سواغ دراوی درۆزنە، با هەر دوورکەوێتەوە. باهەر کەسێ ئامانجی سـامانو ڕابواردنـە، قـەرەی نەکـەوێو خۆی نەکات بە خاوەنی!

ئیعتیباراتی خەڵکی چ کێشو نرخێکیان دەبێ، ئەگەر لە تەرازوی خواییدا سووك بوون.

موسڵمان عەقیدەو بیروباوەڕو بەهای لە خەڵکییەوە وەرنەگرتووە، تـا هەوڵبـدات ڕێزی خەڵکی دەست بکەوێ، بەڵکو لەخوای خەڵکییەوە، وەریگرتووە، کـە ئەمەشـی بەسە موسڵمان ئەمانەی لە ئارەزوو هەواو هەوەسی خەڵکییـەوە، وەرنـەگرتووە، تـا لەگەڵ ئارەزوو هەواو هەوەسی ئەواندا بەرزو نزمو لارو وێر بـێ، موسـڵمان ئەمانـەی لەم جیهانە دیاریکراوەوە وەرنەگرتووە.

ئیتر چۆن ئەو موسڵمانە لە دەرونیدا هەست بە کزی دەکات یـان لـە دڵـی خۆیـدا خەفـەت دەخـوا کـە ئـەو پەیوەنـدە بـە خـوای خـەڵكو تـەرازوی ڕاسـتپەروەریو

سەرچاوەكانی بوون هەڵدەسەنگێنیو نرخی دەداتێ ئیتر پێوەرو بەهاو مەدحو سەنای خەڵكی چیە؟!

موسڵمان لەسەر حەقە .. لە حەقیش بترازێ گومڕایی یە.. با ئەو گومڕایی یەش دەسەلاتی هەبێ، بارازاوەو ڕواڵەتی بریسكەداریشی هەبێ، با كۆمەڵەو جەماوەریشی هەبێ .. ئەمانە هیچیان هیچ لە حەق ناگۆڕن .. مادام ئەم موسڵمانەو لەسەر حەقە، ئیتر هەرچی لەحەق بترازێ گومڕاییو سەرگەردانیە.

موسڵمانیش – كە باوەڕی بە خوا هەیە – مومكین نیە گومڕاییو سەرگەردانی هەڵبژێرێو حەق بخاتەلاوە. مومكین نیە هیچ كاتێك حەق بە گومڕایی بگۆڕێتەوە، هەرچەند گومڕایی ڕواڵەتی جۆراوجۆری هەبیو ئالاَّوالاَّبنوێنیو ئەمیش باروزروفی ناهەمواری یەك بەدووی یەكدابێن !..

# ئا ئـەمـەیـە ڕێگـــا

(والسَّـماء ذات الـبروجِ، واليَـوم المَوعـود، وشـاهِد ومَشـهود، قتِـلَ أصـحاب الأخدود، النار ذات الوقـود، إذ هُـم عَلَيهـا قعود، وهُـم عَلى مـا يَفعَلون بـالمؤمِنين شهود، وما نقموا مِنهم إلاّ أن يؤمِنوا باللهِ العَزيز الحَميد، الذي لَه ملك السّماوات والأرضِ واللهُ عَلى كُل شَيء شَهيد إنّ الـذينَ فتَنـوا المؤمِنين والمؤمِنات ثمّ لَم يَتوبـوا فَلَهـم عَـذاب جَهَـنم ولَهـم عَـذاب الحَريـق، إنّ الـذينَ آمَنـوا وعَمِلـوا الصـالِحات لَهـم جَنّات تَجري مِن تَحتِهـا الأنهار ذلكَ الفَوز الكَبير، إنّ بَطش رَبك لشَديد، إنه هوَ يبدئ ويعيد، وهوَ الغَفور الوَدود، ذو العَرش المَجيد، فَعَّال لِما يُريد) (الـبروج: ١- ١٦).

واتـە: سوێند بە ئاسمانی ڕێك‌و پێك كەپڕە لە مەنزڵی ئەستێران، سـوێند بـە ڕۆژی دوایی كە هەموو مرۆڤی تێیدا كۆدەكرێتەوە، سوێند بە هـەینی‌و ڕۆژی عـەرەفات.. نەفرینی خوا لە هەڵكەنەرانی كەندەڵانەكە، ئەوانەی كـە قـۆرتی قوڵیـان لـە زەویـدا هەڵكەند تا بیكەنە ئاگردان بۆ سوتاندنی موسڵمانەكان، ئەو ئاگرەی كڵپـەو بڵێسـەی گەورەو بەتینی هەبوو، كە ستەمكاران بەدەوریدا دانیشتبوون (بۆ بینینی ئەو دیمەنـە دڵ تەزێنە)و تەماشایان دەكرد چـی لـەو موسـڵمانانە دەكرێـت، بـەو هیوایـەی لـە ئیسلامەتییەكەیان پاشگەزیان بكەنەوە .. هەموو تاوان‌و خراپەكەشیان ئەوە بوو كـە باوەڕیان بەخوا هێنابوو. ئەو خوایەی هەموو شتێك لەجێی خۆیـدا دەكـات‌و هـەموو دەم پەرستراوە. ئەو خوایەی كە خاوەن ئاسمان‌و زەوییەو ئاگـای لـە هـەموو كـردەوەو هەڵس‌و كەوتێك هەیەو، دەبێت‌و، هیچی لـێ‌وون نابێت. چارەنووسی ئەو كەسـانەی سزاو ئازاریان بۆ موسڵمانەكان پێش دەهێنا تا لە دینەكـەیان پاشـگەزیان بكەنـەوەو دوایش پەشیمان نەبوونەوە (لەو كارە ناڕەوایەیان) چارەنووسیان سزای دۆزەخ‌و ئازاری سوتێنەرە.. ئەو كەسانەش كە باوەڕیان هێنـاوەو كـاری چـاكەیان كـرد بـە هەسـتی

بەرینیان پێدەبەخشرێت كە كانیو ڕووبار بەژێریاندا دەڕوات بەڕاستی تۆڵەو سزای خوای تۆ بەهێزو بەژانە هەرخوایە كە لە نەبوونەوە دەخوڵقێنێتو زیندو دەكاتەوە. ئەویشە داپۆشەری تاوانی بەندە موسڵمانەكانو، نەرمو نیانە بەرامبەر ئەولیاكانی. خاوەنی عەرشی بڵندو بەرینە (كە گەورەترین شتێكە دروست كرابێتو، گەورەترە لە ئاسمانانو زەوی) هەر خوایە كە زۆر زۆرە بەكارە لە بەدیهێنانی هەرچی شتێكدا كە خۆی حەز بكات بێتە دی..

چیرۆكی یاوەرانی كەند، وەكو كە لە سورەتی (البروج)دا باسكراوە.. ڕاستییەكەو، (داعی)یە موسڵمانەكان، ئەوانەی بانگەوازی خوایی بڵاودەكەنەوە — لە هەموو نەوەكانیانو لەهەر جێیەك بن — پێویستە بە ووردی سەرنجی بدەنێ. قورئان بەم شێوەیەی كە هێناوێتییەوە، دەیەوێت بەو سەرەتاو كۆتاییو، بڕیارو تەوجیهاتانەی تێیدا دیاری كردووە، نەخشەی ڕێبازی بیروهۆشێكی سروشتی بانگەوازی خوایی بكێشێ بەجۆرێك كە ڕۆڵی مرۆڤی تێدا دەربكەوێ — بەو هەموو ناڕەحەتییانەوە كە دێتە ڕێی. بەدرێژاییو مەودای ژیانی خۆیو لەو بوارە بەرفراوانەیدا كە سەر زەوی یە — هەروەها دەیەوێت ڕێگای موسڵمانان دیاری بكات، ودەرونیان ئامادەبكات بۆ ئەو هەموو ناڕەحەتییانەی دێتە ڕێیان، كە لەقەدەرەی خوادا — بەپێی حیكمەتێكی شاراوەی نادیاری خوایی— كێشراون.

چیرۆكی یاوەرانی كەند، بەسەرهاتی كۆمەڵە كەسێكە كە باوەڕیان بەخوای خۆیان هێناو، ڕاستی باوەڕی خۆیان ئاشكرا كرد، پاشان تووشی ئەشكەنجەو سزاو ئازاوەو ناڕەحەتی هاتن بەدەست دوژمنانی خاوەن دەسەڵاتی ستەمكارەوە. بەدەست ئەوانەی نرخیان بۆ مافی (مرۆڤ) دانەدەنا.. مافی سەربەستی وەرگرتنی عەقیدەی ڕاستپەروەری، باوەڕهێنان بەخوای پاكو تەنهاو تاك.. بەدەست ئەوانەی هیچ مافێكیان بۆ ئەو ڕێزە دانەدەنا كە خوا بۆ بوونی مرۆڤی دانابوو. بەڵكو دەیانەویست مافی باوەڕو ڕێزی مرۆڤ بكەنە بەزمی ئاهەنگێك كە ستەمكاران لەگەڵ سزاو ئازارداندا ڕابوێرنو بە دیمەنی ڕێزی مرۆڤایەتی پێبكەنن كە ئەشكەنجەو ئازاری سووتان پێی دەچێژی!!

باوەڕبوو ئەم دڵودەرونانەی بەسەر ئاژاوەو ناڕەحەتیدا سەرخست.. عەقیدەی سەرخست بەسەرژیاندا .. نەشیهێشت ئەو عەقیدەیە وای لێبێ لەژێر هەڕەشەی ستەمکاراندا بناڵێنێ. یا پێیان لە دینەکەیان هەڵ خلیسکێنی — کە دەیبینی وا ئەو دڵودەرونانە دەسوتێنرێن .. دەسوتێنرێن تا خاوەنەکانیان کلّوکۆیان دادەمرێو دەبنە خۆڵەمێش ..

ئەم دڵو دەرونانە لە ژیانپەرستی ڕزگاربووبون بۆیە ئیتر خۆشەویستی مانەوە لە دنیادا زەلیلی نەکردن ئەگەرچی وا تالآوی مردنیشیان بەو شێوە دڕندانەیە پێدەنۆشرێ ..

ئەم دڵو دەرونانە لە هەموو کۆتێکی زەمینی ڕزگاربوون.. لەو شتانە دەرچووبوون کە هەراڵیان دەکەن.. دروشمی ڕزگاربوونیان لەو سەرکەوتنەیاندا دەرکەوت کە عەقیدەکەیان بەرامبەر ژیان وەدەستی هێنا ..

ڕووبەڕووی ئەم دڵودەرونە پڕ باوەڕو چاکەخوازو بلّندو بەرێزانە، دەستەیەکی دڵرەقو بێباوەڕو شەڕخوازو تاوانبار هەبوو ئەم دەستە دڵ ڕەقەش وان بەدەوری ئاگرەکەدا دانیشتبون. تەماشا دەکەن تا ببینن چۆن ئەم باوەڕدارانە سزاو ئازار دەچێژن .. دانیشتبوون لەزەتیان لەو دیمەنە وەردەگرت کە چۆن وادەبینن ئاگر ژیان دەخوات.. دەستە خەڵکێکی پاكو بەڕێز وردەوردە دەبنە سوتەمەنیو سووتوو.. هەر کاتێکیش منداڵێك یان لاوێك، یان شۆخێك یان پیرێژنێك، یان بەساڵاچوویەکی پەککەوتەی ئەو موسڵمانە خێرخوازو بەڕێزانە دەخرایە نێوئاگر حیلکەحیلكو قاقای پێکەنینی بەزیوو لە دەرونی ستەمکارانەوە دەهاتە دەریو دیمەنی خوێنی ڕژاوو پارچە لەشی سووتاو، مەست تری دەکردنو زیاتر سەریان گەرم دەبوو!..

ئا ئەمەیە ئەو ڕووداوە دڕندەیی یەی ئەو دەستە دڵرەقەی پێدابەزییە خواریو لە چڵپاوو زەلکاوی ستەمکاراندا خستینە پەلەقاژێ.. چونکە لەزەتیان لە دیمەنی ئازاردانێکی تۆقێنەری توندوسەخت وەردەگرت، ئا بەو جۆرە بێنرخی یەی کە هەرگیز دڕندە نایکات .. چونکە خۆ دڕندە پەلاماری شتێك دەداو دەیکوژێ تا بیخوات، نەك بۆ ئەوەی - ناکەسبەچانە — لەزەت لە ئازاری نێچیرەکەی وەرگرێ..

ئەمەش هەر ئەو ڕووداوەیە کە گیانی پاکی موسڵمانانی تێدا بەرزبووەوەو، ڕزگاربووو بەرەو ئەو لوتکە بڵندو مەزنەچوو، کە مرۆڤایەتی بەدرێژایی چەرخ‌و گۆڕانی نەوەکان نایگاتێ..

❊ ❊ ❊

لە حساباتی زەمینیدا وا دەردەکەوێ کە ستەمکاری بەسەر باوەڕدا سەرکەوت‌و ئەو باوەڕە پتەو بەرزەی لە دڵ‌و دەرونی ئەو کۆمەڵە پاك‌و خێرەومەندو خۆڕاگرە دابوو، هیچ نرخێکی نەبوو، ئەو باوەڕە بەدرێژایی ئەو شەڕەی لەنێوان باوەڕو ستەمدا ڕوویدا، سەنگی نەبوو.

- دەقە قورئانیەکان -و ئەو حەدیس‌و باسانەی گێڕراونەتەوە دەربارەی ئەم ڕووداوە، ئەوەی تێدانیە کە خوا ئەو ستەمکارانەی — سەرەنجامی ئەو کردەوە ناپەسەندانەیان کە لەو تاوانە دڕندانەیی یەیان دەیانکرد — بەفەتارەت دابێ‌و فەوتاندبنی، وەکو کە باسی فەوتاندنی قەومی نوح‌و قەومی هودو قەومی صالح‌و قەومی شوعەیب‌و قەومی لوطی کردووە، یان وەکو چۆن باسی قڕکردنی فیرعەون‌و سەربازەکانی کردووە.

بۆیە ئەم چیرۆکە لە حساباتی زەمینیدا، کۆتایی یەکی زۆر ناخۆش‌و دڵتەزێنانەی هەیە چۆن ڕووداوەکە هەر ئاوا کۆتایی هات؟! ئەو دەستە موسڵمانەی گەیشتنە دوالوتکەی باوەڕ، هەروا بەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەوە، لەو کەندەدا بەهیچ چوون؟! لەولاوەش ئەو دەستە دەستدرێژکەرو ستەمکارانەی دەستیان بە خوێنی ئەو بێتاوانانە سوورکرد، ڕزگاریان بوو؟!

لە حساباتی زەمینیدا — بەرامبەر ئەو کۆتایی یە بەژان دڵتەزێنە — شتێك دڵ‌و دەرونت دادەخورپێنێ، بەڵام قورئانی پیرۆز موسڵمانان فێری شتێکی تر دەکات‌و، ڕاستییەکی تریان بۆ دەردەخات وایان لێدەکات هەست بە سروشتی ئەو تەرازووە

بکەن کە ئەمانی پێدەکێشرێ .. هەروەها دەبێ دەرك بە بواری ئەو شەڕە بکرێ کە لەگەڵیاندا بەرپادەکرێ.

ژیانو لەزەتو ئازارو خۆشیو ناخۆشیو ناڕەحەتی یەکانی ژیان نرخێکی گەورەیان لە تەرازوودا نیە.. تەنانەت بریتیش نین لەو شتومەکەی قازانجو زیانیان پێ بپوێرێن .. سەرکەوتنیش تەنها زاڵ بوونی ئاشکرایی نیە.. چونکە زاڵ بوونی ئاشکرایی تەنها شێوەیەکە لە شێوە زۆرەکانی سەرکەوتن ..

ئەو نرخەی لە تەرازوی خواییدا سەنگی هەیەو گەورەیە بریتیە لە نرخی عەقیدە..

ئەو شتومەکەی لە بازاڕی خوادا ڕەواجی دەبێ، بریتیە لە باوەڕ.. بەرزترین پلەی سەرکەوتنیش بریتیە لە سەرکەوتنی ڕۆح بەسەر ماددەدا، سەرکەوتنی عەقیدە بەسەر ئازاردا، سەرکەوتنی باوەڕە بەسەر ناڕەحەتیو ناخۆشیدا .. لەم ڕووداوەشدا گیانی پاکی موسڵمانەکان سەرکەوت بەسەر دڵەکوتیو ئێشو ئازاردا.. زاڵ بوو بەسەر هەموو شتێکدا کە لە ژیاندا مرۆڤ بۆ خۆشنوودیو مانەوە ڕادەکێشن .. ئەو گیانە پاکانە بەسەر ئەو ناڕەحەتییەدا سەرکەوتن . بە جۆرێکی وا کە مایەی شانازی هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی یە لە چەرخ سەردەمەکانیدا، ئا ئەوەشە سەرکەوتن ..

خەڵکی هەموو دەمرن.. هۆی مردنیشیان زۆرە .. بەڵام هەموو کەسێك ئەو سەرکەوتنە وەدەست ناهێنێو، بەو شێوەیەش بڵند نابێتەوەو، بەو جۆرەش ئازاد نابێو بەرەو ئەو ئاسۆ ڕوونە پیرۆزەش ئاوا بەرز نابێتەوە.. بەڵکو ئەم جۆرە سەرکەوتنە هەڵبژێرراوی دەستی خوایەو ڕێزگرتنێکی خوایی یە کە بە دەستەیەکی پاکی دەبەخشێ لە بەندەکانی خۆی کە هەموویان هەر دەمرن. بەڵام ئەو دەستەیە پلەیەکی ئیمتیاز وەردەگرن، ئیمتیاز لە کەناری خوادا .. جگە لەوەی هەر خۆی ئیمتیازێکی بەرزە ئەگەر ئێمە حساب بۆ ئەو نەوانەش بکەین کە لەسەر زەمیندا بەدوای ئەوانەدا دێن!!

ئەو موسڵمانانە دەیانتوانی ژیانی خۆیان ڕزگار بکەن بەرامبەر بەزیوی باوەڕەکەیان بەڵام ئەو کاتە هەر خۆیان چەندیان زیان لێ دەکەوت؟ مرۆڤایەتی

چەندی زیان لێ دەكەوت؟ ئەو زیانەی خۆیان چەندە زۆر دەبوو كە خۆیان بەدەستی خۆیان ئەو مانا گەورەیەیان دەكوشت.. مانای بێنرخی ژیانی دنیا بێعەقیدە.. ناخۆشیو تاڵیو سوێری ژیان بێ سەربەستی.. یان ئەو ژیانە نزمەی ئا ئەو ستەمكارانە دەست دەگرن بەسەر گیانی ئەواندا، پاش ئەوەی دەستیان دەگرت بەسەر لەشیاندا ؟!

ئەمە مانایەكی زۆر بەرزە، مانایەكە، ئەوانە بردیانەوە كە هێشتا لەسەر زەمینیش بردیانەوە ئەگەرچی وان لەنێو كلپەی گڕا.. ئەگەرچی وا لەشیان دادەپلۆخێ ئەو لەشەی ئەمڕۆش نەبێ سبەینێ هەر دەمرێ.. گرنگ ئەوەیە بالەشیش بسووتێ، بەڵام خۆ ئەو مانا بەرزە سەردەكەوێ كە ئاگر پاڵفتەی دەكات..

پاشان بواری شەڕەكەش تەنها سەرزەمین نیە. تەنها ژیانی ئەم دونیایە نیە. ئەوانەی كە شەرەكەشیان دی هەر ئەو خەڵكە نین كە بەشێك بوون لە نەوەیەك لە نەوەكانی مرۆڤایەتی، بەڵكو دەستەی خواییش بەشداری ڕووداوەكانی سەرزەمین دەكەنو هەمووشیان هەموو ڕووداوەكە دەبینن.. ئەم ڕووداوەش بە تەرازویەك دەكێشرێ غەیری تەرازووی زەمینی، كە نەوەكانی مرۆڤایەتی دەیهێننە كایەوە چونكە ئەو دەستەیەی لای خوان، ئەوەندەی گیانی پاكو پیرۆزی تێدایە، هەزار ئەوەندەی گیانەكانی سەرزەمین دەبن.. گومانیش لەوەدا نیە كە ستایشو ڕێزی پیرۆزی ئەو دەستەگیانانەی لای خوا زۆر زۆر پەسەندترو سەنگینترە لە ڕای هەموو خەڵكی سەرزەمین!!

لەگەڵ ئەم هەمووەشدا.. ڕۆژی دوایی ماوە .. بواری ڕاستەقینە ئەو كاتەیە كە ڕووداوەكانی دنیای سەرزەمینی تێدا دەهێنرێتەوە پێشو ناهێڵرێ لێك دابڕكرێن چ لە ڕاستی واقیعدا چ لەو هەستەدا كە موسڵمان هەستی پێدەكات .

كەوابوو هێشتا شەڕەكە كۆتایی نەهاتووە كۆتایی ڕاستەقینەش هێشتا نەهاتووە.. حوكمدانیش بەسەر بەشێكی مەسەلەكەدا —كە لەسەر زەمین ڕوویداوە— حوكمێكی ڕاست نیە، چونكە ئەوە حوكمێكە بەسەر بەشە هەرە كەمو بچوكەكەیدا..

❊ ❊ ❊

تێڕوانینی یەکەم تێڕوانینێکی کورت بینی مرۆڤی ساکارە.. تێڕوانینی دووەمیان تێڕوانینێکی دووربینە کە هەموو شتێك دەگرێتەوە.. ئا ئەمەیە قورئان موسڵمانانی لەسەر پەروەردە دەکات چونکە ئەم تێڕوانینەیە دەبێتە ئەو حەقیقەتەی بیروهۆشی ڕاستی باوەڕی لەسەر دادەمەزرێ.

ئەوجا پاداشتی خوایی هەیە بۆ هەموو موسڵمانان – بەرامبەر ئەو باوەڕو ملکەچیو گوێڕایەڵی یەیان، بەرامبەر ئەو ئارامگرتنەیان، کە دەیگرن لەسەر نارەحەتیو ئازار.. بەرامبەر ئەو سەرکەوتنە یان بەسەر نارەحەتیو ئاژاوەکاندا.. ئەو پاداشتە خوایی یەش هێمنی دڵ ودەرونیانە:

**(الذينَ آمَنوا وَتطمَئِن قلوبهم بِذِكرِ الله ألا بِذِكرِ الله تَطمَئِنُ القلوب)**(الرعد- ٢٨)

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، دڵیان بە یادکردنی خوا هێمن دەبێ. بەڕاستی هێمنی دڵیش بەیادکردنەوەی خوا دێتەدی..

ئەمەش بریتیە لە خۆشەویستیو ڕەزامەندی خوای میهرەبان:

**( إن الذينَ آمَنوا وعَمِلوا الصالِحات سَيَجعَل لَهم الرَحمن وداً)** (مريم- ٩٦)

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کاری چاکە دەکەن خوای میهرەبان خۆشەویستییان دەداتێ، ئەمەش بریتیە لە یادکردنیان لەلای دەستەی باڵای فریشتەکانی خوا:

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **((اذا ماتَ وَلد العَبد قالَ الله لِمَلائكَتهِ: قَبضتُم وَلد عَبدي؟ فَيَقولون: نَعمْ. فَيَقول: قَبَضتم ثَمرة فؤادهِ؟ فَيَقولون: نَعمْ . فَيَقول: ماذا قالَ عَبدي؟ فَيَقولون: حَمدك واستَرجع. فَيَقول: ابنوا لِعَبدي بَيتا" في الجَنة وسَّموه بَيت الحَمْد)).**

واتە: ئەگەر منداڵی یەکێك لە بەندەکانی خوا مرد. خوا بە فریشتەکانی دەفەرموێ: گیانی منداڵی بەندەکی منتان کێشا؟

دەڵێن: بەڵێ.

دەفەرموێ: گیانی بەرهەمەکەی دڵێتان کێشا؟

دەڵێن: بەڵێ.

دەفەرموێ: ئەدی چی ووت؟

دەڵێن: سوپاس‌و ستایشی تۆی کردو گەڕانەوەی بۆ لای تۆی لەسەر زمان بوو.

دەفەرموێ: کۆشکێك لە بەهەشتدا دروست بکەن بۆی‌و ناویشی لێبنێن: کۆشکی ستایش کردن. (ترمذی گێراویێتیەوە).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوای مەزن دەفەرموێ:

**(أنا عِندَ ظن عَبدي بي، وَأَنا مَعَه حينَ يَذكُرني . فاذا ذَكَرني في نَفسهِ ذَكَرتُه في نَفسِه . وانْ ذَكرني في مَلأ ذَكرته في مَلأ خَيرمِنه . فإن اقترب اليّ شِبرا" اقتَربت اِليه ذِراعا". وان اقترب اليّ ذِراعا" اقتَربت مِنه باعا"، وان أتاني مَشيا" أتَيتُه هَروَلة).**

واتە: من وام لەگەڵ گومان باشی بەندەی خۆمدا، هەر کاتێك یادی کردم لەگەڵی دەبم، ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادی کردم، منیش لە دڵی خۆمدا یادی دەکەم‌و. ئەگەر لەلای چەند کەسێك یادی کردم منیش لەلای چەند کەسێك یادی دەکەم کە لەو کەسانە باشترین کە ئەو یادی منیان لادەکات. وە ئەگەر بەندەیەکی خۆم بستێك لەمن نزیك بێتەوە، من (باڵ)ێك لێی نزیك دەبمەوە. وە ئەگەر ئەو باڵێك لەمن نزیك ببێتەوە، من (باعێك) لەو نزیك دەبمەوە. وە ئەگەر ئەو بە ڕۆیشتن بێ بەرەو لای من، من بە ڕاکردن لەو نزیك دەبمەوە (هەردوو شێخەکە گێراویانەتەوە).

ئا ئەمەیە خەریك بوونی جیهانی خوایی بەکاروباری موسڵمانانی سەرزەوی:

**(الذينَ يحَملونَ العَرش وَمِن حَولهِ يُسبِحونَ بِحَمدِ رَبهم وَيؤمِنون بهِ وَيَستَغفِرون للذينَ آمَنوا رَبنا وَسعت كُلَ شَيء رَحمة وَعِلماً فآغفِر للذينَ تابوا وآتبَعوا سَبيلكَ وَقِهم عَذابَ الجَحيم) (غافر- ٧)**

واتە: ئەوانەی (لە فریشتەکانی خوا) هەڵگری عەرشی خوان‌و ئەوانەی لە دەوری عەرشن ستایش‌و سوپاسی خوا دەکەن‌و شوکرانە بژێرن‌و تەسبیحات دەکەن‌و،

باوەڕیـان پێیـەتیو داوای لێخـۆش بـوون بـۆ موسـڵمانان دەکـەنو دەڵـێن: خوایـە، ڕەحمەتو زانستی تۆ هەموو شتێکی گرتۆتـەوە، دەخوایـە لەوکەسـانە خۆشبە کـە پەشـیمان بوونەتـەوەو تۆبـەیان لـە تـاوانو گوناهـەکانیان کـردووەو ڕێبـازی تۆیـان گرتۆتەبەرو، خوایە بیانپارێزە لە ئاژاوەو ئەشکەنجەو سزای دۆزەخ.

ئا ئەمەشە ئەو ژیانەی شەهیدان لای خوا دەیبەنەسەر.

**(وَلا تَحسَبَّن الذينَ قتِلوا في سَبيلِ الله أَمواتاً بَل أَحياءٌ عِندَ رَبهِم يُرزقون، فَرِحِين بِما آتاهُم الله مِنْ فِضلِه ويَستبشِرون بالذين لَمْ يَلحقوا بِهِم مِن خَلفهِمْ أن لاخَوف عَليهم وَلا هـم يَحزَنـون، يَستَبشِـرون بِنعمَـة مِـن الله وفَضْـل وأنَّ الله لا يَضـيع أجـرَ المؤمِنين)** (آل عمران: ١٦٩-١٧٣)

واتە: وانەزانن ئەوانەی کە لە ڕێی خوادا دەکوژرێن مـردووبن، نـا بـەڵکو ئـەوان زیندونو ڕۆزییان لەلای خـواوە پێدەدرێـت. ئەوانـە دڵخـۆشو شـادو کامـەرانن بـە بەخششو بەخشندەیی یەکانی خوا کە داوینـەتیو، مـژدەش بەوکەسـانە دەدەن کـە هێشتا نەگەیشتون بەوان کە: هیچ ترسو بیمو غەمو پەژارەتان نەبێت. مژدە دەدەن

بە نازو نیعمەتەکانی خوا. ئاشکراشە کە خوا پاداشتی موسڵمانان زایەناکات.

هـەروەها بەڵێنـە دووپـات بووەوەکـانی کـە داونـی بـەوەی درۆزنو سـتەمکارو تاوانباران لەڕۆژی دواییدا سزا بدات، ئەگەرچی لە ژیانی دنیایاندا ماوەیەك ڕێگایـان لـێناگرێتو ئەو بوارە کراوەیەی لەبەردەمیانـدا هەیـە، تـا ماوەیـەك دەیهێڵێتـەوەو تەسکی ناکاتەوە لێیان ئەگەرچی جاری واش هەیە هەر لە ژیـانی دنیایانـدا تۆڵـەیان لـێدەکاتەوە. بەڵام پاداشتو سزای تەواو لە ڕۆژی دواییدایە:

**(وَلا تَحسـبَنَّ الله غـافِلاً عمَّـا يَعمَـل الظـالمون إنمـا يـؤَخِرهم لِيَـوم تشـخَص فيـهِ الأبصار، مُهطِعين مُقنِعي رؤوسَهمْ لا يَرتدُ إلَيهم طَرفهُمْ وَأفئِدَتهم هَـواء)**(ابـراهيم: ٤٢-٤٣)

واتە: وامەزانن خوا بێئاگابێ لەو کاروکردەوانەی ستەمکاران دەیکەن. نا خوا بـۆ ڕۆژێك دەیانهێڵێتەوە کە چاو تێدا ئەبڵەق دەبێ. جا ئەوکاتە کە بەرەو دادگا دەبڕێن، وێڵو سەرگەردانو چاویان دەرپۆقیوەو ناتروکیو هۆشیان لەترسان لە هیچ نەماوە:

**(فذَرهم يَخوضوا وَيَلعَبوا حَتى يُلاقوا يَومَهم الذى يوعَدونْ، يَومَ يَخرجون مِنْ الأجداثِ سِراعا" كأنَّهم إلى نَصب يوفضونْ، خاشِعة أبصارهمْ تُرهقهمْ ذلة ذلكَ اليَوم الذى كانوا يوعَدونْ)** (المعارج: ٤٢-٤٤)

لێیانگەڕێ با سەرگەرمی یاریو گاڵتەی خۆیان بن، تا دەگەنە ئەو ڕۆژەی بەڵێنیان پێدراوە ئەو ڕۆژە هەموو لە گۆڕەوە دەردەچن، چۆن؟ بەهەڵەداوان هەروەك لە گومڕاییدا بەرەو مەشخەڵ بچن چاوشۆڕو زیللەت بارو ماندوو ئا ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنیان پیێ درابوو دەربارەی.

ئا بەم جۆرە ژیانی خەڵکیو ژیانی جیهانی بڵندی خوایی پێك دەگەیشتن. جا دونیاو ڕۆژی دوایی پێك دەگەیشتن. ئیتر وەنەبێ زەمین بووبێ بەتەنها مەیدانی جەنگی نێوان خێرخوازیو شەرخوازی، نێوان ڕاستیو ناڕاستی، نێوان باوەڕو ستەم کەوابوو تەنها ژیانی دونیا کۆتا قۆناغ نیە. هەروەها کۆتایی ناکۆکی یەکەش نیە. هەروەها ئەو ژیانە — بەو لەزەتو ئازاروبوونیو نەبوونیەیەوەی کە تێیدایە — بریتی نیە لە هەموو شتێکی بوونو بریتیش نابێ لە نرخو بەهاوسەنگی تەرازوو..

شوێن زیاتر بواری بۆکرایەوە، کات زیاتر بواری بۆکرایەوە، کێشانو هەڵسەنگاندن زیاتر بواری بۆکرایەوە، دەرونی موسڵمانەکان زیاتر فراوان بوو.. بایەخدانی ئەو دەرونانە گەورەتربوو، بۆیە زەمینو هەرچی لەسەریەتیو هەرچی تێیدایە بچوکتر بووەوە لەبەرچاویان، زیانی دونیاو هەرچی تێیدایە بێنرخ بوو لەبەرچاویان، موسڵمانانیش گەورەتربوون، گەورەتر لە هەرچی شتێك کە دیبوویان.. لەبەر ئەوەیە کە چیرۆکی یاوەرانی کەند گەیشتە دوا پلەی سەرکەوتن لە بنیاتنانو داڕشتنی ئەو بیروهۆشە ئیمانیە بەرفراوانو گەورەو بەرێزەدا.

* * *

تیشکێکی ڕوناکی تر هەیە کە لە چیرۆکی یاوەرانی کەندو سورەتی (البروج)دا دەردەکەوێ ئەویش دەربارەی سروشتی بانگەوازی خواییو، هەڵوێستی (داعی)یە بەرامبەر هەموو نارەحەتیو کۆسپێك کە چاوەڕێ دەکرێ بێتە ڕێی .

مێژووی بانگەوازی خوایی کۆتایی زۆر نمونەی جۆراوجۆری لەسەر زەمیندا دیووە.

کۆتایی نەتەوەی نوحو، نەتەوەی هودو، نەتەوەی شوعەیبو، نەتەوەی لوطی بینی. هەروەها ڕزگاربوونی ئەو دەستە موسڵمانە ژمارە کەمە.. تەنها باسی ڕزگاربوونەکەیان قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی پاش ڕزگاربوونو کاروبارو ڕۆڵو بینیان لە ژیانی سەرزەمیندا باس ناکات. ئەم نموونانە ئەوە پیشان دەدەن کە جاری وا هەیە خوا بەشێك لە سزاو تۆڵەسەندن دەخاتە ژیانی ئەم دونیا. بەڵام سزاو ئازاری تەواو خوا لەو دونیادا بە موستەحەققانی دەگەێنێت..

هەروەها مێژوی بانگەوازی خوایی، کۆتایی کافرەکانی زەمانی پێغەمبەری بینی ﷺ ئەوانەی لە ڕێبازی ڕێنمایی خواییو باوەڕهێنان دەرچووبوون، هەروەها مێژوی بانگەوازی خوایی سەرکەوتنە گرنگە تەواوەکەی موسڵمانەکانی بینی کە ئەمەش دوای سەرکەوتنی عەقیدە لە دڵودەرونیاندا هاتەدی وە بۆ یەکەمین جاربوو لە مێژوی مرۆڤایەتیدا ڕوویدات کە پڕۆگرامێکی خوایی بەشێوەیەکی وا حوکمی ژیان بکات کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی — نە لەوەوپێشو نە لەوەوپاش — بەخۆیەوە نەدیبوو.

هەروەکو بینیشمان مێژوی بانگەوازی خوایی کۆتایی یاوەرانی کەندی بینی..

نموونەی تریشی بینی کە کەمتر لەسەر شانۆی مێژوی باوەڕ دەرکەوتن چ لە کۆندا بووبێ چ لەم کاتانەدا.. هەتا ئێستاش هەر بەردەوام نموونەی تر دەبینێ کە کۆتایی یەکانیان هەروەك کۆتایی ئەو نموونانەی ترە کە بە درێژایی سەدەکانی ڕابووردوو بینیونیو تۆماری کردوون .

نەدەکرا، هەردەبوو ئەم نموونەیە بهێنرێتەوە کە موسڵمانەکانی تێدا ڕزگارنابنو، کافرەکانیش بەفەتارەت ناچن .. تا لە دڵو مێشکی موسڵمانانی داهاتوودا بچەسپێ .. تا لە دڵو دەرونی خاوەنەکانی ئەم بانگەوازە ئیسلامییەدا بچەسپێ، کە لەوانەیە چارەنووسی ئەوانیش — دوای وەرگرتنو ڕاگرتنی ئەم بانگەوازی ئیسلامە خوایی یە

— وەك ئەو چارەنووسەبێ، چونكە ئەوان خۆیانو عەقیدەكەشیان دەبنە هی خواو، دەدرێنەوە دەست خوا، جا ئیتر ئەویش چ چارەنووسێكیان بەسەردا دێنێت، كەیفی خۆیەتی!

ئەوان ئەوەندەیان لەسەرە ئەركی سەرشانی خۆیان جێبەجێ بكەنو، بەردەوام بنو بڕۆن ئەركی سەرشانیان ئەوەیە كە خوا هەڵبژێرنو عەقیدە بە باشتر بزانن وەك لەمانەوەی خۆیان پێویستە بە وورەی باوەڕ خۆیان سەر بلّندو مەزن بگرنو بەسەر نارەحەتیدا زاڵ بنو لەگەڵ خوای خۆیاندا لە هەموو ئیشوكارو ویستیاندا ڕاستكەن.. ئەوجا خوا ئەوی بەڕاستی دەزانێو لە قازانجیانە دەیهێنێتە ڕێی ئەوانو دوژمنەكانیان هەروەها هەرچییەكیشی بوێ دەیهێنێتە ڕێی بانگەوازو ئایینەكەی خۆی بەرەو كۆتایی هاتنی چارەنوسێكیان دەبات، وەك یەكێك لەو كۆتایی یانەی لە مێژووی باوەڕدا هەن، یان جۆرە كۆتایی یەكی تر كە خوا خۆی بڕیاری لەسەر دەدات ..

موسڵمانان كرێكاری خوان، ئیتر ئەو چۆنو كەی ویستی وا ئیش دەكەن، ئیش دەكەنو كرێی خۆیان وەردەگرن! ئیتر ئەوان هەقیان نیە بانگەوازەكە بەرەو كوێو بەرەو چ چارەنوسێك دەڕوات ئەمە ئیشی خاوەن ئیشەكەیە نەك ئیشی كرێكارەكان!

ئەوان بەشێك لە كرێكەیان لەسەرەتاوە وەردەگرن، كە بریتیە لە: دڵ هێمنیو هەست بەرزیو، ڕاست بیركردنەوەو، ڕزگاربوون لە ژیان پەرستیو، ترسو پەژارە لە هەموو حاڵەتێكی ژیاندا! بەشی دووەمی كرێكەشیان وەردەگرن كە بریتیە لە ستایشكردنو باسكردنیان لە جیهانی بەرزو بلّندی لای خوا، لای فریشتەكان، بەرێزەوە ناویان دەبرێت، كە هێشتا خۆیان هەروان لەسەر ئەو زەمینە بچكۆلەیە دان ..

پاشان لەڕۆژی دواییدا كرێی تەواو وەردەگرن، كە بریتیە لە لێپرسینەوەیەكی ئاسانو بەهرەو نیعمەتێكی زۆر.

لەگەڵ هەموو بەشەکانی کرێ وەرگرتنەکەدا، کرێیەکی تری زۆر گەورەتر هەیە، کە بریتیە لە: لێخۆشبوونی خوا، چونکە ئەوان دەگەنە ئەو پلەیەی کە خوا خۆی هەڵیاندەبژێرێ بۆ ئەوەی ببنە ئامێرێکی قەدەرو پەردەیەکی قودرەتی خوایی کە چیی بووێ لەسەر زەمین بەوانی دێنێتە دی.

پەروەردەی قورئانی هەر بەم جۆرە کۆتایی بەژیانی ئەو کۆمەڵە هەڵبژێرراوەی نەوەی یەکەمینی موسڵمانان هێنا.. گەیاندنی بە قۆناغێکی پێشکەوتووتر، کە وای لێکردن لەخۆو تاك پەرستی خۆیانو بایەخدان بەتەنها کاری خۆیانەوە، بچنە پلەیەکی بەرزترو بۆ خاوەن ئیشەکە ئیش بکەنو، بەڕەزامەندی خوا ڕازی بنو، تەنها هەرئەویش بە گەورەترین ئامانج بخەنە پێش چاوی خۆیان ..

شێوازی پەروەردەکردنی پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ تەوجیهە قورئانیەکاندا یەك جۆرە ڕێبازیان هەبوو.. چونکە دڵو سەرنجەکانی بەرەو بەهەشت ئاراستە دەکردو فێری ئارامگرتنی دەکردن لەسەر ئەو ڕۆڵەی بۆ هەر یەکێکیان دانراوە تا ئەم ساتەی خوا بە شێوەیەکی تر فەرمان دەدات کە خۆی دەیەوێ، چ لە دنیاو چ لە ڕۆژی دواییدا.

پێغەمبەر ﷺ کە (عەمماری کوڕی یاسر)و دایكو باوکی دەبینی — ڕەزای خوای لێ بێت — وا بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە ئازار دەدرێن.. تەنها ئەوەندەی پێ دەفەرمون: ((**صَبراً آلَ یاسر اِنّ مَوعِدَكم الجَنّة** = کەسوکاری یاسر! ئارام بگرن بەڵێنتان دەدەمێ کە جێتان بەهەشتە))..

لە (خەبابی کوڕی ئەرەتت)وە دەگێڕنەوە، کە فەرمویەتی: (جارێك پێغەمبەر ﷺ لە کەعبە بوو، شانی لەسەر (بوردە = عەبا)کەی دادابوو. چوینەلایو هاوارو شکاتمان لاکرد، وتمان: ئەرێ داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت؟.. ئەرێ بۆ دوعایەکمان بۆ ناکەیت؟

فەرمووی: ((**قدْ كانَ مِنْ قَبلِكُم يُؤخَذ الرَجل فَيحفر لَه في الأرضِ فيَجعَلْ فيها، ثمّ يُؤتى بِالمِنشار فَيوضَع عَلى رَأسِه فيَجعَل نصفَينْ. ويمشط بأمشاطِ الحَديد ما دون لَحمِه وعَظمِه. مايَبعدهُ ذلكَ عَنْ دينهِ، والله لَيتممنّ الله تَعالى هذا الأمر حَتى يَسير**

**الراكبُ مِنْ صَنعاء الى حَضرَموت، فَلا يَخافُ إلاّ الله. والذِئبُ عَلى غَنَمِه، ولكِنَكُمْ تَستَعجلون** = لە زەمانی ئەوانەی پێش ئێوەدا پیاویان دەگرتو چاڵێکیان بۆ هەڵدەکەندو دەیانخستە ناوی، پاشان مشاریان بەسەریدا دەهێنا تا دووقاشیان دەکرد. هەروەها بە شانەی ئاسنین بەسەریاندا دەهێنانو گۆشتو ئێسکیان لێك جوێ دەکردنەوە، بەڵام ئەم سزایانە لە دینەکەیان دووری نەدەخستنەوە. سوێندم بە خوای گەورە، خوا خۆی ئەم دینە تەواو دەکاتو دەیگەینێ تاوای لێدێ کەسێك بە سواریو بە تەنها لە (صەنعاوە) دەچێ بۆ (حەزرەمەوت) لە خوا نەبێ لە هیچی تر ناترسێ. گورگیش شوانی مەڕدەبێ، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن، بوخاری گێڕاوێتییەوە .

❊ ❊ ❊

خوای گەورە لە هێنانی هەموو باروزروفو حاڵەتێکدا حیکمەتێکی گەورەی هەیە. چونکە خۆی هەڵسوڕێنەری ئەم گەردونەیەو، ئاگاداری پێك هاتنی سەرەتاو کۆتاییەتی. هەر ئەویش ڕووداوو پەیوەندییەکانی نێوان بەشەکانی دەگونجێنی. هەر تەنها ئەویش شارەزای حیکمەتە شاراوەکانی نادیارە داپۆشراوەکانێتی ئەو حیکمەتانەی کە لەگەڵ حەزو ئارەزووی خۆیدا لەسەر هێڵێکی دوورو درێژی هاتو چۆدا، دەسازێن .

گەلێك جار خوای مەزن — پاش چەندین سەدەو نەوە — حیکمەتی ڕووداوێکمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە هاوچەرخەکانی ئەو ڕووداوە دەرکیان پێ نەدەکرد. لەوانەشە پرسێنیان بۆچی وابوویان وانەبوو؟.. خوایە بۆچی ئەو شتە واڕوویدا ؟.. بەڵام ئەم پرسیارە هەرخۆی نەفامیو نەزانینێکە، کە دەبێ موسڵمان خۆی لێ دوورە پەرێز بگرێ، چونکە خۆ موسڵمان هەر لە سەرەتاوە دڵنیایە کە هەموو ڕووداوێکی قەدەری خوایی حیکمەتێکی تێدایە سەرەڕای ئەوەش مەودای تێفیکرینی بیروهۆشی ئەوو دووری ماوەی کاتو شوێنو خوونەریتو هەڵسو کەوت بەسن بۆ لێکۆڵینەوە. بۆیە

موسڵمان بە ملکەچیو خۆ تەسلیمکردنەوە خۆی دەداتەوە دەست خولگەی قەدەری خوایی لەم بوونەوەرەدا.

قورئانی پیرۆز دڵودەرونی وا پەروەردە کرد تا توانای هەڵگرتنی ئەمانەتی خوایی ببێ ئەم دڵو دەرونانەش پێویست بوو ئەوەندە پتەوو بەهێزو لەخۆبوردوو پەروەردە بکرێن بەجۆرێك کە چاو نەبڕنە هیچ شتێکی سەرزەوی، چونکە خۆیان دەبێ هەرچی شتێکیان هەیە بیبەخشنو خۆڕاگربن بەرامبەر هەموو شتێك وە دەبێ تەنها چاو ببڕنە ڕۆژی دوایی. هیواو ئاواتیش تەنها لێخۆشبوونی خوا بێو بەس. دڵو دەرونێکی وابێ کە ئامادەبێ گەشتی ژیان لەسەر زەمین، هەمووی لە ناسۆرو ناڕەحەتیو سزاو ئەشکەنجەو ئازارو قوربانیداندا بباتەسەر. هەتا مردن بێئەوەی چاوەڕوانی هیچ پاداشتێکی نزیك بکات لەسەر زەمین. ئەگەرچی ئەو پاداشتە نزیکەش سەرکەوتنی بانگەوازەکەو زاڵ بوونی موسڵمانانو دەرکەوتنی ئیسلامیش بێ، یان با ئەو پاداشتەش تیاچوونو بەقڕچوونی ستەمکاران بێ وەکو ستەمکارە درۆ هەڵبەستەکانی پێشوو.

ئینجا ئەگەر ئەم دڵو دەرونانە پەیدابوون — ئەو جۆرە دڵەی دڵنیایە کە دەبێ لەم سەرزەمینە هەر ببەخشیو هیچی بەرامبەر وەرنەگرێ، بەڵکو تەنها ڕووی لە ڕۆژی دوایی بێو بەس، کە لەو ڕۆژەدا هەقو ناهەق لێك جوێ دەکرێتەوە — ئەوکاتەی ئەم جۆرە دڵو دەرونانە دێنەکایەوەو، خواش ڕاستی ویستو مەبەستیانی لە پەیمانو بەڵێن بەستنیاندا بۆ دەردەکەوێ، سەرکەوتنیان لەسەرزەمین پێدەبەخشێو، ئەمانەتی چەسپاندنی پرۆگرامی خوایی یان دەداتێ نەك بۆ خۆیان، بەڵکو تا بەدەستپاکیو بێخەوشی ئەو پرۆگرامە خوایی یەی ئەوان شایانی ئەوەبوون هەڵیگرن دایبمەزرێننو بیهێننە دی. ئەوانەی کە بەڕاستی چاویان لە تالانیو کەلوپەلی دنیایی نەبووەو ڕۆژێ لەڕۆژان چاوەڕێ نەبوون لەسەر زەمین پاداشت بدرێنەوەو بەڕاستیو پاکی بۆ خوا لێبڕابوونو تەنها پاداشتیش کە ئاواتیان بو لێخۆشبوونی خوابوو.

ئەو ئایەتە قورئانیانەی باسی سەرکەوتن دەکەن یان باسی تالآنیو دەسکەوتی ماددی دەکەن، یان ئەوانەی باسی سەرەنجامو تێکشکانی کافرەکان دەکەن بەدەست موسڵمانەکان. هەموو ئەو جۆرە ئایەتانە لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە — پاش پەیدابوونو پەروەردەکردنی ئەو جۆرە دڵو دەرونانە — دوای ئەوەی کە ئەم جۆرە دەسکەوتو ئەنجامانە بوونە شتێکی لاوەکی ناسەرەکی ئەو بەرنامەیەی موسڵمان چاوی تێبڕیووەو چاوەڕوانی سەرکەوتنی دەکات. ئەوجا سەرکەوتنی خوایی هات، چونکە ئارەزوو ویستی خوا وای بۆ مرۆڤ بەچاك زانی، کە ئەم پڕۆگرامەی واقیعییەتێکی ببێ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، کە لە شێوەیەکی کردەوەیی دیاریکراودا دەربکەوێ کە نەوەکانی تری مرۆڤایەتی ببینن.

کەوابوو ئەو (هێنانەدی) پڕۆگرامەش لە جیهانی واقیعیدا — کە بە ویستی خوابوو — لە پاداشتی ماندوێتیو نارەحەتیو سزاو ئازارو قوربانیداندا نیە. بەڵکو قەدەرێکی خوایی یە کە حیکمەتی گەورەو گرنگی تێدایە، کە ئێستا ئێمە هەوڵی ئەوە دەدەین بیگەینێ!

داعی‌یە موسڵمانەکان لە هەرجێو هەر نەوەیەك بن پێویستە وورد سەرنجی ئەم خاڵە بدەن. هەر ئەم خاڵە خۆی زامنە بۆ ئەوەی مەشخەڵی ڕێیان ڕوونو ئاشکرا پیشان بدات. دەشتوانێت هەنگاونانی ئەو کەسانە لە هەڵخلیسکان بپارێزێ کە دەیانەوێ تا کۆتایی ڕێ بچن. جا کۆتایی یەکە هەرچۆنێك بێت. کە قەدەری خوایی دەربارەی بانگەوازەکەی خۆی بەوان دێتەدی. چونکە ئەو داعییانە ئیتر لەڕێیاندا چاو نابڕنە سەرکەوتنو زاڵ بوون، یان جوێبوونەوەی هەقو ناهەق لەسەر زەمین، ئەگەرچی دەشبینن وا ڕێگاکە بە خوێنو کاسەی سەر داڕێژراوە.. بەڵام ئەگەر خوا خۆی ویستی شتێك بۆ بانگەوازو ئایینەکەی خۆی بەوان بهێنێتە دی، ئەوا دەیهێنێتە دی.. نەك لە پاداشتی ئەو قوربانیو ئەشکەنجەو ئازارانەی ئەواندا.. نەخێر.. چونکە خۆ سەرزەمین شوێنی پاداشت دانەوە نیە.. بەڵکو تەنها بۆ ئەوەی قەدەری خوایی دەربارەی بانگەوازو پڕۆگرامەکەی خوا لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە بەندەکانی خوا بهێنرێتە دی. کۆمەڵێك کە تا ئەو کاتەی خوا مەبەستێتی، بەردەوامیان

پێببەخشی. ئەم هەڵبژاردنە خوایی یەشیان بەسە بەرامبەر هەموو ژیانی دونیاو گەشتی سەرزەمین، بە هەرچی خۆشیو ناخۆشییەوە کە تێیدایە.

شێوازی قورئان ڕاستییەکی تریش لە چیرۆکی یاوەرانی کەندا دەستنیشان دەکات ئەویش ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ:

**(وَما نَقَموا مِنهُم اِلاّ أَنْ يُؤمِنوا بِالله العَزيز الحَميد)** (البروج- ٨) .

واتە: تەنها لەبەرئەوە تۆڵەیان لێ دەکردنەوە چونکە باوەڕیان بە خوای گەورەو مەزن هێنابوو.

ئەمە ڕاستییەکە کە دەبێ موسڵمانە داعییەکان لە هەرجێو هەر نەوەیەك بوون سەرنجی بدەنێ. دوژمنەکانیشیان کە شەڕیان لەگەڵ دەکەن تەنها لەبەر ئەم هۆیەیە.. چونکە باوەڕیان بە خوا نەهێناوەو تەنها لەبەر عەقیدەکەیانە کە ئاوا بەرهەڵستی ئەمان دەکەن .. لەبەر هیچ شتێکی تر نیە.

وەنەبێ شەرەکەیان شەڕێکی سیاسی بێ، یان شەڕێکی ئابووری بێ، وەیان شەڕێکی نەتەوەیی بێت.. خۆ ئەگەر ئەم جۆرە شەڕانە بوایە کۆتایی هاتنی شتێکی ئاسان بوو .. هەروەها جێبەجێکردنیشی ئاسان بوو.. بەڵام لە ناوەڕۆکدا شەڕە عەقیدەیە.. یان ئەوەیە کوفربوونی هەبێ یان باوەڕ.. یان جاهیلییەت یان ئیسلام بێتە سەرحوکم.

ئاشکرایە کە گەورەو پیاوماقوڵانی قوڕەیش زۆرجار سامانو دەسەڵاتدارێتییان دەخستە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بەیەك شت.. ئەویش ئەوەبوو واز لە شەڕی عەقیدەیی بهێنێ، یان کەمێك تێیدا ئەهوەن بێت!

خۆ ئەگەر وەڵامی بدانایەتەوە — کە زۆر دووریش بوو لەو — شەڕەکە کۆتایی دەهاتو هەرگیز ئەوەندە دەوامی نەدەکێشا!

ئەمە مەسەلەی عەقیدەو شەڕی عەقیدەیە — ئا ئەمەشە کە پێویستە موسڵمانەکان لە هەرکوێ دوژمنێکی خوایان تووش هات، دڵنیابن لێی.. دەبێ ئەوە بزانن کە دوژمن تەنها لەبەرئەوە دوژمنداریتییان لەگەڵ دەکات لەبەر ئەو

عەقیدەیەی هەیانە (اِلا أَنْ یُؤمِنوا باللە العَزیز الحَمید) ئەو خوایەی کە دەبێ بەڕاستی بۆی ملکەچو گوێڕایەڵ بن ..

جاری وا هەیە دوژمنی موسڵمانان هەوڵی ئەوە دەدەن کە — بۆ شەڕ — ئاڵایەکی تری غەیری ئاڵای شەری عەقیدەیی هەڵکەن، ئاڵای شەڕی ئابووری، یان سیاسی، یان ڕەگەز! بۆ ئەوەی ڕاستی شەڕەکە لە موسڵمانان بشارنەوەو ئاڵاکەی بڕاکێنن بەو هیوایەی مەشخەڵی عەقیدەکە لە دڵو دەرونیاندا بکوژێننەوە.

کەوابوو ئەرکی سەرشانی موسڵمانەکانە کە ئاگاداری ئەوەبن هەڵنەخەڵەتێنرێن. هەروەها دەبێ ئەوە بزانن کە شاردنەوەی ڕاستی ئەم شەڕە جۆرێکە لە خافڵاندنیان. چونکە ئەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بەرەی شەڕەکە بگۆڕێ دەیەوێ بیانخەڵەتێنێو نەهێڵێ دەستیان لە چەکی سەرکەوتنی ڕاستەقینە گیربێ. سەرکەوتن لە هەر شێوەیەك دابێ. جا ئیتر چ بەشێوەی بڵندی ڕۆحی بێ وەکو کە لە ژیانی خاوەن باوەڕەکانی ڕوداوی کەندا دەرکەوت، وە چ بە شێوەی دەسەڵاتداریێتی بێ، کە هەر لە بڵندی ڕۆحییەوە وەدەست دێ — وەکو کە لە ڕوداوی نەوەی یەکەمینی موسڵمانەکاندا ڕوویدا.

ئێمە ئێستا — لەم زەمانەماندا — وا نموونەیەکی تری ئەم ژاکانی ئاڵایە دەبینین کە لە هەوڵدانی خاچپەرستانی جیهانیدا دەردەکەوێ، کە دەیەوێ هەڵمانخەڵەتێنێو ڕاستی شەڕەکەمان لێبگۆڕێ بەوەی کە هەوڵ دەدات مێژوو بگۆڕی.

ئەوەتا وا دەخاتە بەرچاومان کە شەڕی خاچ پەرستان پەردەیەکی ڕووی ئیمپریالیزم بووە.. نەخێر .. بەڵکو ئەم ئیمپریالیزمەی لەم دوایی یەدا پەیدابوو پەردەیەکی ڕۆحی خاچپەرستیانەیە. ئەو خاچپەرستەی کە نەیتوانی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕووبەڕووی ئیسلام ڕاوەستێ! ئەو هەڵمەتە خاچپەرستەی کە لە ڕووی عەقیدەی موسڵمانەکاندا ڕاوەستاو تێکشکا.. ئەو عەقیدەیەی کە سەرکردایەتییەکەی لە چەندین جۆرو نەتەوەی تێدابوو .. وەکو صلاح الدینی کوردو تۆران شاهی مەملوکی .. موسڵمانی وا کە تەنها عەقیدەکەی سەرخستو

نەتەوەگەرێتی خۆیی واز لـێهێنابوو.. کـە تـەنها لـەژێر ئـاڵای ئـەو عەقیدەیەشـدا سەرکەوت:

**(وَما نَقَموا مِنهُمْ الاّ أنْ يُؤمِنوا باللہ العَزيز الحَميد)**(البروج– ٨)

بەڵێ فەرمایشتی خوا زۆر زۆر ڕاستەو فریودەران سەریان دای لەبەرد.

# ناوەرۆك

**بابەت** **لاپەڕە**

**زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی زادی**
**(زادی ڕێمان)**

**ماڵپەر**

zadyreman.com

**پەڕەی فەیسبووک**

fb.com/zadyreman

**هەژماری تویتەر**

twitter.com/zadyreman

**ئیمەیل**

zadyreman@gmail.com